# هیلکەی نامی

## کۆمەڵێک ئەفسانە و حیکایەتی جۆرا و جۆری فولکلۆریی نێو کوردەوارییە


**بڵاوکراوەی وەزارەتی رۆشنبیری**

**زنجیرە کتێبی کەلەپوری**

**ئینستیتوتی کەلەپوری کوردستان ژمارە ( 7 )**





**خاوەنی ئیمتیاز: سامی شۆڕش**

**سەرنووسەر: هەنگاو ئەنور شێخانی**

**hangawanwar@yahoo.com**

**07504480641**

# هێلکەی نامێ

## کۆمەڵێك ئەفسانە و حیکایەتی جۆرا و جۆری فۆلکلۆریی نێو کوردەوارییە

**بەرگی یەکەم / بەشی یەکەم**


## مەولود ئیبراهیم حەسەن

**سەرپەرشتی کۆکردنەوەی کردووەو**

**پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە**

**ناوی کتێب: هێلکەی نامێ**

**نووسینی: مەولود ئیبراهیم حەسەن**

**زمانەوانی: تاریق ساڵح قەراجی**

**نەخشەسازی بەرگ و ناوەوە: شنۆ خدر رەسول**

**تایپ: جەلیل عەبدولواحید بۆتانی**

**سەرپەرشتی چاپ: دەرباز مامند ئاغا رواندزی**

**چاپ: چاپی یەکەم 2006/هەولێر**

**تیراژ: 1000 دانە**

**لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (***) ساڵی 2006 دراوەتێ**

ئەم بەرهەمە:

* پێشکەشە بەو ژن و پیاوانەی کە ئەم حیکایەتانەیان گێڕاوەتەوە .

## ناوەرۆك

**ئاگاداریی:**

* هەموو ئەو قوتابیانەی کە وەکو کۆکەرەوە لە (بەرگی یەکەم/بەشی یەکەم) و (بەرگی یەکەم/بەشی دووەم)دا ناویان هاتووە، سەردانی ئینستیوتی کەلەپوری کوردستان بکەن لە هەولێر.
* لەبەر چەند هۆیەکی هونەری، لە کاتی چاپکردندا، ڕەنگە هەندێك ناو ( کۆکەرەوە یان گێڕەوە) ناوەکەیان کەوتبێ، تکایە خاوەنەکانیان ئاگادارمان بکەنەوە، بۆ ئەوەی لە چاپی داهاتوودا ڕاستیان بکەینەوە.

**مەولود ئیبراهیم حەسەن**

## پێشەکی

### ئەفسانە لە ڕۆشنبیریی کوردیدا

**هیچ میللەتێك هێندەی کورد، مێژوو و جوگرافیا و کلتوور و ڕۆشنبیری لە لێلیدا نەماوەتەوە. چش لەوەی کە ناحەزان بەدەستی ئەنقەست و بەرنامە لێمان دەشێوێنن، بەڵام داخە کە لەوەدایە، بە شێکی زۆر لە کورد بە تایبەت ڕۆشنبیر و خوێندەوار و نووسەر و پسپۆر و خاوەن بڕوانامەکان بە کلتووری خۆیان نامۆن و لە هەموو(ڕایەك) کە بەلای کورد دا بشکێتەوە، بە گومانن. زۆر جار بیانییەکان لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە، هەندێ ڕاستی لە بارەی کوردەوە دەڵێن. کەچی لە نێو کوردا ئەو ڕایە گوماناوی دەکرێ. ئەو بێ ئاگایی و ڕا ڕاییەی نێو کورد سەبارەت بەکلتوری خۆی خالێکی لاوازی کوردو کێشەیەکی بەردەوامی خەبات و بزاڤەکەیەتی.**

**ئەمڕۆکە لە بەشێکی کوردستان، کێشە لەسەر جوگرافیا و مێژووی کوردە، هەر ئەو مێژوو و جوگرافیایە، لای کورد هێندە بچوك و کورت کراوەتەوە، کە لەگەڵ هیچ سەرچاوەو ڕاستیەکی مێژوویی ناگونجێ. ڕەگەز پەرستەکان کێشەی (کوردبوون)و کورد نەبوونی کەرکوك یان خستووتە نێو جەرگەی کوردستان و کورد زۆر بە لاوازی بەرگری لەو(کەرکوك)ە دەکات، لەکاتێکدا جوگرافیای کوردستان دەگاتە سەر کەنداو و لەسەر دەریا دەگیرسێتەوە. بۆ مێژووش یەکێ لە مێژوو نووس و شارەزایانی مێژووی کۆنی ناوچەی ڕۆژهەلات، دەڵێ: (شەش هەزار ساڵ پێش زایین، لە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس مێژوو جگە لە میللەتی کورد باسی هیچ میللەتێکی ترمان بۆ ناکات) هەروەها ئیبن خەلدون کە باسی چیای (حەمرین) دەکات دەنووسێ: (جبل الاکراد) کەچی ئەمڕۆ کورد لە باسی مێژوو جوگرافیای خوێدا یەك دەنگ و تەواو بە ئاگانییە. لە هەموو دنیادا بگەڕێی، هیچ میللەتێك ئەوەندەی کورد هۆز و شار و ناوچەی لێدانەبڕاوەو ئەم دابڕانەش لەزاکیرەی کورد خۆی بووە بەواقیعێك و ڕەشکردنەوەی کارێکی ئاسان نییە! دوژمن کەیفی خۆیەتی! بەڵام! ڕەوایە**

كورد گومان له كورد بوونی‌لوڕ و زازا و هەورامی شەبەك بكات؟ ڕەوایە كورد، ئیلام و موسل و ورمیٚ و وان بە خاكی كوردستان نەزانیٚ؟

ئەگەر ئەمە حاڵی مێژوو جوگرافیای كوردستان بیٚ، دەبیٚ حاڵی‌ئەفسانەی كوردی چۆن بێت؟! لە كاتێكداهیرۆدۆت و گەزنەفۆن لە هەزارەی یەكەمی پێش زایین باسی(ئەفسانەی كوردی) دەكەن، كەچی ئەمڕۆ ڕۆشنبیرو خاوەن بڕوانامەو هەندێك ناوداری كورد، ئینكاری ئەوە دەكەن، كە كورد (ئەفسانە)ی هەبیٚ ؟!

لە كاتێك و لە ڕاستیدا بەواقیع میللەتی كورد یەكێكە لە دەوڵەمەندترین و كۆنترین میللەتی خاوەن ئەفسانە لە جیهاندا كە ئەگەر بە زانستی‌یەوە كۆبكرێتەوەو گرنگی پیٚ بدریٚ ولێی بكۆڵدرێتەوە، ئەو كاتە تێدەگەین كە ئێمە چ غەدرێكمان لە خۆمان كردووە، كە پشتمان لەوخەزنەیە كردووە .

ڕۆشنبیر و شاعیری گەورەی ناوداری كوردحاجی قادری كۆیی، پێش سەدو ئەوەندە ساڵە ، هەستی بەگرنگی ئەفسانەی كوردی كردووەو فەرموویەتی:

بەیتی دمدم كە قەدری نازانن

پاكی سیحری حەلالی كوردانن

وەكو شا نامە گەر بنووسرایە

لێت موعەییەن دەبوو چ وەستایە

ئەسپی ڕەش بەیتی تا بڵێی چاكە

نەظمی یەكجار سوار و چالاكە

ئەم بەیتانەی كە(نەمر حاجی قادر) ناویان دێنی و ڕەگەزە ئەفسانەییەكانیان باس دەكات و تەواو بە داهێنانی كورد . سیحر حەلالی كوردان . یان دەزانیٚ و دەیانباتە ڕیزی (شاهنامەی فیردەوسی). ئەمەش ئەگەر مەزنی و گرنگی ئەفسانەی كوردی بەدەردەخات، لەلایەكی تریش هوشیاری و وردبینی و پێشوەختی حاجی مان بۆ دەسەڵمێنیٚ، لەبەرامبەر ڕۆشنبیرانی!! ئینكار كاری ئەمڕۆی كورد .

هەر ئەم ڕەوشە وای كردووە، واتە بەكەم سەیركردنی فۆلكلۆر و بەزانستی نەزانینی ئەمە پسپۆری‌یە، گەنج و خوێندەواری كورد، لە هەموو كوردستان بە

دەگمەن، لە خوێندنی باڵا ئەم بەشە هەڵبژێرن و ئەوانەش کە پێشتر لەم بوارە چوونەتەپێش، ڕۆژ بە ڕۆژ ساردببنەوەو خۆنەگرن لەبەرامبەر پلارو توانجیدژە فۆلکلۆران!! لەکاتێکدا، ئەم بوارە لە جیهان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر گەشە دەکات و ساڵ بە ساڵ پتر بڵاودەبێتەوە.

ئەگەر زانایان قۆناغەکانی مێژوو لە (ئەفسانە) وە دەگەیننە زانست و ئەفسانە بەسەرەتا دادەنێن؟ بەهەڵە نەچووینە. بۆ میللەتی کوردیش ئەگەر بیەوێ لە سەرەتاوەو بەزانستی لێکۆڵینەوە لە ئایین و مێژوو کلتووری خۆی بکات، ئەوا بێ شك دەبێ ، لەئەفسانەوە دەست پێبکات. چونکەلەسەرەتاوە ئەفسانەبوو. ئەگەر ئەفسانە سەرەتای قۆناغە مێژووی ئایینی و فەلسەفی زانستییەکانە، ئەوا بە دڵنیاییەوە، بناغەو بنەمای زانستە هەمەجۆرو جیاجیاکانیشە، ئەگەر مێژووی کورد لەم ناوچەیە، مێژوویەکی کۆنە؟ مێژووی ئەفسانەی کوردیش لەگەڵ کۆنی ئەم مرۆڤەیە. لەگەڵ ئەم کۆنییەش دەوڵەمەندو پڕ لق و پۆپە لەهەموو ڕووێکەوە، پێشتر لەجێگەیەکیتر گوتوومانە: ئەگەر بمانەوێ مێژووی میللەتی کورد و مێژووی ئایینی کورد و مێژووی ئەدەبی کوردی، بزانین و بنووسین، ئەوا بە دڵنیاییەوە، دەبێ بە دوایمێژووی ئەفسانەی کوردیدا بگەڕێین.

کۆنی مرۆڤ و هۆزی جیاجیاو جۆراوجۆری خاکی جوگرافیای کوردستان و شەڕ و کێشەو تێکەڵی خاك و میللەتی کورد لەگەڵ دەوروبەرو جیهاندا، ئەوەندەی تر ئەفسانەی کوردی دەوڵمەند و ڕیشە قووڵ و پان وپۆڕتر کردووە. هەر بۆیە، لە نێو دەقی ئەفسانەی کوردی. جگە لە ناوی میللەتی عەرەب و فارس و ئەرمەن و تورك و ڕۆم و روس و هیند و چین و زۆری تر، ئەوا ناوی زۆر شوێنی دووری جوگرافی وەك رۆژهەلات و رۆژ ئاواو مەغریب زەمین و هیند و چین و بن دنیا و سەر دنیا دەبیندرێ، ڕیشەی دەیان ئایین و ئایینزای ناوچەیی و جیهانی بەتان و پۆی ئەفسانەی کوردیدا هەڵکشاوەو داکشاوە .

ئەم ئەفسانە ڕیشە کۆن و دەوڵەمەندە، شیاوی ئەویە کە لە سایەی حکومەت و بە دەزگای جۆراوجۆری تایبەت و بەسەرمایەی زۆر و بە کەسانی

**پسپۆر پلانی وردو دوور و درێژی بۆ رێکبخرێ، بۆ ئەوەی کۆبکرێتەوەو چاپ بکرێ .**

**ئەوەی تا ئێستا بۆ ئەفسانەی کوردی کراوە . لەگەڵ دەستخۆشی بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە تاکە حەکایەتێکیان کۆکردۆتەوە: قەترە بەدەریایە. کێ دەزانێ لەناو دەقە کۆکراوەو کۆنەکراوەکانی ئەفسانەی کوردی، چ بەڵگە و پشتەوانیەکی شاردراوەو بەهێزی ئایینی و مێژوویی و جوگرافی و زانستی خۆی پەناداوە؟ ئاخر میللەتان بۆ سەرەتای هەموو (سەرەتا) کانی خۆیان پەنا بۆ ئەفسانە دەبەن، ئەگەر ڕۆژانێ (فەلسەفە) بە دایکی زانستەکان دەزانرا، ئەوا ئەمڕۆ (ئەفسانە) بە دایکی (فەلەسەفە)ش دەناسرێ .**

**مخابن! هێشتا دەنگێکی کاریگەری نێو کورد، لە ڕۆشەنبیر و نووسەران، لە پەنای پێناسەیپڕوپوچ و خەرافەوە سەیری ئەفسانە دەکەن و دان بە بوونی ئەفسانەیەکیش دانانێن کە ناوئەفسانەی کوردی بێت .**

**ئەوانەی کە تا ئەمڕۆ شتێکیان بۆ /ئەفسانەی کوردی/ کردووە، دەبێ تکایان لێبکرێ بەردەوام بن و سارد نەبنەوەو پشتیان بگیرێ، چونکە هەر ئەو هەوڵ و ڕەنجەی ئەوانە ئەمڕۆ تروسکاییەکی گەشی خستۆتە نێو شەوە زەنگی کلتوری کوردی و بەرهەمێکیان کۆکردۆتەوە . لەگەڵ کەمیشدا . دەتوانین لەنیو ئەفسانەی جیهاندا شانازی پێوە بکەین .**

**ئەم بەرهەمەش هەر چەندە بە سادە و ساکارییەوە کراوەو هەژارییەکی پێوە دیارە، بەڵام هێشتا بە نۆرەی خۆی گۆشەیەك پڕ دەکاتەوەو کەمێکی تر لە کەرەستەی خاو و گرنگ دەخاتە بەردەست دۆستانی ئەفسانە، کە لە هەندێ دەق مۆتێڤ و فیکری وای تێدایە، من بەش بە حاڵی خۆم، لە جێگای تر نەمدیوە. ئەوەش ئەمە دەردەخات کەلە هەر کۆکردنەوەیەکی تازە، دەکرێ چاوەڕیی شتی (تازە) بین .**

**دواجار زۆربەی هەرە زۆری داهێنەرانی جیهان لەکاری داهێنانەکانیاندا پشت بە ئەفسانەی خۆیان و جیهان دەبەستن و توانیویانە بە هۆی ئەفسانەوە پایەکی گرنگ و پتەوی داهێنان بە دەست بێنن، بەڵام، لە نێو داهێنەرانی کورد، ئەم پایەیە واتە پایەی ئەفسانە، زۆر باریك و لاوازە. هەر ئەم لاوازی و**

پشت له ئەفسانەی خۆکردنیشە، کە بووەتە هۆی ئەوەی. داهێنانی داهێنەران، زۆر کەم بتوانن، سنووری شار و وڵات ببەزێنن .

ئەگەر بڵێن: شاعێرێکی کۆن و کلاسیکی کورد نییە، کەوا سودی لە ڕموز و ڕەگەزە ئەفسانەییەکان نەبینی بێ، ئەوا لە بەرامبەردا زۆر کەم نووسەرانی هاوچەرخی کورد ئەمڕۆ وەکو پێویست توانیویانە سود لە ئەفسانەی خۆماڵی ببینن و (سیحری حەلالی) خۆیانی پێ پتەو بکەن. لە نێو ڕۆشنبیری گشتی کورد، دەماری ئەفسانەی کوردی هێندە لاواز و باریکە، هەست بە زیندوویی ناکەین.

لە کۆتاییدا بە هیوای ئەو ڕۆژەی، ئەفسانەی کوردی لە نێو رۆشنبیرانی کورد، بەقەد دەوڵەمەندی و کۆنی خۆی گرنگی پێبدرێ .

مەولود ئیبراهیم حەسەن

2005/9/1 ـ هەولێر

# چۆنیەتی کۆکردنەوەی ئەم حیکایەتانە

سالی2001و2002ی خوێندن و سالی2002و2003ی خوێندنی زانکۆیی لە بەشی زمانی کوردی کۆلیژی ئاداب، لەگەلٚ کچ و کوڕانی قۆناغی دووەم و سێیەمدا پێکەوە دەمانخوێند. هەرلە سەرەتای سالەوە وام بە چاك زانی کە خوێندنەکەمان تەنیا بە شێوەی تیوری نەبیٚ و بەشێکی کارکردنی تێبکەویٚ، ئەو کارەی کە دەشیا بیکەین و لەگەلٚ خوێندنی ئێمە دەگونجا هەر ئەوە بوو، کە لە مەیدانی فۆلکلۆری کوردیدا بیانخەمەکار، ئەوە بوو داوای کۆکردنەوەی بەرهەمی فۆلکلۆریم لیٚکردن: بەتایبەت حکایەتی ئەفسانەیی.سەرەتا زۆربەیان لە شانیان گران بوو و نەدەهاتنە ژێربار، لەوەشدا گلەییان لیٚناکریٚ، چونکە ئەم کاری بەرهەم کۆکردنەوەیە بۆ ئەوان شتێکی تازەو پێشتر نەکراو بوو، جگە لەوەش هیچ زانیاری و تاقیکردنەوەیەکیان لەم بارەیەوە نەبوو. بەلاٚم بەپیٚ داگرتن و ڕیٚگە بۆ خۆشکردن و پشوو درێژی و بەردەوامی داواکردن و ڕوونکردنەوە ڕیٚگاکەو لەلایەکی تریشەوە، ئەم کۆکردنەویە، ئەرکێکی خوێندنی سالٚ بوو، بەرامبەر بەنمرەیەکی دیاریکراو، لە ئەنجامدا تەواوی کچ و کوڕەکان کەوتنە کار، بە تایبەت لە دواییدا سنووری جۆری بەرهەمەکە فراوان کراو، ئازادکران لەوەی، چ جۆرە بەرهەمێك کۆدەکەنەوە. بۆیە بەرهەمی ڕەنجی ئەو کچ و کوڕانە، کۆ بووەوەو بە شێوەیەکی گشتی، دوو جۆر بەرهەمی لیٚ کەوتەوە.

یەکەم:. ئەم بەرهەمەیە کە پێکهاتووە لە حکایەتی جۆراوجۆری نێو کوردەواری، ((ئەفسانە، حەکایەتی گیانداران، حەکایەتی تایبەت بە مندالاٚن، حەکایەتی کوڕە کەچەلٚ و کۆسەو ...هتد)) .

دووەم:. بەسەهات و ڕووداوی جۆڕاوجۆری نێو خەلٚك و هەندیٚ باس و خواسی هەمەجۆر . ئێستا ئەوە بەشی یەکەمەو بە چاپکراوی لەژێر دەستی خوێندەواران و عاشقانی فۆلٚکلۆری کوردی، بە تایبەت دۆستانی حیکایەت و ئەفسانەی کوردی دایە .

ئەو کچ و کوڕانەی لەم بەرگەدا ناویان وەکو:کۆکەرەوە هاتووە، ئێستا زۆربەی هەرەزۆریان مامۆستان و بە نێو کوردستاندا پەرت بووین. ئەمڕۆکە ناو و

بەرهەمی خۆیان لێرەدا دەبیننەوە ! دڵنیام جۆرێك لە شادی دایان دەگری! دەی ئەم شادییەیان پیرۆزبێت . جا بۆ ئەوەی ئەم شادییەیان زۆرتر و بەردەوام تربێ، تکایان لێدەکەم، لەهەرکوێ یەکن لە کوردستان! دڵنیام، ئێستا زۆر لەبارترن، بۆ کۆکردنەوەی بەرهەمی فۆلکلۆری کوردەواری و ئێستا چاکتر دەزانن و باشتر دەتوانن، تێکەڵ خەڵك ببن و گرێی دڵ و بەندی زاریان بکەنەوەو گەوهەری کۆنینە کۆبکەنەوە . خوێندەواران نابێ! ئەم تکایەی من هەر بە تەنیا بۆ ئەو چەند مامۆستا بەرێزە تێبگەن! بەڵکە. تکای من لەهەموو خوێندەوارێك بەتایبەت تەواوی مامۆستایانی نێو گوندە جۆراو جۆرو هەرێمە جیاجیاکانی کوردستانە. کە ئەوانیش خۆ بکەن بە دۆستی پیرەمێرد و پیرەژنی گوندەکان و بەزاری خۆش و بەرووی گەشاوە بیاندوێنن و گوێیان لێ بگرن، ئەوسا دەزانن کە ئەو گوندییە سادە و ساکارانە چ خەزنەیەکی دەوڵەمەند و لەبڕان نەهاتووی زیندوون! ئەو پیرەژن و پیرەمێدە نەخوێنەدەوارانە، لە جۆری خۆیان چ مامۆستایەکی لێوەشاوەن!

بەرێزان . ئەگەر ئەم کتێبەی بەر دەستتان، نرخێکی بچووکی هەبێ لای ئێوە، ئەوە دڵنیابن، زۆر کتێبی لەوە بە نرختر و قەبەو ئەستوورتر لە دەوروبەری ئێوە دایەو، چاوەڕێی هیمەت و کاری ئێوەیە . دەی بابزانین! چەند کەس لە مامۆستایان دڵی خۆیان و ئێمەش خۆش دەکەن!

لە سەرەتای کار یەکێ لەکچە قوتابییەکان زۆر بە بێزارییەوە گوتی: من نازانم! چ بکەم؟

گوتم: قەڵەم و کاغەز دەست دەیێ و گوێ بگرە و بنووسە .

گوتی: گوێی لەکێ بگرم؟

گوتم:لە دایکت .

گوتی: چ بنووسم؟

گوتم: دایکت چی دەڵێ، ئەوە بنووسە .

پاش ماوەیەك هاتەوەو دوو حکایەتی زۆر خۆشی هێنابوو .

گوتی: مامۆستا .. دایکم زۆری تریش دەزانێ!

ئێستاش زۆر دایکی تر ماون و زۆر حەکایەتی تر دەزانن و هێشتا کۆنەکراوەتەوە .

# زار و زمانی حەکایەتەکان

چونکە کچ و کوڕەکان، کچ و کوڕی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان بوون بەتایبەت باشووری کوردستان، بۆیە، بەرهەمەکانیش بەرهەمی ئەو ناوچە جیاجیایانەن. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی زاروبن زاری جیاجیای زمانی کوردی لەم بەرهەمەدا کۆببیتەوە، کە ئەمە بۆخۆی بەشێکی گرنگی کاری کۆکردنەوەیە، بۆ میللەتی کورد زۆر گرنگەو زۆریش پێویستە، بەرهەمی فۆلکلۆری بەزاروبن زارە جیاجیاکان کۆبکرێتەوەو ئەو بەرهەم و زارو بن زارانە، بە چاپکراوی و پێکەوە بکەونە دەست خوێندەوار و پسپۆرانی زمان و ئەدەبی کوردی، چونکە دەبێ هەموولایەك ئەمەبزانن، بەرهەمی فۆلکلۆری زاروبنزاری جیاجیای زمانی کوردی، خەزنەیەکی دەوڵەمەندی زمانی یەکگرتووی کوردییە، مخابن لەم بوارەشدا کارێکی زۆر ماوەبکرێ.

دووبارە:

لەنێو حەکایەت و ئەفسانەکانی ئەم دوو بەرگە، ناوی هەندێك لە ئەفسانەکان دووبارە دەبنەوە. هەرچەندە ناوی حەکایەتەکان وەك یەکن، بەڵام، دەقی حەکایەتەکان لەیەکتر جیانن ئەمەش لە جیهانی فۆلکلۆر بە گشتی و لە نێو حەکایەتدا کارێکی ئاساییە، هەر بۆیە دەکرێ یەك حەکایەت چەندان دەقی لێك جیایی هەبێ، لێرەش لەم دوو بەرگەی ((هێلکەی نامی)) چەندین حەکایەت، بەناو و ناوەڕۆکەوە دووبارە بوینەتەوە .

# هونەری کۆکردنەوە .

کۆکردنەوەی بەرهەمی فۆلکلۆری هونەر و زانستی خۆی هەیەو کەسانی پسپۆریشی دەوێ. بەڵام ئەم کۆکەرەوانە جگە لەوەی کە ئێمە بەشێوەیەکی کورت و سادە چەند ڕێنماییەکمان کردن. هیچ زانیاری و تاقیکردنەوەیەکان نەبوو، سەرەرای ئەوەی کە وەك ئەرکێکی گران و چاوەڕوان نەکراویش سەیریان دەکرد و جۆرێك ناچاری پێوە بوو، هەر بۆیە بەرهەمە

کۆکراوەکانیان، بەرهەمی کۆکردنەوەی کەسانی پسپۆرنییە و هەمووشیان بەیەك شێوە لە کارەکانیان سەرکەوتوونین. ئەگەر هەندێکیان لە توانای خۆیان چاکتر کارایان کردووە، ئەوا هەندێکیشیان، کارەکانیان لەوە نزمترە لە گەنجێکی زانکۆیی بوەشێتەوە، هەرلەبەر ئەم هۆیانە دەشێ خوێندەوار لەکاتی خوێندنەوەی هەموو دەقە فۆڵکلۆریەکانی نێو ئەم بەرهەمە، بەیەك جۆر هەست بە لەززەتی خوێندنەوە نەکات. ئەمەش ئەنجامێکی ئاسایی کارێکی هەرەوەزییە، بە تایبەت ئەگەر هەرەوەزەکان پسپۆرنەبن و یەکەمجاریان بێ کارێکی ئاوا بکەن. ڕەنگە هەندێ کەس بپرسن: ئەی کەوایە بۆ هەموو بەرهەمەکانت بڵاوکردەوە؟! ئەوەی ڕاستی بێ، پاش لێکدانەوەیەکی ورد بە پەسندم زانی کە هەموو بەرهەمە کۆکراوەکان بڵاوبکەمەوە یەکەم: لەبەر ئەوەی جاری یەکەم نییە لە نێو کوردەواری ئەم جۆرە بەرهەمە بەم شێوەیە بڵاودەکرێتەوە، ئەم خاڵە لە زۆر بەرهەمی تر هەستی پێدەکرێت، دووەم: لەم ڕۆژگارە ناکرێ ڕاوەستین و چاوەڕێی پسپۆران بکەین. تا دەکەونە کار. سێیەم: زۆربەی بەرهەمە کۆکراوەکانی نێو ئەو کتێبە لە ئاستی سەرکەوتن دان و باش هاتوونەتە دەست.

ڕەنگە هی واش هەبێ بپرسێ: ئەی بۆچی دەستکاریت نەکردوون؟! بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش دەڵێم: دەستکاری کردنی بەرهەمی زۆر کەسی زۆر ناوچە و هەرێمی جیاجیای زارو بن زاری جیاجیام بە کارێکی پەسند نەزانی و پێم وابوو تێیدا سەرکەوتوونابم. هەر ئەم خاڵی لاوازی کۆکردنەوە، بووەتە هۆی ئەوەی لەڕووی جۆری ڕێنووسنەوە، شێوە ڕێنووسی جیاجیا بەرچاوبکەوێت، نەك لە نێو کۆی گشتی بەرهەمەکان، بەڵکە لەیەك بەرهەمی یەك کەسیشدا، دیسان ئەمەش دیاریدەیەکی بەرچاوی بەرهەمی کۆکراوەی فۆلکلۆری لەوەوپێشی نێو کتێبخانەی کوردەوارییە. بلاَم، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بەرهەمەکە لەسەریەك کارێکی پەسند و بەر دڵە .

# یەك بەدە !

**کۆکردنەوەی: مەولود ئیبراهیم حەسەن**

**گێڕانەوە: حاجی مســتەفـا نـەجـار**

هەبوو نەبوو، کەس لە خودای گەورەتر نەبوو، کەس لە پێغەمبەری خۆشەویست تر نەبوو، کەس لە درۆزنی ڕوو ڕەشتر نەبوو.

دەگێڕنەوە: کابرایەك هەبوو هیچ کەسی نەبوو، بێ ژن وماڵ و منداڵ بوو. چەند ساڵ بوو دە لیرەی بۆ خۆی هەڵگرتبوو، ئەگەر ڕۆژەك کەوتە تەنگانەی بۆ خۆی خێری لێ ببێنێ، ڕۆژە لە نوێژی هەینی مەلا خوتبەی دەدا. مەلا گەرم داهاتبوو دەیگوت: موسلمانینە، خێرێ بکەن خێر بە خۆڕایی ناچی! گەر هەر خێرەکی بکەن ئەوا یەك بە دەیە! ئەگەر یەك لیرەی بکەنە خێر، ئەوا خودای گەورە دە لیرەتان ئەجر دەداتەوە. ئەگەر دە لیرەی بکەنە خێر خودای گەورە ئەجری سەت لیرەتان دەداتەوە. ئەگەر سەت لیرە بکەنە خێر ئەوا ئەجری هەزار لیرەتان پێدەداتەوە. خێر بکەن خێر یەك بە دەیە. کابرای خاوەن لیرە کە لە مزگەوتێ گەڕایەوە، قرقرا، گوتی: مادام یەك بەدەیە! ئەمن کە دە لیرەم هەیە! بۆچی هەر ئاوا بیانشارمەوە، وا چاکە خێرەکیان لێ ببێنم. هەڵسا ئەو دە لیرەی کە بە هەژاری پەیدای کردبوو، پاش ئەوەی چەندین ساڵ هەڵیگرتبوو، لێکشاوە بەسەر هەژارانی دابەشکرد. دڵخۆش بوو کە لەباتی ئەم دە لێرەیە، خودا سەت لیرەی دەداتێ و ئەو سەت لیرەش دەکاتە خێر، خودا هەزار لیرەی دەداتێ و بەم شێوەیە دەبێتە خاوەن لیرەو دەوڵەمەند دەبێ.

ڕۆژ ڕۆی، هەفتە ڕۆی، مانگ تەوا بوو! مانگەك، دوو مانگ، سێ مانگ، گەیشتە چواری هیچ دیار نەبوو. کابرا هیچی نەبوو بیخوا ! ناچار لەبرسان تفەنگەکی خراپی هەبوو، هەگبەی بەپشتی خۆی داداو، تفەنگی کردەشانی و ڕۆیشت، هەر ڕۆیشت، برسییەتی و ماندووێتی هیلاکی کردبوو، چیدی نەیدەتوانی بڕوا، هەر چۆنێك بوو گەیشتە سەرکانییەکی، هەندەك ئاوی بەسەر و چاوی خۆی داکرد، هیچ نەبوو بیخوات، لەبرسان و لەهیلاکیان خەو دەیبردەوەو، بیری کردەوە ئەگەر لەسەر ئەم کانی و ڕێگایە خەوی لێ بکەوێ ،

دوور نییە ڕێبوارێك تفەنگەکەشی بباو ئەوەندەشی لە دەست بچیٚ! چاوی گێڕا دارێکی گەورەو بەرزی بینی. لە دڵی خۆیدا گوتی: وا چاکە سەر ئەو دارە بکەوم لەویٚ خۆم بشارمەوەو سەر خەوەکی بکەم. سەر دارەکە کەوت. دارکە زۆر گەورەو بە پەڵك و پۆ بوو، لەسەر داریٚ جێگایەکی خۆش کردو خۆی خێواندە نێوان دوو لکان بۆ ئەوەی ئەگەر خەویشی لیٚ کەوت بەرنەبێتەوە بتوانیٚ بە ئاسودەیی و بیٚترس بنویٚ، خەریك بوو جێی خۆش دەکرد، چرپە چرپەك و کوتە کوتەکی هاتە بەرگوییٚ، چاوی گێڕا دیتی کابرایەکی کوێر بە گورجی ڕێگای دەبڕی و بە بۆڵە بۆل دێتە پێش. کوێرەکە کە بە کوتەکوت، چووە سەرکانییەکەی، پێڵاوەکانی لەپیٚ کردەوەو بەڵەکی خۆی هەڵکردوو چووە ناو ئاوەکە، بەشەپە شەپ کەوتە ئاو بە خۆداکردن، پاش ئەوەی کابرا کوێرەکە خۆی فێنك کردەوە، لە ئاوەکە هاتە دەرەوەو لەسەر بەردەکی تەخت دانیشت. دەستی لە باخەڵی راکردوو دوو کیسەی دەرهێنا، یەکی لەم لایەی خۆی داناو یەکی لەم لایە. لەبەر خۆشیەوە هەر بۆڵە بۆڵی بوو. دەستی گێڕا خڕکە بەردێکی بەردەست کەوت، بەردەکەی لەلای خۆی دانا. یەکی لە کیسەکانی کردەوە، هەندەك شەمێی لەناو دەرهێناو کەوتە شێلانی، شەمیٚ شێلانی خۆش بوو، هەر هەری دەشێلا دوایی لەشەمییەکەی شتەکی عەنتیکە و عاجباتی دروستکرد و لەپێشەخۆی داناو گوتی: شەیتان! هەی بەلەعنەتی خوداو پێغەمبەر و هەموو چاك و پیران بی، ڕوو ڕەشی دنیاو قیامەت بی، چ ئیش نەمابوو چووی ئەم ئیشەت کرد! چوویە بن زمانی ماری و چوویە ناو بەهەشتیٚ و خۆت گەیاندە دایە حەوای و وات لێکرد لە دار گەنمی بخوات، کە لەو بەهەشتە یان و بەرینەی خوای، تەنیا ئەمەی لیٚ حەرام کرابوو، ئەمیشت دەرخوار دا. بوویتە هۆی ئەوەی نەوەی ئادەمی بکەونە ئەم ژیانەو لە بەهەشت دەربکرێن، ئەوەتا منیش کە نەوەیەکی ئادەمم، ئاوا بە کوێری و زەلیلی لەو دنیایەی دەسوڕێمەوە! بیٚکەس، بیٚچاو، نە چ دەبینم و نە هیچم بۆ دەکریٚ! ئاخر ئەگەر ئەتو وات نەکردبا! ئێستا من بۆ لە بەهەشتیٚ دەردەکرام، بۆ کوێر و زەلیل دەبووم؟ هەی بە لەعەنەت بی، وەڵڵاهی دەبیٚ تۆڵەی ئەم هەموو خەڵکەت لیٚ بکەمەوە .

دەڵێن: کابرای کوێر بەردەکەی بڵند کردو بەشەیتانی داداو پانی کردەوە: دەبخۆ دەی، ئاوهات لێدەکەم.

کابرای کوێر پشوێکی خواردەوەو جارێکی تر شەمێیەکەی خڕکردەوەو شتەکی تری لێ دروستکرد و ئەویشی لەپێشخۆی داناو گوتی: دایە حەوا، هەی خودا بتگرێ، لەم بەهەشتە پان و بەرینە لەم هەموو خۆشییە، بۆچی بەگویی شەیتانت کرد و چووی لەوداری گەنمەت خوارد و دەرخواردی باوە ئادەمیشت داو بوویتە هۆی دەرکردنی خۆت و باوە ئادەم و بێ بەری کردنی هەموو منداڵەکانت لە بەهەشت و تووشبوونیان بە بەلاّی ژیانی ئەم دونیایە پڕ مەشەقەتییە، ئەوەتا من بەکوێری و بە زەلیلی، لەم دنیایەی دەسوڕێمەو ئاخر ئەوەهەمووی خەتای تۆ بوو! وەڵڵاهی دەبێ تۆڵەی ئەم هەموو خەڵکەت لێ بکەمەوە! بەردەکەی بڵند کردوو بە هەموو هێزی خۆی بەدایکە حەوای داداو ئەویشی پانکردەوە. کابرای کوێر، دیسان پشوێکی تری خواردەوەو شەمێیەکەی هەڵگرتەوەو ئەم جارەش شتەکی عاجباتی تری لێ دروستکرد و لەپێشەخۆی داناو گوتی:باوکە ئادەم! ئەوا شەیتان شەیتانە و دایکە حەوا نەزان بوو خواردی، ئەتۆ بۆچی بە گوێت کردوو لەداری گەنمەت خوارد، بوویتەهۆی دەرکردنی خۆت و دایکە حەوا لە بەهەشت و بێ بەری کردنی نەوەکانت؟ ئاخر هیچی تر نەبوو بیخۆی؟ لەو بەهەشتە پان و بەرینە پڕ خواردنە خۆشە؟ هەی خوا بتگرێ! ئەوت بۆ کرد، ئاخر ئەوە لە نێوچەوانی تۆیە، من لەو دنیایە پڕ مشەقەتییە بێ چاو و زەلیل دەسوڕێمەوە. ئەگەر تۆ گەنمت نەخواردبایە ئێستا من بۆچی وام بەسەردەهات ،وەڵڵاهی دەبێ تۆڵەی هەمووانت لێ بکەمەوە، لای خۆت پێغەمبەربووی؟ ئەمەی گوت و بەردەکەی بەرزکردەوەو هەتا هێزی هەبوو بەسەر باوکە ئادەمی داداو ئەویشی پان کردەوە.

کابرا هەر وا لەسەر دارێ، بەمەرەقەوە، چاوی بڕیوەتە کوێرەو دەیەوێ بزانی چی دەکاو چی دەڵێ و دەگاتە کوێ؟ کوێرە پاش ئەوەی پشوێکی تریشی خواردەوە، دیسان شەمێیەکەی هەڵگرتەوەو شێلاّی و کردیە شتەکی عەنتیکە و لەپێشخۆی داناو کەوتە قسەکردن، گوتی: خوادایە! ئاخر ئەوە

شەیتان شەیتان بوو، قەیدی ناکا. حەوا ژن بوو تەماعی چوویێ و نەزان بوو خواردی، قەید نا! ئادەم لە بەرامبەر ژنەکەی خۆی پێنەگیراو توشی ئەم گوناهە بوو، گەنمەکەی خوارد. باشە خۆ ئەتو (خودا)ی هیچ شتەك بەبێ ئەمری تۆ ناکریێ! ئەتو خۆ ئاگاداربووی، بۆچی لێ گەڕای شەیتان بچێتە بن زاری مار و لە ڕەزەوانی ڕەتبی و بچێتە کن حەوای و حەوا گەنمی بخواو دەرخواردی ئادەمیشی بدات و ئادەمیش توشی ئەو گوناهەی ببی؟ ئەگەر وا نەبوایە قەت ئادەمیزاد لە بەهەشتێ دەردەکراو توشی ئەم ژیانەی سەر عەردی دەبوون، ئەمن وام بەسەر دەهات ئەوها بەبێ چاوی و بە زەلیلی لەو دونیایەی بسوڕێمەوە؟ خۆ ئەمانە هەمووی بە ئاگاداری توو بە ئەمری تو کراینە، ئەگەر تۆ خۆت ڕەزات لەسەر نەبوایە، قەت ئەم هەموو تاوانە ڕووی دەدا؟ وەڵڵاهی گوناهی گەورە ئەتو کردووتەو خەتای گەورەش هەر لەبن سەری تۆیە، وەڵڵاهی تۆڵەی ئەم هەموو خەڵکە لەتۆش دەکەمەوەو ئەتۆش دەکوژم.

دەستی دایە بەردەکە و بڵندی کرد، کابرا لەسەر داریێ گوتی: وەڵڵاهی ئەو کوێرە بەدعەمەلە، خوداش بکوژی ئەوا پارەکەم هەمووی دەچی، نەك قازانجەکە، دە لیرەکەی سەرمایەشم دەڕوا و هیچم نایەتەوە دەست نا وەڵڵاهی وا چاکە لێ نەگەڕێم، ئەو کوێرەی بەد عەمەلە خوای بکوژێ هەتا پارەکەم نەچووە، دەستی گەیاندە تفەنگکەی و سێرەی لێگرت و تەقەی لێوەهێناو کابرای کوێری پەلەواژ کردەوە، کوێرەلەویێ ساردبووەوە .

کابرا لەسەر داریێ، هاتە خواریێ و چووە دەستی گەیاندە کیسەی کوێرەی، دیتی پڕی لیرەیە، کە کردیەوە ژماردی سەیری کرد نۆهەت و نۆ لیرەیە. گوتی: ئای خوادایە حسابت چەند وردە کیسەکەشت بە لیرەیەك حسێب کردوو، بە خوای ئەو پارەیەشت نەدەدامەوە ئەگەر لەترسی رووحی خۆت نەبوایە، لیرەکانی هاویشتە باخەڵی و لێدا ڕۆیشت .

منیش کراشم دڕاو چیم پیێ نەبڕا .

*** ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: بوونی باوەڕی تەوتەمیەو بە ئینسان و خوداکردنی شەمێیە .**

# نیقاپۆش* !

**نووسینەوەی: مەولود ئیبراهیم حەسەن**

**گێرانەوە: بەهییە محەمەد رەشید**

**دەگێڕنەوە:**

**ڕۆژەك لە ڕۆژان خۆشەویست (محەمەد لمستەفا) پێغەمبەری خوای ـ ڕوحم بە قوربانی بێ ـ ددانی موبارەکی دێشا. دەڵێ: هەرچی دەکردو هەرچیان بۆ دەکرد ژانی ددانی نە دەشکا!! چیبکەین چنەکەین؟! خۆشەویست فەرمووی: یەکێکم بۆ بێنن، حەکایەتێکم بۆ بگێڕتەوە، نە کەس بیستبی! نەکەس دیتبی! گەڕان کێ بێنن، کێ نەینن؟! گوتیان: خۆشەویستی خودای، کەس لە (ئیمامی هەمزە)ەی لێوەشاوەتر نیە! ئەو لەهەمووان بە تەمنترە! ئەگەر ئەو حکایەتێکی ئەوها نەزانی! ئەوا کەس نایزانێ .**

**چوون ئیمامی هەمزەیان هێنا، ئیمامی هەمزە چ ئیمامی هەمزە! هێندە پیرە لەناو قەفەس و لۆکەیان ناوە، پیستی چاوی بەری چاوی گرتووە، بەقولاَبی بۆیان هەڵداوەتەوە، کەس ناناسێتەوە ئەگەر نەڵێی ئەوە فلاَنە، گوێی لەهیچ نابێ، ئەگەر بۆی هاوار نەکەی. هەرچۆنێکی بێ چوون هێنایان و**

---

* ئەم ئەفسانەیە، بە منداڵی زۆر جار لە دایکمم بیستووە، لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، پشت بەگێڕانەوەیەکی سەر لەنوێی نووسیمەوە.

دەقێکی تری ئەم ئەفسانەیە، کە زۆر جیایە لەمەی کە ئێستا بلاَوی دەکەینەوە، نووسەر(محەمەد فەریق حەسەن)لە کتێبی(مەملەکەتی ماسی)دا بلاَوی کردۆتەوە لەژێر ناوی(میوانی بێ ئەدەب) .

لێکۆڵینەوەیەك لە(ژمارە:2)ی گۆڤاری‌ئەکادیمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردستاندا بلاَوکراوەتەوە. لەژێر ناوی کەسایەتی پێغەمبەر(محەمەد کوڕی عبدوڵلاَ ـ د.خ) لەنێو ئەفسانەیەکی کوردیدا کە بەراوردێکە لەنێوان ژیانی ڕاستەقینەی مێژوویی کەسەکان و ئەوەی کە لە ئەفسانەکەدا هاتووە .

لەتەنیشت پێغەمبەریان دانا، هەرچۆنێکی بوو تێیان گەیاند کە بۆچیان هێناوە .

ئەویش سەری هێناوبرد پاشان گوتی: ئەگەر حەکایەتت بۆ بگێڕمەوە، ئەوا هەرحەکایەتێك بێ، ئەو حکایەتە خەڵکی تریش بیستوویان، ئەگەر بەسەرهاتی خەڵکی بێ، ئەوا ئەویش خەڵکی تر کەم و زۆر بیستوویەتیانە! بەڵام، واچاکە بەسەرهاتێکی خۆمت بۆ بگێڕمەوە، کە تا ئێستا بۆ کەسم نەگێڕاوەتەوەو وەختی خۆی کەسیش نەیبینیوە. خۆشەویست فەرمووی: لەوە باشتر نابێ. ئیمام گوتی: پێغەمبەری خوای گەنجم تۆغیانمەو پاڵەوانێکم لام وایە لەسەر ئەم زەوییە خودا کەسێکی تری وەکو من دروست نەکردووە، ئێوارەیەکیان پاش عەسرێکی درەنگ لە سەحرایێ بەتەنیا لە ڕاوێ دەگەڕامەوە، لەوسەحرایەی کاتێکی ئاوڕم دایەوە، ئەوا سوارێکی ڕەش کە بەخۆی نقاپۆشی ڕەشە، ئەسپی ڕەشە، تاژی ڕەشە! ئێرەو ئەوێندەر ئەوا لەپێشە من دەڕوا! سوار چییە؟ گردێکە و سواری گردێك بووە. ڕەکێبم لە ئەسپی دا، دەیگەمێ و نایگەمێ، لەدڵی خۆمدا گوتم: ئەوە دەبێ چ سوارێك بێ ئاوا لەخۆی ڕاببینێ وا بەبێ باکی لەپێشە من بڕوات. توندتر ڕکێبم لێداو چاکتر لێی نزیك کەوتمەوەو چوومە سەر ڕکێبێ و گورزم لێبادا، گورز چ گورز نۆباتمان گرانە، کە لەدوو خۆمی ڕادەکێشم خەندەکەکی لە دوای خۆی بەجێ دێڵێ. ئەو گورزی وها گرانم بە هەموو هێزی خۆم باداو سێ جاران هێناو بردم و هەتا خودا هێزو تاقەتی داومەتێ ئەو گورزەم لە تەپڵی سەری ئەو سوارەیدا، بووە تەپ و تۆز، لە دڵی خۆمدا گوتم: ئێستا بەئەسپەوە لەعەردی غارام بردووتە خوارێ. تۆز ڕەوییەوە سوار بە دەرکەوتەوە، بێ ئەوەی خۆی شێلو بکات گوتی: ئیمام سەبر کە بابگەینەوە ماڵی و ئیسرەحاتەکی بکەین، ئەوسا ئەو وەختی شەڕە گورز خۆشە!! خۆشەویستی خودای خۆم لەبەر چاوی کەوت. ئەو جارە توڕەتر لە جاری پێشوو چوومەوە سەر ڕکێبێ و توندتر گورزم باداو توندترم ڕاوەشاندو هەرچەندی خودا تاقەتی داومەتێ گورزم ڕاوەشاندو، دیسان لەتەپڵی سەری سوارەم دا، ئەجارەیان گوتم: بەخۆی و ئەسپەکەیەوە لەحەفت تەبەقەی عەردی غارام بردوونەتە خوارێ.

دنیا لەبن تۆزی بزربوو، تۆز ڕەوییەوە سوار بێ خۆی شێلو کردن و بێ ئاوەڕدانەوە، دیسان گوتی: ئیمام سەبرت هەبێ، بابگەینە ماڵەوەو ئیسراحەتێك بکەین، ئەوسا ئەو وەختی شەڕە گورز خۆشە!! خۆشەویستی خودای هەر بەیەکجاری خۆم لە بەرچاوی کەوت، هیچ ئاگام لەخۆنەما، ئەسپم تاو داو چوومەوە سەر رکێبێ و زۆر بە ڕق و توڕەتر لە جاری پێشوو گورزم باداو هەتا خودا هێزی داومەتێ و بە هەموو هێزو و توڕەیییەوە، ئەمجارەش ئەو گورزە گرانەم لەتەپڵی سەری ئەو سوارەی دا، بووە تەپ و تۆز هەردووکمان لەنێو تۆزیدا بزربووین. گوتم: نەء ئەو جارە جێم کردووتە ئەوجێ! تۆز ڕەوییەوە چی ببینم؟ سوار بێ خۆشێلوکردن، وەك نەبای دیبێ نە باران، لەجاری پێشوو لەسەرخۆتر گوتی: ئیمام دەڵێم سەبرت هەبێ، با بگەینەوە ماڵێ و ئیسرەحاتێکی بکەین، ئەوسا گورز گورزانێ خۆشە!!

خۆشەویستی خودای خۆم لەبەر چاوی خۆم کەوت و گوتم: ئەو ڕۆژی پێبچم ئەو ڕۆژەیە؟! ناچار جلەوی ئەسپەکەم شل کردوو کەوتمە دوای، ئەگەر کەم ڕۆیشتین ئەگەر زۆر گەیشتینە کۆشکەکی لەوسەحرایەی، کۆشکێکی بەتاقی تەنێ، دەرگای کۆشکێی کردەوەو چوینە ژوورەوەو دابەزی و ئەسپی لێوەرگرتم و لەسەر ئاخوری بەستایەوەو ئاو و ئالیکی لەپێش دانا.

هەر خۆی نان و خواردنی ئامادەکردو نانمان خواردو نوێژم کردو پاڵماندایەوە، هێندە ماندوو بووم، نازانم! کەینێ خەوم لێکەوتووە، سبەینی زوو بانگی کردم: ئیمام هەڵسە نوێژەکەت بکە. هەڵسام نوێژم کردو نانمان خوارد خۆمان بەستاو هەرکەسە و سواری ئەسپی خۆمان بووین، لەدەرەوەی کۆشکی مەیدانێك بوو، سوارە لەوێ گوتی: ئیمام فەرموو ئێستا وەختی گورزوەشاندنە. چارچیە؟ دەستمان بە گورز وەشاندنێ کرد، هەتا نوێژی نیوەڕۆیێ، ئەمن گورزی ڕادەوەشێنم، ئەو خۆی لادەداو بەرناکەوێ، ئەو گورزی ڕادەوەشێنێو ئەمن خۆلادەدەم و بەرناکەوم!! پاڵەوان تا ئێستا پاڵەوانی ئاوهام نەدیتووەو نەبیستووە!!وەختی نیوە ڕۆیی گوتی: یا ئیمام نیوە ڕۆیە با نوێژەکانمان بکەین و نانی نیوەڕۆ بخۆین، ئەوسا وەختمان زۆرە بۆ گورز وەشاندنێ. نانی نیوە ڕۆمان خواردو نوێژمان کردوو لێك هاتینەوە

مەیدانێ، ئەمجارەیان بە(ڕم)ی. لەنوێژی نیوەڕێوە تا نوێژی عەسرێ، ئەوا بە سواری بە غار و بە ڕم وەشاندنێ هاتینە یەك، بی فایدەیە هیچمان یەکترمان پێ نابەزێ. هەردووکمان خۆمان و ئەسپەکانمان کەوتوونەتە ژێر ئاو ئارەقەی. دیسان گوتی: ئیمام عەسەرەو با پشوویێك بدەین و نوێژەکانمان بکەین، ئەوسا وەختمان زۆرە بۆ گورز وەشاندنێ. دابەزین و ئیسرەحاتێکمان کردو نوێژەکانمان کرد. پێش ئەوەی ئەم جارەش دەست پێ بکەینەوە، دوو ڕکات نوێژم دابەستاو بە دڵ لە خودای خۆم پاڕامەوە وگوتم: خودایە ئەگەر ئەجەلی من بەدەستی ئەو سوارە نقاپۆشەی هاتووە، ئەوا ئەمجارە کە دەستمان پێکرد، لەعەردیم بداو بمکوژێ! ئەگەر ئەویش ئەجەلی بە دەستی من هاتووە، ئەوا چیتر یەکتر ماندوو نەکەین، لەعەردی بدەم و بیکوژم بڕێتەوە!!

پاش نوێژی عەسرێ لێك هاتینەوە مەیدانێ و ئەمجارە بەشەڕە ملە و زۆرانبازی، کەوتینە بەرامبەری یەك، هێندەمان یەکتر هێناو برد،دیسان هەردووکمان کەوتبووینە ژێر ئاو و ئارەقە، خەریك بوو ڕۆژ ئاوادەبوو، ئەمجارەیان خۆم تێڕو کردو بڵندم کردوو گوتم: یا ئەڵڵاە .. وبەرزم کردەوەو پشتاوپشت لەعەردیم داو هەر زوو سواری سینگی بووم و هەڵمکێشا خەنجەرێ و ویستم سەری ببڕم، سەیرم کرد دوو دلۆپە فرمێسك لەسەر ڕوومەتیەتی، گوتم: حیزە هەر بۆ پیاڵە خوێنێکی دەگریێ؟ گوتی: ئیمام بۆ خوێنی خۆم نیە! ئەی بۆ چیە؟ گوتی: ئیمام خەنجەری خۆت بوەشینەو لە من گەڕێ!! مەسەلەی من دوورو درێژە، خۆشەویستی خودای دەستم شل بوو، گوتم: هەستە ناتکوژم هەتا بەسەرهاتی خۆتم بۆ نەگێڕیەوە. هەڵسایەوە گوتی: ئیمام لێرە نابێ. بابچینەوە ماڵ ئیسرەحاتێك بکەین شەو درێژە بۆت دەگێڕمەوە. شەو پاش ئەوەی نوێژمان کرد و نان و مانمان خوارد، کابرا نقابی لەبەرخۆی داکەند، گەنجێکی جوان و پاڵەوان کەوتە بەرچاوان، بەلام، لە ڕەنگ و ڕویا خەمێکی گران بەدی دەکرا، گوتم: پێم خۆشە هەرچی زووە بەسەرهاتی خۆتم بۆ باس بکەی.

گوتی: ئیمام من کوڕی پاشای فلان شارم، باوکم تەنیا منی هەبوو، مامەکەشم کچێکی هەبوو، باوکم لەسەرینی خۆی لەگەڵ مامم ئێمەیان بۆ یەکتر

**دانابوو، ئێمەش پێکەوە دەژیاین و دەمانخوێندو پاڵەوانیەتیمان دەکردو ببوینە ئاشق و ماشوقەی یەکتر. پاش ماوەیەك باوکم مردو مامیشم پەشیمان بووەوەو دەستی بەسەر شار وڵات داگرت و ئەم کۆشکەی بۆ من لەم سەحرایە دروست کردووە، لەشاری وەدەرنام و لێناگەڕی هیچ کەس لە خەڵکی شار من ببنین لەدەرەوەی شاریش شورەیەکی بەرزی دروست کردووەو حەوت دەرگای هەیەو هەر دەرگایەکی بە ڕۆژ چل پاڵەوان دەیپارێزیٚو بەشەو دەرگاکان دادەخرێن و تیرەمار ناتوانیٚ لێیەوە بچێتە ژوور. ئەو حەوت ساڵە من بەتەنیا لەم سەحرایە دەژیم و دەستگیرانەکەشم لەوەتەی لێك دابڕاوین لەکۆشکی خۆی یاخی بووەو شیرێکی بەدەستەوەیە، ناڵدار بە پێشی دابڕوا ناڵی دەشکێنی، باڵدار بەسەری دابڕوا باڵی دەشکێنیٚ. منیش هەرچی دەکەم بە تەنیا هیچم بۆ ناکریٚ و نەدەتوانم دەستگیرانەکەم رزگارکەم، نەئەویش دەتوانیٚ لەدەستیان هەڵبیٚ.**

**دەڵیٚ: ئیمام گوتی: کە ئەمەم بیست زۆر پەشیمان بوومەوە لەوەی رۆژی پێشتر چەند جارێك ویستم ئەو عاشقە بکوژم، گوتم: هەڵسە هەر ئێستا دەبیٚ بچین، یا ئەوەتا ئێوە بەیەك دەگەن، یا من ئەو سەرەی خۆم هێناوەو نایبەمەوە؟**

**ـ گوتی: ئیمام ئەو کارە بە تۆ ناکریٚ و خۆت لەدوای ئەو کێشەیە مەئالێنە.**

**ـ گوتم: هەڵسە ئەوە چی دەڵیٚ، من یا ئەوەتا پێکتان دەگەیەنم یا ئەوەتە لە پێناوی ئێوە دەکوژرێم. هەرچی ئەو زۆری گوت من کەمم بیست، ناچار هەڵساو کەرەستەو ئەسبابی حازر کردو سواری ئەسپان بووین و بەڕیٚ کەوتین.**

**برۆ بازۆ. برۆ بازۆ سیٚ بەشی شەو ڕۆیشتبوو گەیشتینە نزیك شوورەی شار. کابرا دابەزی و گوتی: ئیمام ئەتو لێرە چاوەڕیٚ بکە، ئەمن دەچمە ناوشار، ئەگەر سەرکەوتم و لەگەڵ دەستگیرانم هاتینەوە، ئەوا پێکەوە دەگەڕێنەوە، ئەگەر نا ئەو پاڵەوان و حەرەسانە بمگرن، زنجیری ئاسنم دەکەنە دەست و پیٚ و سەرو مل و شۆڕی ناو بیرێم دەکەنەوەو سەری بیرەکەش بە**

بەردێکی گەورەو گران دا دەپۆشن، ئەگەر من گیرام ئەوا ئەسپەکەی منیش بۆ خۆت بەرەو نەکەی بە دوای ئێمە دابێی. دەستمان لەملی یەکتر کرد و یەکترمان ماچ کرد. دەڵێ: ئەو پاڵەوانە چل سکە زنجیری لە هەگبەی ئەسپەکەی دەرهێناو سکە زنجیری لەسەر کەڵەنە دیواری دادەاو بە ناو لەپی دەیکوتاو سکە زنجیر هەتا نیوەی لە دیواری بەرد دا شتلْ دەبوو! بەم شێوەیە پاڵەوان وەك پڵنگ سەر دیوار کەوت و ئاوابوو، پاش ماوەیەك بووە غەلبە غەلب و چرقە چرقی شیران، دوای هاوارێك هات و لە دەنگی ڕا زانیم ئەوە پاڵەوان گیرا، دوو جاری تر هاواری کرد، بەڵام هەر جارەی دەنگی لەوەی پێشتر نزمتربوو، بەوە تێگەیشتم کە پاڵەوان گیراو کەوتە نێو بیر .

گوتم: چی بکەم خودایە، ئەو پاڵەوانە گیراو گیرانەکەشی من سەبەبم! هەرچۆنی بێ ڕوحی من لە ڕوحی ئەو پاڵەوانە عاشقە زیاتر نیە! یا ئەوەتە ڕزگاری دەکەم، یان منیش وەکو ئەوسەری خۆم لە ڕێگای ئەو دوو عاشقە دادەنێم. ئەسپەکانم لەو ناوەیە لە درەختێك بەستایەوەو هاتم بەسەر دیوارەکە بکەوم، دیوار چل گەز بەرزەو هەرچی دەکەم سکە زنجیرێکم بۆ بۆناکوترێ . هەر چۆنی بێ بەردم دەهێناو سکەم دەکوتی و بەرهەڵدەقۆزییەوە. بە هەزار حاڵ و بە هەر دەردی سەریەك بوو، لەدیوار سەرکەوتم و چوومە ئەودیو، سەیر دەکەم پاڵەوانەکان و حەرەسەکان هەموو پاش گیرانی کوڕە بێ ترس خەویان لێکەوتووەو هەموویان نووستوون، شیرم هەڵکێشاو ناوی خودام لێهێنا هەر چل پاڵەوانم لەخەودا کوشت و لێنەگەڕام کەسیان دەرچێ، گەڕام بیرەکەم دۆزییەوە، سەیر دەکەم تاشە بەردێکی گەورەو گرانی خراوەتە سەر، زۆرم هەوڵداو ڕمم لەبەر نا هەر چۆنی بوو کەلێنێکم لێپەیداکردوو بانگم کرد.(ئەحمەد) گوتی:بەڵێ ئیمام هاتی. گوتم بەڵێ هاتم. گوتی: ئیمام وا چاکە هەرچۆنی بێ خۆت بگەینیتە دەستگیرانەکەم، چونکە هەر ئەو دەتوانێ ڕزگارمان بکات .

دەڵێ: دەرگام کردەوەو ئەسپەکەی خۆم هێناو سواری بووم جلەوم بۆ شۆڕکرد، شەوەو تاریکە چرایەك لە دەرەوەی شاری کز دەسوتا، ڕووی ئەسپەکەم دایە ئەو چرایە، گەیشتمە بەردەرگا گوێم لێ بوو، ژنەکە

بەمێردەکەی دەگوت: هەڵسە ئەوا ئیمامی هەمزە لەبەر دەرگای ڕاوەستاوە، کابرا دەڵێ کچێ شێت بووی ئیمامی هەمزە لێرە چی دەکات؟ کابرا هەر نەهات. ژنە یەکسەر دەرگای کردەوەو گوتی: ئیمام فەرموو. چوومە ژوورەوە لە ئەسپەکەم دابەزیم و هەرچۆنێك بێ جێگایەکیان بۆ دانام و دانیشتم. دەڵێ لەژنەکەم پرسی چۆن زانیت من لەبەر دەرگام؟ ژنە گوتی: ئیمام ئەو شارە هەمووی گاورن، تەنیا من و مێردەکەم، موسلمانین، زانیم بەو شەوەی تۆ نەبی کەس توانای هاتنە دەرەوەی نیە! هەرئەوەندەش نا: دەشزانم بۆچی هاتووی؟ گوتم باشە ئێستا چی بکەین و چۆن بگەینە کچە؟ گوتی: کچە ئامۆزای گیرایەو هیچ ئاگای لە خۆی نیە! شیری بە ڕووتی بەدەستەوەیەو باڵدار بەسەر سەری دا بڕوا باڵی دەشکێنێ و ناڵدار بەتەکیا بڕوا ناڵی دەشکێنێ. کەس ناتوانێ لێی بچێتە پێش. گوتم: هەرچۆنی بێ، جێگایەکەمپیشانبدە، من دەچم یان دەمکوژێ یا ئەوەتە شتێك دەکەم، پیاوەکە گوتی: من ناوێرم! ژنە گوتی: روحی من لە روحی ئیمام زیاتر نیە! من دوور بە دوور لەگەڵت دێم و لە دوورەوە کۆشکی کچەت پیشان دەدەم پاشان کەیفی خۆتە! گوتم زۆر باشە. ژنە دوورو نزیك بەترس و پارێزەوە کۆشکی کچەکەی پیشان دام، سەیرەکەم کچە جلی پیاوانی لەبەر کردووەو پشتی خۆی توند بە ستاوەو شمشێری بە ڕووتی بە دەستەوەیە .

بە پەنا دزە چوومە بن کۆشکەکەی، شیری بەرزکردەوەو ویستی ڕایبوەشێنێ، گوتم: بۆ خاتری /ئەحمەد/ی؟ کچە گوتی: ئیمام هاتی؟ دەڵێ گوتم: درەنگە با بڕۆین ئەحمەد رزگار بکەین هەندی بلێی یەك و دوو ئەسپێکی هێناو دوو هەگبەی زێری لێبارکردوو سوار بوو گوتی: ئیمام با بڕۆین. ڕۆیشتین و گەیشتینە سەر بیرەکە، کچە وەك پەری لە ئەسپەکەی دابەزی و پاش و پاش کشایەوەو سەرە سمکەکی لەبەردەکەداو ئەو بەردی وا گران ڕۆیی لەوێ هەڵقۆزییەوە، کە ئەمەم لەکچەکە بینی هێندەی تر خۆم لەبەر چاوی کەوت. داهاتەوەو دەستی گەیاندە زنجیرەکەو بەرزی کردەوەو بە کوڕەو قوڕقوشمەوە لەبیرەکەی دەرهێناو لەو گۆڕەی دانا، من بەسەرە ڕم چەکوچ و بەرد کەوتمە ویزەی پساندنی زنجیری سەر و مل و دەست و پێی ئەحمەد،

هەرچی دەمکرد قەفێکم بۆ نەدەپسا، کەچی کچە، هەر سەرە ڕمێکی دەخستە نیوقەفی زنجیرێك و ئاوایەکی لێدەکردەوە زنجیر وەك خەیارێکی ناسك دەپسا! هەندی بڵێی یەك و دوو زنجیرەکەی لە دەست و پیٚ و ملی ئەحمەد کردەوەو سواری ئەسپەکانمان بووین و لە دەرگەی هاتینە دەرەوەو ئەسپی ئەحمەدی هەر لەویٚ دەلەوەڕا، ئەویش سواری ئەسپەکەی خۆی بوو، هاژوامان بەو شەوەی ئەوەندەی ئەسپەکان دەیانتوانی ڕۆیشتین و دوورکەوتینەوە، دوورکەوتینەوە گەیشتینە جێگایەکی کە لامان وابوو لەمەودای دوژمن چوینەتە دەرەوە . هەرسێکمان هیلاك و ماندووین چەند شەوە خەو نەچوویتە چاومان . لەسەر گردەکی دابەزین و من لەوان دوورکەوتمەوە، ئەوان هەردووکیان حەلال و عاشقی یەکترن، با من کەمێك لێیان دوورکەومەوە. لە پەنایەکی خۆم لە عەبایەکەم لول داو جلەوی ئەسپەکەم لە زەنگەکەم ئالاند و پاڵمدایەوە. چونکە ماندووبووین چەند شەوبوو نەخەوتبووین هەر زوو خەومان لێکەوت. کاتەکیٚ بەخەبەر هاتین سەیر دەکەین هەر چوار دەورمان خیوەتە، تاقمە خیوەتەك خیوەتی سوور، تاقمەك خیوەتی سپی، تاقمەك خیوەتی ڕەش.

ــ کچەکە گوتی: ئەو خیوەتە سوورانە هەمووی هی ماڵی باوکمە، خیوەتە ڕەشەکانیش خیوەتی عەسکەرو ئوردییە، خیوەتە سپییەکانیش هی خەڵکی شارییە.

ــ منیش گوتم: خیوەتە سوورەکان با بەر من بکەویٚ، نەوەك ئێوە دەستتان نەچێتە کوشتنیان خیوەتە ڕەشەکەش بابەر/ئەحمەد/ی بکەوی تاقمە سپییەکەش با بۆتۆبیٚ .

ــ دەڵیٚ: شیرمان لیٚ هەڵکێشاو ناوی خوامان لیٚ هێنا، خۆشەویستی خوای شەوقی غەزایێم هەستا شیرم وەك ئەلماسی سەران دەپەڕینی، کاتەك سەیر دەکەم هیچ کەسم لەپێش نەما، سەیر دەکەم کچە وا دەکوژی و سەران دەپەڕێنیٚ، بەڵام، هێشتا هەندێکی لەپێش ماوە، چوومە یاری و ئەوەی مابوو ئەوا نیشمان کوشت. گەڕامەوە سەیر دەکەم، ئەوا ئەحمەد کەوتووتە شەڕ و هەرچی دەکوژیٚ تەواو نابن، بەکچەم گوت! تۆ لێرەبە دەچمە یاری ئەحمەد و

ئێستا دەگەڕێمەوە، چوومە یار ئەحمەدو دەستم بە شەڕ کرد، بکوژەو بڕۆ، کاتێکم زانی کەس نەماوە. کە سەیر دەکەم، لەگەرمەی شەڕێ ئاگام لەخۆنەبووەو لەسەری ئەحمەدیشم داوەو ئەویشم کوشتووە. چی بکەین؟ کچە هات بە ناچاری و بەنوکە ڕمان قەبرێکمان بۆ لێداو هەربە جلی خۆی لە قەبریمان نا، کچە گوتی: ئیمام ئێمە دەستگیرانی یەکتربووین و ئامۆزاو عاشقی یەکتریش. حەز دەکەم کەمێك ماوەم بدەی بۆ خۆم لەسەر قەبرەکەی بە دڵی خۆم تێر بگریەم. ئەمنیش گوتم! ئەوە عورمەیە، ڕەنگە شەرم لە من بکات. با کەمێك لێی دوورکەمەوە بۆ خۆی بە دڵی خۆی بۆی بگرێی .

دوورکەوتمەوە، سەیر دەکەم، ئەوا کچە شیری داناوەو خۆی بە سەردا داوەو شیر لە زگی هاتووەو لە پشتی چووەتە دەرەوە، ئەویش خۆی کوشتووە. خودایە چیم بەسەرهات! هەرچۆنی بوو بەشیر و نوکە ڕمان قەبرەکەم لە تەنیشت ئەحمەدی بۆ ئەویش لێداو ئەویشم لەوێ شاردەوە، دەڵێ: خۆشەویست ئاگای لە ئێش و ژانی ددانی نەمابوو، فەرمووی: ئیمام جێگاکە پێدەزانیەوە؟ گوتم: ئەگەر بمبەنەوە ناوچەکەی جێگاکە دەناسمەوە. خۆشەویست ئەمری کرد ئیمامیان بردەوە ناوچەکەو ئیمامیش گۆڕەکانی دۆزیەوەو گوتی: ئەمە گۆڕی ئەو دوو عاشقە نامرادەیە.  پێغەمبەریش بەرماڵی ڕاخست و دوو رکات نوێژی کردوو لەخوای پاڕایەوە، خوا دوعای قبوول کردو گۆڕەکان شەقیان بردوو کوڕەو کچە بە دەرکەوتن یەك و تەنکە ئاراقیان کردوو، دەتگوت تازە خەویان لێکەوتووە، دەڵێ: چاویان هەڵێناو گوتیان: چیە .. قیامەتە؟ گوتیان نەخێر، ئەوە پێغەمبەری خوای دوعای بۆ ئێوە کردووەو ئیچوەی زیندوو کردووتەوە، ئێستا دەتوانن پێك بگەن و هەرچەندی بتانەوێ بژین! گوتیان! باشە دیسان دەبێ جارێکی تر بمرینەوە؟ گوتیان: بەڵێ پاش عومرێکی درێژو باش پێك گەیشتن، ئێوەش دەمرنەوە .

گوتیان: کە جارێکی تر دەمرینەوە، نامانەوێ جارێکی تر ئازابی گیان کێشان ببێنینەوە، لێمان گەڕێن ژیانی ئێستامان خۆشترە، دەڵێ‌چ: پێغەمبەر ئەمری کرد، دایانپۆشتنەوەو گۆڕەکانیان داپۆشتەوە .
منیش کراشم دڕا و چیم پێنەبڕا .

***لەم حیکایەتەدا فەزای ئەفسانەیی تەواو بەسەر حیکایەتەکەدا زاڵە، هەروەها کاری زیندوو کردنەوەی مردووەکان و داپۆشینەوەیان لەنێو گۆڕ دا، لەسەر خواستی خۆیان ڕەگەزێکی ئەفسانەییە! بەڵام، ئەفسانەی پیرۆزتر کردنی کەسایەتی پێغەمبەر و ئاینی ئیسلام، چونکە لە ئەفسانەدا، ڕەگەزێك هەیە بۆ پیرۆز کردنی و پیرۆزتر کردنی کەس و باوەڕەکان، هەروەها ئەفسانەی (ڕەشکردن)یش هەیە، کە ئەویش هەندێ جار کەسایەتی و باوەڕان ڕەش دەکات .**

# زامی خەنجەرو زامی قسە

**کۆکردنەوە: سەیفوڵڵا خالید عەبدوڵڵا**
**گێڕانەوەی : لوقمــان حەمەد ســاڵح**

**پیاوێك کردبووی بە پیشەی خۆی، دەچوو بۆ دارستان، هەموو ڕۆژێك بۆ داربڕین بۆ دابین کردنی ژیانی خۆی. ڕۆژێکیان شێرێك لێی پەیدا بوو پیاوەکە زۆر ترسا، بۆ ڕۆژانی تر زۆر بە ترس دەگەڕایەوە ناو دارستانەکە ، بۆیە شێرەکە بە ئەمەی زانی ، کە پیاوەکە لێی دەترسێ و بانگی کردوو لێی پرسی! با ئێمە ببین بە هاوڕێ؟ ڕۆژێك پیاوەکە، کە زۆر نزیك بوەوە لە شێرەکە هەستی بە بۆنێکی ناخۆشی دەمی کرد ، پێی وت بۆنی دەمت زۆر ناخۆشە . شێرەکە بەبێ دەنگی مایەوە و پێی وت وەرە تەورەکەت هەڵبگرە یەك تەور بدە لەسەر شانم. پیاوەکەش ئەو کارەی جێ بەجێ کردوو ڕای کرد بۆ ماوەیەکی زۆر نەیتوانی بگەڕێتەوە ناو دارستان. بۆیە ڕۆژێکیان پیاوەکە بیری کردەوە و بزانێ شێرەکە ماوە یان نا؟ کە چوو بینی شێرەکە لەناو جێگای خۆیەتی بۆیە کە شێرەکە پیاوەکەی بینی بانگی کردوو وتی: وەرە من هەر هاوڕێکەی جارانم بۆ ئێستا دیار نی؟ پیاوەکەش بە ترسەوە وەڵامی دایەوە و وتی: وەڵڵا دەترسێم لەوەی کە تۆ بم خۆی! بەڵام شێرەکە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی: نا نا مەترسە تۆ چیت کردووە؟ پیاوەکەش سەری هەڵبڕی و بە تەریقێیەوە ووتی: ئەی من تەورەکەم نەدا لەسەر شانی تۆ . شێرەکەش وتی: سەیری کە شوێنەکەی نەماوە چاك بۆتەوە ، بەس ئەوەی کەماوەو لەبیرم ناچێتەوە ، ئەوە بوو کە تۆ وتت بۆنی دەمت ناخۆشە. پیاوەکەش زۆر بەم قسەیە دڵ گران بوو گەڕایەوە ماڵەوە و بڕیاری دا ، کە قسەی ناخۆش بەکەس نەڵێت ، چونکە قسەی ناخۆش لە بیر ناچێتەوە . بۆیە پێشینان وتویانە زامی خەنجەر چاك دەبێتەوە، بەڵام، زامی قسە چاك نابێتەوە.**

***ئەم حەکایەتە چیرۆکی گیاندارانە**

# کیسەڵ و مام ڕێوی

**شیلان عوسمان عەبدولرەحمان**

**کیسەڵ و مام ڕێوی هاوڕێیەتیان کرد ، لە دوایی پێکەوە جوتیاریان کرد هەمو ڕۆژێ مام ڕێوی دەچوو لەبن کەندەلانێ پاڵی دەدایەوە کلکی بە کەندەلانی هەڵدەپەسارد . کیسەڵی بەستەزمانیش بە تاقی تەنێ تۆوی دەکرد جوتی دەکرد ، هەموو ڕۆژێ دەیوت : کوڕە مام ڕێوی ئەوە بۆ نایەی یارمەتیەکم بدەی؟ مام ڕێوی دەیوت ، ئەگەر لا کەوم کەندەلان دەڕوخێ ڕەنج بەخەسار دەبین! هەموو ڕۆژێ بەم شێوەیەیان بردە سەر هەتا وەختی دروێنە کاتێ وەختی دروێنە هات چوونە دروێنەی وەختێکی بەبیریان هاتەوە (هیرتە)یان لەبیر کردووە، کیسەڵ بە مام ڕێوی وت : مام ڕێوی بگەڕێوە هیرتەکەی بێنە ئەتوو سوکەڵەی . مام ڕێوی گەڕایەوە هیرتەی بێنێ لە ڕێیە هیرتەی خوارد هیرتە لە پێست دروست کرابوو ، لەسەر هیرتەی مام ڕێوی و کیسەڵ بوە شەڕیان کیسەڵ دارەکی لە مام ڕێوی دا مام ڕێوی تڕەکی کرد، شەڕەکە تیژ تر بوو کیسەڵ وتی : با بچینە لای (کوندەبەبۆی)چوونە لای کوندە بەبۆی کیسەڵ بانگی کوندەبەبۆی کرد :**

**کوندی سەرسندی**

**کوندە بۆ وتی: جێگەمە**

**کیسەڵ وتی: ئەتۆ**

**کوندەبۆ وتی: پیشەمە**

**کیسەڵ وتی: ئەمن و مام ڕێوی جوتیاریمان کرد .**

**کوندەبۆ وتی: کاسبی و کرد**

**کیسەڵ وتی: چووینە دروێنەی هیرتەمان لەبیر کرد**

**کوندەبۆ وتی: تەمبەڵی و کرد**

**کیسەڵ وتی: مام ڕێویم نارد هیرتەی بێنی لەڕێ خواردی**

کوندەبۆ وتی: بەد نەفسی کرد

کیسەڵ وتی: دارێکم لێ دا ترێکی کرد

کوندەبۆ وتی: قون سستی کرد

کوندەبۆ وتی: کە وەختی بەش بەشکردنێ هات هەر یەکێکتان زوو تر گەیشتە سەر جۆخینێ ئەو خاوەن حەقە ، مام ڕێوی ئەوەی بەدڵ بوو چونکە کیسەڵ سستە لە ڕۆیشتنێ ، وەڵڵا وەختی بەش کردنێ هات مام ڕێوی لەسەرە خۆ دەڕۆیشت ، وەکی دیتی وا کیسەڵی لە پێشە مام ڕێوی ئەو کیسەڵەی بەجێ هێشت دیتی یەکێکی کەی لە پێشە بەو نەولەی ، تومەز کیسەڵ لە سەرە ڕێ لە بەین نا بەینێ کیسەڵێکی دانابوو ، مام ڕێوی هەر وەی زانی یەك کیسەڵە وەکی مام ڕێوی گەیشتە سەر جۆخینێ دیتی وا کیسەڵ گەنمی دەور دەکاتەوە : 12 . زیادە . چواردە .... بەو نەولەی کیسەڵ بەسەر فێڵی مام ڕێوی دا سەر کەوت .

*حەکایەتی گیاندارانە.

# نەزانینی زمانی گیانداران

**گێڕانەوەی : م/مەلا عەوڵڵا**

کابرایەك هەبوو کەرێك و مانگایەکی هەبوو ، زەمانی عەزرەتی سلێمان بوو (سەلامی خوای لەسەر بێ)ئەو کابرایە چووەکن عەزرەتی سلێمان وتی: قوربان زمانی تەیر و حەیواناتم فێرکە، عەزرەتی سلێمان وتی: کوڕم فێربی بۆ هەرکەسێکی بگێڕیەوە دەمری! ئەوجا کابرا وتی: قوربان قەیدی ناکات ئەگەر بشمرم فێرم کە وەڵڵا فێری زمانی تەیر و حەیواناتی کرد، ڕۆژێکی کابرا ئالیکی دەدایە کەرەکە و مانگاکەی، کابرا لەناو تەویلەی حەیوانەکان بوو ئالیکی دانێ گوێی لێ بوو کە کەرەکە بە مانگاکەی دەووت :ئالیکی خۆت بدە من قەساب هاتوە قەڵەو دەبی دوای قەساب داوات دەکات کابرا دەتفرۆشێ واتە ساحێب ماڵ دەتفرۆشێ ئەمڕۆ ئالیکی خۆت مەخۆ بیدە من ڕۆژێکی کە من دەیدەمە تۆ، کابرا پێکەنی ژنە وتی: کابرا ئەوە شێت بووی بە چ پێدەکەنی؟ دەبێ پێم بلێی بۆ لێرە لەناو تەویلەی حەیوانان پێدەکەنی بەهەر حاڵ پیاوە ئەو ڕۆژەی لە فکری ژنەی بردەوە دووبارە ڕۆژی ئایندە کابرا ئالیکی دەدا مانگاکە و کەرەکەی دیسان کەرەکە وتی: ئالیکی خۆت بدە من دوایی ئەمن دەیدەمەوە توو ، دیسان کابرا پێکەنی ، دیسان ژنەکە چاوی لێ بوو ژنەکە وتی: بە چ پێدەکەنی ئەتوو شێت بووی؟ کابرا ووتی: ژنەکە وازم لێ بێنە بۆت بگێڕمەوە دەمرم ، ژنەکە وتی: بمری و نەمری منداڵت هەتیوو بێ هەردەبێ بۆم بگێڕیەوە ، کابرا ووتی: بڕۆ پارچە کاغەزێکی بێنە لەگەڵ قەڵەمی وەسیەت نامەت بۆ دەنووسمەوە لەو دەمی هەستا سەگێکیان هەبوو نانی دایە سەگەکەی ، لەو کاتەیدا کەڵە بابەکیان هەبوو کەڵەبابەکەی پەلکە نانەکی ڕفاند لەپێش سەگەکە سەگەکە پڕی دایە کەڵەبابەکەی وتی: بۆ نانەکەم دەبەی ؟ کەڵەبابەکە وتی: ساحێب ماڵ وا وەسیەت نامەی دەنووسێ قسەی حەزرەتی سلێمان دەگێڕێتەوە دەمرێ، چێشتی کفتە زۆر دەبێ لەبەر تەعزیەی ئەتۆ تێر دەبی ئەمنیش لە کۆڵیتی (دەخەوم) هەتا سبەینێ، ئەو

وەسیەت نامە دەنوسێتەوە لە ترسی ژنی ، ئەمن نۆ ژنم هەیە لەو ماڵەی دوای ئەوانە کە لە دەرێ هەمە ، یەکێکیان لە قولینچکێکی زگم تێناگەن ساحێبیشم وا لە دەست ژنەکەی دەناڵێنێ هەر چەند هەوڵدەدات قەناعەتی پێ بکا ، ناتوانێ دوو گۆپاڵی لێدا .

کابرا لە قسەی کەڵەبابی تێگەیی، کابرا کاغەزەکەی داناو دڕاندی چوو لە حەوشەی قوتە بەرچیخەکی هێناو لە ژنەکەی داو وتی: جارێکی کە بچمە ئاو دەست خانەش پرسیارم لێ نەکەی ، ژنە وازی لە کابرای هێنا و ئیشیان لەگەڵ یەکتری تەواو ، ئەوها قسەی کەڵەبابی بووە هاندەری .

***ئەمەش حەکایەتی گیاندارانە.**

# مریشکە ڕەشە

**کۆکردنەوە: نەمام عومەر ئیسماعیل**

هەبوو نەبوو، مریشکەکی ڕەش هەبوو، لەسەر هەواری ڕەوەندان بەجیٚ مابوو، مریشکە ڕەشە بە تەنیا ماوە هەستا هێلانەیەکی دروست کرد و هێلکەی کرد، مریشکەکە لەسەر هێلکەکان کورك بوو .

مریشکە ڕەشە هێلکەکانی هەرهێناو بەیانیان جوجەلەکانی دەبردە ئاقاری و دانی دەدانیٚ و شەوان دەیهێنانەوە ناو هێلانەکەی .

ڕۆژێك مریشکە ڕەشە چوو جوجکەکانی بباتە ئاقاری، لە ڕێگادا توشی ڕێویەك هات ، مام ڕێوی پێی وت:مریشکە ڕەشە وەرە بەچکەکانمان تێکەر بکەین مریشك لە فێری مام ڕێوی نەگەیشت و بڕوای پیٚ کرد، هەردووکیان بەچکەکانی خۆیان تێکەڵ کرد، هەموو ڕۆژێك کە مریشك دەگەڕایەوە لە دان خواردن دەیبینی جوجکەیەکی نەماوە، بۆیە مریشك بە مام ڕێوی دەگوت: مام ڕێوی یەکێك لە سەر گچکەکان دیار نییە مام ڕێویش دەیگوت: مریشکە ڕەشە ئەوەم هەر لە تو زانیە فەرقی سەر گەورە و سەر گچکە لە کن من نییە، تاوای لێهات مریشکە ڕەشە لەخۆی بێزار بوو چونکە هەر ڕۆژە و جوجەڵەیەکی بزر دەبو، هەستا چوو بۆلای مام حەیدەری لە تیشی کە پیاوێکی ئازابوو لە ڕاو کردن، مریشکەکە بەسەر هاتی خۆی بۆ مام حەیدەر گێڕایەوە مام حەیدەر گوتی: سبەینیٚ من خۆم لەناو قەمیشان مات دەکەم لەگەڵ هەردو تاژیەکانم ئەتو گاسم کە ئەمن لەناو قەمیشان دیٚمە دەرەوە .

سبەینیٚ کە مریشك و مام ڕێوی چونە ئاقاری مریشکە ڕەشە بە مام ڕێوی گوت : مام ڕێوی وەرە پێچە شاییەکی بکەین مام ڕێویش ڕازی بوو دەستی مریشکی گرت و گوتی: مریشك قوندانیٚ سینگت بخۆم لەگەڵ سیقەدانیٚ لەگەڵ هەموو جوجەلانیٚ .

**مریشکه ڕەشەش گوتی: مام حەیدەری لە تیشی، وەرە دەریێ لەناو قەمیشیێ، کەوری ڕێویان بفرۆشی .**
**مام ڕێوی دەستی خۆی لە مریشك بەردا و پێی گوت: مریشکە قوندانیێ سینگت بخۆم لەگەڵ سیقە دانیێ ئەتوو جەرگی لاوانت بەرداوە .**
**لەو کاتەدا مام حەیدەر لەناو قەمیشان هاتە دەرەوە جووتە تاژی کەوتنە دو ڕێوی و ڕێویان گرت .**
**مام حەیدەر مریشکە ڕەشەی لەگەڵ خۆی بردەوەماڵەوە مریشکە ڕەشە لە ماڵی مام حەیدەر لە فڕوفێڵی ڕێوی ڕزگار بوو بە خۆشی ژیا.**

***ئەم چیرۆکە حەکایەتی گیاندارانە .**

# زەنجیلە و بەنجیلە

هەبوو نەبوو، پیرە مەڕەکو پیرە بزنێك هەبوون، لەسەر هەواری ڕەوەندان بەجێ مابوون، زستان هات و دونیا سارد بوو، پیرە بزن گوتی: پیرە مەڕ وەرە خانیەك بۆ خۆمان دروست بکەین. دونیا وا سارد بووە ، پیرە مەڕ گوتی: ئەمن خوری کێستانم لەسەر پشتە سەرمام نابێ. خانی دروست ناکەم، پیرە بزن بە تەنێ خانیەکی دروست کرد و چووە ناوی دوکاریلەی جوانی هێنا ناوی نان (زەنجیلە و بەنجیلە) .

ئەو زستانە زۆر سارد بوو بەفرێکی زۆر باری، پیرە مەڕ زۆر سەرمای بوو چووە لای بزن و گوتی: جێگای چاوەکەم بکە بزن گوتی: ناو، پیرە مەڕ گوتی: جێی پێیەکەم بکە، بزن گوتی: ناو، پیرە مەڕ گوتی: تەنیا بۆ ئەو شەو جێم بکە، بزن ڕازی نەبوو .

سبەینێ بزن بە زەنجیلە و بەنجیلەی گوت: زەنجیلە و بەنجیلە بڕۆن شیو لەبۆ داپیرەتان ببەن. زەنجیلە و بەنجیلە هاتنەوە گوتیان دایە داپیرە جوابمان ناداتەوە .

کە بزن چوو دەبینێ پیرە مەڕ لە سەرمان مردیە، بزن هەستا پێستەی لێ کردە ڕەشماڵ، پێیەکانی کردە سنگ، سەری کردە کوتك، ڕیخەرۆکی کردە ڕستۆك، چاوی کردە نەینۆك .

هەموو ڕۆژێك بزن دەچووە ئاقاری و تێر تێر گیای دەخوارد و دەگەڕایەوە بە زەنجیلە و بەنجیلەی دەگوت : هەتا ئەمن نێمەوە دەرکەی لە کەس نەکەنەوە .

کە بزن دەچووە ماڵی لە دەرکەی دەدا و دەی گوت : زەنجیلە و بەنجیلە گیای شینم لەبن ددانیە شیری سپیم لە گوانیە دەرگام لێ بکەنەوە زەنجیلە و بەنجیلەش دەیانزانی دایکیانە و دەرکەیان دەکردەوە .

ڕۆژێك گورگ لەو فێرە گەیشتوو، کە بزن ڕۆیشت چوو لە دەرگای داو گوتی: زەنجیلە و بەنجیلە گیای شینم لەبن ددانیە شیری سپیم لەگوانیە ئەمن داکتانم دەرکەم لێ بکەنەوە ، زەنجیلە و بەنجیلە وایان زانی دیکیانەو دەرکەیان کردەوە، گورگ هەردوو کاریلەی خوارد، کە بزن هاتەوە دەبینێ دەرکە لەسەر

پشتێیه و هەردوکاریش دیار نییه یەکسەر چووە ماڵی گورگو چووە سەربانی ماڵی گورگ و کردیە تەپە تەپ .

مام گورگ گوتی: کێیه تەپە تەپ دەکا، ماڵم لێ پڕ خۆڵ دەکا میوانم شەرمەزار دەکا، بزن گوتی: کێ خواردیتی زەنجیلەی من کێ خواردیتی بەنجیلەی من بێتە شەڕە جەنگی من .

گورگ گوتی: من خواردیتم زەنجیلەی توو من خواردیتم بەنجیلەی توو، دێمە شەڕە جەنگی توو، لەبۆ سبەینێ هەردووکیان چوونە لای مەلایێ مەلا هەستا هەردوو قۆچی بزنی زۆر تیژ کرد و ددانی گورگی هەموو دەرهێنا و لە هەویر ددانی بۆ دروست کرد ، بزن و گورگ کەوتنە شەڕ ، گورگ قەمپارەکی لە بزنی دا ددانەکانی هەموو بەربۆوە بزن یەك قۆچی لە گورگی داو سکی دڕاند زەنجیلە و بەنجیلە هاتنە دەرێ بزن پێی گوتن: ڕۆڵە زەنجیلە و بەنجیلە چوو بوونە کێ؟ زەنجیلە و بەنجیلە گوتیان: دایە چوو بووینە ماڵی داپیرەی شیو و نۆکمان دەخوارد بە مراکی قوتە ، قوتە .

***ئەم چیرۆکە حەکایەتی گیاندارانە، قسەکردن و خواردنی زەنجیلەو بەنجیلە و بە زیندوویی هاتنە دەریان ڕەگەزی ئەفسانەیە.**

# بەسەرهاتی فەقێ زبێر

کۆکردنەوە: خەیار تاریق نادر

ڕۆژێك پاشایەك هەبوو، پاشا زۆر دەوڵەمەند بوو، حەوت کوڕی هەبوو تەنیا کیژێکی هەبوو. ڕۆژێك پاشا خۆی خڕ کردەوە بچێ بۆ حەج، مەلایەك هەبوو لە گوندی چووەکن پاشای گوتی: پاشا دەچیە حەجێ؟ پاشا گوتی: مامۆستا ئەمن دەچمە حەجێ ئەو کیژەم بۆ فێرە خوێندن کە، چ دەخوازی تەڵەب کە؟ پاشا ڕۆیی کیژە چووە کن مامۆستای، مامۆستا هیچ دەرسی پێ نەگوت، پڕی دا کیژەی کیژە هەلاْت چووە ماڵی، دایکی گوتی: کیژم بۆ ئەو جلکەت لەبەر نییە کیژە گوتی: کیژی مامۆستام بێ جلك بوو. ڕۆژی پاشتر چووە دەرسێ هیچ دەرسی پێ نەگوت دیسان دەستی بۆ برد چەفیەی بەجێ ما. دیسان چوەوە لای دایکی دایکی گوتی: کوا ڕەفتەکەت! گوتی: کیژی مامۆستام بێ چەفیە بوو. دیسان سبەینێ چوەوە لۆ دەرسی ئەو جارە دەستی لۆ برد لینگە پێڵاوەکی بەجێ ما دایکی گوتی: بۆ بێ پێڵاوی؟ گوتی: کیژی مامۆستام بێ پێڵاوە. گوتیان پاشا هاتەوە لە حەجێ مامۆستا لەگەڵ مناڵەکانی ڕۆیی بۆ بەغدا گوتی: مامۆستا داخوا کیژی منت چۆن فێرە خوێندن کرد؟ مامۆستا گوتی: کیژی تۆ سوك بوو فێرە خوێندن نەبوو، پاشا گوتییە منداڵەکانی برۆن ئەو کیژەی ببەنە چیای بیکوژن، ئەمن نەیبینم. برایەکانی خوشکەکەیان بردە چیای لەگەڵ دەستە جلکەکی گوجیلەیەکی سەیان لەگەڵ برد. گوجیلەکەیان کوشت و جلکی کیژەیان لەخوێن وەردا کیژەیان لەچیای بەڕەڵا کرد، کیژە هەر ماوە لە چیای ڕۆژەك، پاشایەك دەگەڕا لە ڕاوێ، تاژیەکانی پاشا دەورەیان لێ دا کیژەکەی بخۆن! پاشا گوتی: وەرە دەرێ کیژە گوتی: سەڵتەی خۆت بۆم هەڵدە ئاوا نایەمە دەرێ. پاشا سەڵتەی خۆی بۆ هەڵدا. پاشا کیژەکەی لە پشتە خۆی سواری وڵاخی کردو بردیەوە ماڵێ، لە کاتەکی مارەی کرد پاشان خوا سێ کوڕی دایێ ، ڕۆژەك کیژە چووە

سەربانی گوندی باوکی خۆی لێ دیار بوو کیژە گریا، پاشا گوتی: بۆ دەگری؟ گوتی: بۆ نەگریەم ما هەر ئەتو کوڕە پاشای منیش کیژە پاشام ، پاشا سێ خولامی هەبوو بەگەر ژنەی هێخست و بۆ گوندی ماڵی بابی، خولامەکە دووی لەگەڵی چوو گووتی: ئەگەر خۆت تەسلیم نەکەی کوڕی گەورەت دەکوژم؟ لەپاشان کوشتی هێندێکی تر ڕۆیشتن گوتی: کوڕی دیکەشت دەکوژم؟ ئەویشی کوشت بڕێکی تر ڕۆیشتن گوتی: خۆت تەسلیم نەکەی دەتکوژم؟ گوتی: ڕاوەستێ ناوی خوای بینم دەست نوێژێکی بشۆم، ژنە هەڵات بۆ گوندی ماڵی باوکی جلی پیاوانی لەبەر کرد کابراش گەڕاوە شوێنی خۆی. ڕۆژێك پاشا گوتی: بچینە دوای فەقێ زوبێری ئێواری ڕۆژێ چوونە ماڵی باوکی فەقێ زوبێری گوتیان: ئەدی کوانێ فەقێ زوبێر؟ گوتیان: بابە ئێمە فەقێ زوبێرمان نییە .

دانیشتن بە عادزی و مەلولی شەوێ عالەم خڕ بۆوە لە دیوەخانی پاشای فەقێ زوبێر دانیشتن لەگەڵ پیاوان لەدیوەخانێ ئەرێ گوتیان: کێ دەزانی مەسەلەکی بگێڕێتەوە؟ فەقێ زوبێر گوتی: دەگێڕمەوە بەس نابی کەس هەستی خولامەکەش گوتی: دەچم سەر لە ولاخی دەدەم. بەخوا نابێ کەس بچتە دەرەوە ئەوە بەسەر هاتە ، بەسەر هاتی خۆی گێڕاوە ماڵی پاشای پیرۆز باییان لێ کرد مەلاو خولامەکەیان لەسەر یەك داناو تەنەکەیەك نەوتیان پێ داکردن کیژەو باوکەکە پێك شاد بوونەوە سوپاسی پاشای دیکەشیان کردو بە گەریان هێخستەوە . ئەوەش بەسەر هاتی فەقێ زوبێر .

***ئەم جۆرە حەکایەتە باس لەو شێرە ژنانە دەکات کە کەسایەتی خۆیان دەپارێزن. بابە خوینی جگەر گۆشەو خۆشەویستیشیان بێت .**

# دێدە کەچەڵ

**کۆکردنەوە: بنار عەبدولعەزیز ئیسماعیل**

**گێڕانەوەی: وەجیهە حەوێز ئیسـماعیل**

هەبوو نەبوو، کچەکی زۆر جوان هەبوو، ناوی (فاتم) بوو. ڕۆژێك لەگەڵ براژنی چوو بۆ سەر کانی ، بەفرێکی زۆر باریبوو، چیاکانی سپی کردبوو، تیشکی ڕۆژیش لەسەر لووتکەی شاخەکاندا بەسەر ئەو بەفرە سپی و جوانەدا دەبریسکایەوە .

ـ (فاتم) کچەکە گووتی:ـ براژن چی جوانترە لەو دونیایە لەو کێوەی کە ئەوبەفرەی لەسەرەو هەتاو لێی دەدا؟ .

ـ براژنی گووتی:ـ گەردەنی میر خوناوکی زۆر لەو دیمەنە جوانترە!

ـ فاتم گووتی:ـ چی بکەم بەدەستم دەکەوێ .

ـ براژنی گووتی: بچۆرەماڵەوە دووسێ ڕۆژان خۆت خەفەت بار بکەو نان مەخۆ ، بابت بۆت پەیدا دەکا .

فاتم چۆوە ماڵەوە چەند ڕۆژێك ئەوەی کرد کە براژنی پێی گوتبوو، داك و باوکی لێیان پرسی: کچم بۆ وا عاجزی؟ کچەکەش هیچ وەڵامی نەدانەوە ، داك و باوکیشی تەنها ئەو کچەیان هەبوو، بۆیە زۆریان خەم لێ دەخوارد کە ئاوا دەیان بینی .

باوکەکەی هەر وازی لێ نەهێنا تا نهێنیەکەی پێ گووت . باوکیشی هەستا لەبەر جێ بەجێ کردنی داواکەی کچەکەی پێڵاوێکی ئاسن وگۆچانێکی ئاسنی دەست دایە و نانی حەوت شەوو حەوت ڕۆژی لەگەڵ خۆی برد و بەرەو شاری میر خوناوکی ڕۆیشت .

کە گەیشتە شارەکە چوو بۆ دیوەخانی میر زۆریان قەدر گرت و زۆر قەڵەبالغ بوو داوای لە پاشا کرد، کە تۆزێ ئیشی بەمیرە، دەیەوێ بە تەنها پێی بڵێ .

کاتێك باوکی فاتم ئەو شتەی بۆ میر باس کرد. میریش وەڵامی دایەوە

ـ گووتی: باشە ئەتۆ بڕۆوە ئەو دەستە سڕەی بدە کچەکەت و با بیشواو چڵکاوەکەی بەبەر دەرگا دا بکات ، پاش ماوەیەك بەر دەرگاکەتان دەبێتە گوڵ و گوڵزار کە هاتم بۆ شارەکەتان ئەوە ماڵی ئێوە بەو گوڵ و گووڵزارە دەناسمەوە .

کاتێك باوکەکە گەیشتەوە ماڵێ ئەو کارەی کە میر پێی گوتبوو بە کچەکەی گووت .

فاتمیش هاوڕێیەکی دراوسێیان هەبوو ناوی دێدە کەچەڵ بوو ، ئەو کارەی کە نیازی وابوو بیکا بۆ دیدە کەچەڵی هاوڕێی باس کرد کە دەسە سڕەکەی شوشت بوو، چڵکاوەکەی لەناو قاپێك کردبوو بە نیاز وابوو بەبەردەرگاکەی خۆیانی دابکا، لەو کاتەدا فاتم دایکی بانگ کرد کە کاری پێ بوو، دێدە کەچەڵیش ئەمەی بەهەل زانی و چوو چڵکاوەکەی بەبەر دەرگای ماڵی خۆیان داکردو قاپێکی تری لە چڵکاو بۆ فاتم دانا .

پاش ماوەیەکی پێ چوو بەر دەرگای ماڵی فاتم هیچ شتێکی لێ شین نەبوو بەڵام بەر دەرگای ماڵی دێدە کەچەڵ هەمووی بوو بە گووڵ و گووڵزار .

ڕۆژێك میر بەخۆی و بە چەند سوارێکەوە هاتە شاری فاتم و کەبەر دەرگای ماڵی دێدە کەچەڵی دیت یەکسەر چوە ژورەوە داوای کچەکەی لە باوکی کرد، باوکیشی دێدە کەچەڵی دایە و مارەی کرد و بردی لەگەڵ خۆی، کاتێك فاتم ئەوەی زانی زۆر گریا و لە خودای پارایەوە کە ئەویش بچێ لەگەڵیان، خوداش داواکەی فاتمی قبوڵ کرد، فاتم بوو بە ماینێك و بەگەڵ میر و پیاوانی کەوت، لەڕێگادا کە میر چاوی بەو ماینە کەوت زۆری پێ جوان بوو بۆیە داوای کرد کە دێدە کەچەڵی خێزانی سواری ئەو ماینە جوانە بکەن . کاتێك کە دێدە کەچەڵیان سواری ماینەکە کرد پاش تۆزێك ماینەکە هەڵی دا بۆ جاری دووەم و سێیەك سواریان کردەوە هەر هەڵی دەدا . بەڵام کە میر خۆی سواری دەبوو ماینەکە زۆر بەباشی ڕێگای دەبری کەسەرنجی هەموو سوارەکانی تری ڕاکێشاو زۆری خۆش دەویست و بەباشی پەروەردەی کرد .

کە دێدە کەچەڵ ئەوەی دەبینی زۆری پێ ناخۆش بوو بۆیە ڕۆژێك خۆی نەخۆش کرد و گوتی:هەژانە ژانە گۆشتی ماینم دەرمانە.

هەرچەندە میر زۆری پێ ناخۆش بوو، بەڵام دەست و پێوەندەکانی دڵی میرژنیان نەشکاند و بریاریان دا کە ماینەکە سەر ببڕن، بەڵام دێدە کەچەڵ گوتی دەمەوێ کە سەرتان بڕی یەك دڵۆپ خوێن نەڕژێتە سەر ئەرزی، بەڵام کاتێك ماینەکەیان لە حەوشەدا سەر بڕی دوو دڵۆپ خوێن ڕژا بەسەرعەردی حەوشەکەدا ، کە یەکێکیان بوو بەداری چنار و ئەوی تریان بوو بەداری لاو لاو. ئەوەندە گەورەو جوان بوو کە حەوشەی ماڵی میریان ڕازاندبۆوە میر زۆر دڵی بەو دوو دارە خۆش بوو . بەسەر دا میرژن کوڕێکی بوو داوای لە میر کرد کە لانکێکی لەو دار چنارەی حەوشەی خۆیان بۆ دروست بکات . میریش گوتی:. ئەو دارە نابڕمەوە چونکە سێبەرەکەی زۆرە بۆ حەوشەکەو دیمەنەکەشی جوان کردووە ، باشترین لانکت بۆ دێنم کە کەس نەیبێ .

بەڵام دێدە کەچەڵ گوتی:. نەخێر دەبێ ئەو لانکەم هەر لەو دارەی حەوشەکەی خۆمان بۆ دروست بکەی دەنا منداڵەکەم ناخەمە ناو لانك .

ناچار دار چنارەکەیان بڕیەوە جوانترین لانکیان بۆ دروست کرد کاتێك دێدە کەچەڵ منداڵەکەی دەخستە ناو لانکەکەو ڕای دەژاند منداڵەکە هەر دەگریا هەر چەند ڕای دەژاند هەر ژێر نەدەبۆوە ، بەڵام کاتێك میر خوناوك منداڵەکەی ڕادەژاند ، منداڵەکە خەوی لێدەکەوت ، بۆیە دێدە کەچەڵ فەرمانی دا کە ئەو لانکە بسوتێنن چونکە لانکەکە خراپە و بە کەڵك نایە . بەڵام میر گوتی ، ئەو لانکە باشترین وەستا دروستی کردووە عەیبی نییە .

کەچی میر ژن هەر بەردەوام بوو لەسەر داواکەی کەبۆی جێ بەجێ بکرێ بۆیە لانکەکەیان شکاند و سوتاندیشیان ، بەڵام پارچە تەختەیەك لە لانکەکە بە هیچ شتێك نە دەسوتا ، میریش هەڵی دا سەر گوفەکی بەر دەرگاکەیان .

ڕۆژێك پیرێژنێك لە کۆڵانان دەگەڕا وردە دارو کۆلك و شتی وای خڕ دەکردەوە بۆ سوتاندن ، چاوی بە پارچە تەختەکە کەوت و هەڵی گرتەوە و بردیەوە بۆ ماڵێ و خستیە پشت کەندوان گوتی : باجارێ ئەوە لێرەبێ نایسوتێنم تا کاتی پێویست .

ڕۆژێك پیرە ژنەکە چوەوە دەرێ بۆ ئەوەی دار کۆ بکاتەوە کە هاتەوە دیتی ئەوا ماڵەکەی هەموی پاك کراوەتەوەو دەرگاکەش وەك خۆی داخراوەتەوە ،

گوتی هەبێ و نەبێ ئەوا ئەو دراوسێیانەم ئەمماڵەیان بۆ پاك کردومەتەوە ، دوسێ ڕۆژ هەر کە دەگەڕایەوە ئەم ماڵەی وەك و جاری پێشوو دەدەیت ، چوە ماڵی دراوسێیەکەی و سوپاسی کردن ، ئەوانیش وتیان: لەپای چی سوپاسمان دەکەی؟ پلە وتی: چۆن سوپاستان نەکەم ئەمن چەند ڕۆژێکە کە دەچمە دەرەوە ئێوە دێن ئەو ماڵەم بۆ پاك دەکەنەوە ، دراوسێکانی وتیان بەخوا ئێمە هەر نەهاتوینە ماڵی تو وەبۆشمان پاك نەکردویەتیەوە .

پیرێژن سەری لەو کارە سوڕما ، بڕیاری دا ڕۆژێك خۆی بگرێ تا بزانێ ئەو کەسە کێیە ئەو ماڵەی بۆ پاك دەکاتەوە ، ڕۆژێك ئەوەی کرد ، دوای دەرگا داخستن خۆی لە حەوشە شاردەوە دیتی ئەوە ئەو پارچە تەختەیەی کە لەوێ دایناوە بۆتە کچێك نە بخۆی نە بکەی تەماشای خاڵی گەردنی بکەی! ئەویش کراسی کچەکەی گرت و پێی گوت : بزانم ئەتو کێی چ دەکەی لێرە؟ کچەکەش گوتی ئەمن ناوم فاتمە و سەر گوزشتەی خۆی هەموو بۆ پیرێژن گێرایەوە .
پیرێژنیش گوتی: من کەسم نیە بەلاّم لەمەودوا تۆ کچی منی .

ڕۆژێك منداڵی پاشا لەگەڵ منداڵانی گەڕەك تۆپانێیان دەکرد لەناکاو تۆپەکەیان دەکەوێتە حەوشەی ماڵی پیرێژن کچەکەش لەسەر دەرگاکە تۆپەکەیان بۆ هەڵدەداتەوە میریش کاتێك دەستی کچەکە دەبینێ دەزانێ دەستی پیرێژن نیە بۆیە عاشقی ئەو دەستە دەبێ و لەدوای پیرێژن دەنێری کەبێت بۆ دیوەخان، کاتێك پیرێژن دێت بە میر دەڵێ ها میرم کاری چیت پێم بوو بەدوات دا ناردبوم؟ میر بە پیرێژن دەڵێ:. پورێ ئەتو دەڵێی ئەمن بە تەنیام و کەسم نیە ، ئەی ئەو کچە کێیە لەماڵەکەت؟
پیرێژن دەڵێ:. میرم بەخوا من هیچ کەسم نیە و هەر بەتەنها دەژیم زۆری لێ دەپاڕێتەوە کە باوەڕی پێ بکات .
بەلاّم میر بە توندی هەڕەشە لە پیرێژن دەکاو پێی دەڵێ :. ئەگەر پێم نەڵێی ئەو کچە کێیە و چتە ئەوا لەسەرت دەدەم بۆیە پیرێژن بەمیر دەڵێ ئەو کچەی کە لە ماڵەکەم بوە ئەوا میوانە و لەشوێنێکی دور هاتووە .

---

[1] توپانێیان دەکرد = ڕاستیەکەی دەبێ قاشۆیانێ بێت .

(میر)پاشاش مەبەستی ئەوەیە بزانێ ئەو کچە کێیە و کێندەریە؟ بۆیە بانگەوازێك دەکا دەڵێ دەبێ هەموو ژنانی ئەم شارە بێن بۆ دیوەخان باسی ژیانی خۆیان بۆ میر بکەن. هەموو ژنان و کچانی ئەو شارە لە ماڵی میر کۆ دەبنەوە یەك یەك باسی خۆی دەکاو دەچێتە دەرەوە سەرە دێتە سەر فاتم، فاتمیش هەر لەسەرەتاوە چی بەسەر هاتووە هەتا ئەو کاتەی کە چۆن گەیشتۆتە ئەو شارە و باوکی بۆ چی ناردوەو کێ خیانەتی لێ کردوەو هەمووی بۆ پاشایان میر دەگێڕێتەوە ، کە دێدە کەچەڵی هاوڕێی چی بەسەر هێناوە .
میریش کە ئەمانەی دەبیستێ تورە دەبێ و بڕیار دەدات کە دێدە کەچەڵ پارچە پارچە بکەن و بیخەنە ناو تورەگەیەك و بۆ ماڵی باوکی بینێرنەوە .
باوکیشی کە تورەگەکە وەردەگرێ وا دەزانێ کە ئەوە دیاریە لە ماڵی میر بۆی هاتووە کە سەرەکەی دەکاتەوە دەڵێ :.

ئەی ئەوە چاوی زەق زەق دەچێ
هەر لە دێدە کەچەڵی کچم دەچێ

میریش فاتم دەهێنێ و ژیانێکی خۆش بەسەر دەبەن .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: ئاوی دەستەسڕ دەبێتە گوڵ و گوڵزار، فاتم دەبێتە ماین، پشکە خوێن دەبێتەدار، تەختەدار دەبێتەوە فاتم .**

# مام عەبدوڵڵا

**کۆکردنەوە: ســــاکــار هـــەژار**

**گێڕانەوەی : بەهرام کریم عولایە**

**هەبووو نەبوو، کەس لەخوا گەورەتر نەبوو، کەس لە شەیتانی ڕوو ڕەش تر نەبوو، دەڵێ کابرایەك هەبوو، ناوی (مام عەبدوڵڵا)بوو، ئەو کابرایە مەڕدار بوو خاوەنی چەند مەڕێك بوو، شەوێکیان مام عەبدوڵڵا لە دیار مەڕەکانی ماوە لە دۆڵ و دەشت، شەوێ دیتی کابرایەك بە دەرکەوت خۆی دەمامك دابووو ویستی چەند مەڕێك جیا بکاتەوە و بیبات، مام عەبدوڵڵا هاواری کرد وتی: واز لەم مەڕانە بێنە گەر تۆ دزی من لەتۆ دز ترم وەرە مەڕەکان بگەڕێنەوە و دانیشە لە کنم سەر بردەی خۆمم لۆت بگێڕمەوە ، کابرای دز بە گوێی کرد هات لە کنی دانیشت و مام عەبدوڵڵا دەستی کرد بە گێڕانەوەی سەربردەکەی خۆی و وتی:.**

**من دوو برادەرم هەبوو، ئێمە هەر سێکمان دز بووین ڕۆژێکیان هاتن وتیان وەرە با بچینە مەملەکەتێکی تر دزی بکەین بۆ خۆمان چەند مەڕێك بدزین، دەڵێ چەند جارێکیان چوو بوون بەڵام ئەمجارە منیشیان بەگەر خۆیاندا دەڵێ: چوین ڕۆیشتین تا گەیشتینە مەملەکەتێ، تومەز ئەو مەملەکەتە دزی زۆریان لێ کرابوو بۆیە بۆسەیان لەمە داناوە کەوتینە ناو بۆسەو ئێمەیان گرت و ئێمەیان لەناو چەند قۆرتێ شاردەوە بەس سەرمان دیار بوو تا بەیانی، سبەینێ بەیانیان لەگەڵ ڕۆژهەڵات کابرایەك بەخۆی و سواری ئەسپی و سەیەکی ڕەش ئەو سەیە پیاوی دەخوارد، واتە (گۆشت خۆرێکی دڕندانە) سەیەکە لە دوور ڕا چاوی دایە مەو بەغار هات و توند قورقورتۆکی برادەرەکەی منی گرت و بەری نەدا تا خواردی، دوای خواردنی برادەرەکەم چووەوە کن کابرای سوار ئەسپ من و برادەرەکەمماینەوە تا بەیانی دووەم. بەیانی دووەم هەر بەو شێوەیە کابراو سەیە ڕەشەکە بەدەر کەوتن بەڵام ئەم جارە خوا ڕەحمی بێ کردم**

سەیەکە لە دوور ڕا هات و قور قورتۆکی برادەرەکەی ترمی گرت و خواردی دیسان پاش خواردنی برادەرەکەم گەڕایەوە لای خاوەنەکەی کە لەسەر کاینە کە پالْ کەوتبوو من جا ئەوشەوو هەرخۆم جوولاند تادەستم شل کردەوە بۆ ڕۆژی سێیەم هەر بەو شێوەیە سەیەکە هات بەلاْم من نەمکردە نامەردی و توند قورقورتۆکی سەیەکەم گرت و تا خنکاندم لە پاشان هاتمە دەرەوە و لەناو قۆرتەکە شۆڕ بوومەوە بۆ لای کابرا، دیتم لیْ ڕاکشاوە شیرەکەشی لەلایەك دانابوو منیش بە هێواشی شیرەکەم گرت و شیرەکەم لیْ ڕاکێشا لە گێزی ملم دا کابرا کەوتە پرخە پرخ و مرد پاشان منیش سواری ئەسپەکە بووم و جلەوی ئەسپەکەم گرت و شۆڕم کردەوە وتم با بزانم ئەسپەکە دەچیْ بۆ کویْ؟ ئەسپەکە ڕۆیشت تا گەیشتینە خیوەتیْ دیتم ژنیْ هات بەرە و پیرم جلەوی ئەسپەکەی لیْ وەرگرتم و ئەسپەکەی بەستاوە لە پاشان نانی بۆ هێنام نانم خوارد لەبەر ئەوەی من دەمامکم کردبوو منی نەناسیەوە تا شەویْ کە هاتە لام بنوی ئەو جا زانی کەمن مێردەکەی ئەو نیم ، بۆیە ویستی هاوار بکات بەلاْم دەوم گرت بۆیە هەر ئەو شەو خێوەتمان تیْ ناو بەخۆم و مەڕو مالاْت و ژنی کابرا گەڕامەوە ولاْتی خۆم .

جا لەکاتی گێڕانەوەی ئەو قسانەی کابرا ژنەکە لە تەنیشت کابرا دانیشت کابرا وتی: وانیە ژنەکە؟ ژنەکە وتی: وایە. گوتی: ئێستا مارەم کردیە و ئیسلام بووە بۆیە داوات لیْ دەکەم واز لە دزی بێنە کە دزی هیچ نیە جا گویْ بگرە با سەر بردەیەکی ترت بۆ بگێڕمەوە کە بەسەرم هات هەر لەسەر دزی.

جارێکی تر دیسان دوو برادەری تر هاتن داوایان لیْ کردم ئەوانیش کە بچم بۆ دزی لە گەلْیان ئەو جاریش من بە گەریان کەوتم چوین لۆ مەملەکەتێکی تر، تا کەتینە ناو چیا و چۆلەکی ڕۆژ ڕو لە خۆر ئاوابوون بوو دیتمان پیاوێکی ئیختیار ڕدێنی زۆر سپی بووبوو لەدیار چەند مەڕێك بوو ئێمە چوین بۆ لای سەلام عەلیك و عەلیك سەلام کابرای ڕیش سپی بەرەو پیرم هات و گوتی: یاخوا بەخێر بێن سەر هەر دوچاوم. وتمان خالْە ئێمە ڕێبووارین مالْت لەکوێیە؟ وتی: مالْم لەو دیوی چیایە بەلاْم فەرموو با لابدەینە ئەو ئەشکەوتە ئەو شەو لێرە دەمێنینەوە ، ئێمە لە دلْی خۆمان وتمان شەویْ دەیخنکێنین و

مەڕەکانی لێ دەدزین ، جا بەگەر کابرای ڕیش سپی کەوتین تا گەیشتینە ئەشکەوتەکە چوینە ناو ئەشکەوتەکە کابرای ڕیش سپی لێمان بووە دێوێك و دەستی کرد بە پێکەنین وتی: هەی خەشیمینە من دێوم کەرتە چیایەکی لە دەرکی ئەشکەوتەکە داناو ئێمەی حەپس کرد، جارێ زوو ئەو ئێوارەیە برادەرەکەی منی گرت و هورگی کون کرد و شیشەکی تێڕاکرد لەو سەر لەبۆ ئەو سەری لەسەر ئاگری دانا هەتا سۆر بۆوە تێری خوارد ئەو شەو هەتا بەیانی بۆ بەیانی خۆی هێناوە سەر شکڵی ڕیش سپیەکە و لەگەڵ مەڕەکان چوە دەرەوە تا ئێوارێ ، ئێوارێ کە گەڕایەوە برادەرەکەی تریشی وەڵێ کرد ماوە من بە تەنیا منیش ئەو شەو بیرم کردەوە گوتم: تازە من هەر خورامە و وا چاکە شتێك بکەم ، دیتم شیشەکە لەوێ کەوتووە هێنام شیشەکەم لەسەر پۆلیەکان دانا وە زانیم کە خەوی دێوان گرانە بۆیە وازم لە شیشەکە هێنا هەتا سۆر سۆر بۆوە، جا دەڵێ: یەکسەر لەسەر چاوی دێوەکەم دانا هەتا کۆرە بوو دێوە ئەو شەو دەستی کرد بە هاوار هاوار و ناڵە ناڵ وتی: قوڕ بەسەر لەکوێ لە چنگم قوتار دەبی ئەو شەو هەر دەتخۆم کێوە دەچی بۆ بەیانی دێوە بانگی نێرینەکەی کرد، کە نێریەکی هەبووو، دێوە گوتی:. نێری ئەو مەڕانە ببە دەرەوە تا ئێواری، ئێوارێ بیان هێنەوە ، منیش خۆم لەبن نێریەکەوە شاردەوە دێوە دەرکی ئەشکەوتەکەی کردەوە چومە دەرەوە کە دور کەوتمەوە هاوارم کرد هۆ دێوێ قوڕ بەسەر ئەوە هاتمە دەرەوە ئەی ئێوارێ چ دەکەی ، جا دێوە کە لەداخا لە ئەشکەوتەکە هاتە دەرەوە بەڵام کەوتە نێو دۆڵایی پارچە پارچە بوو منیش بەخۆم و مەڕەکانی دێوەکەوە هاتمەوە بۆیە شەرتم کرد کە چی تر دزی نەکەم ژنەکە لەوێ دانیشت بوو وتی: وانیە ژنەکە؟ ژنەکە وتی: بەڵێ وایە ، جا بۆیە دەبێ پەیمان بدەی دزی نەکەی وەها ئاوا (30) مەڕت دەدەمێ کە واز لە دزی بێنی چی تر دزی نەکەی .

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە بووونی (دێوە)ە .

# شێخ ئیسماعیل

**هەبوو نەبوو، پاشایەك هەبوو، ئەو پاشایە کورد بوو، پیاوێکی زۆر چاك بوو داد پەروەر بوو ئەو پاشایە لە مەنتیقەی خاوەر زەمین دادەنیشت ناوی (دادپەروەر)بووە پیاوێکی بەتەمەن بوو چەندین ساڵ بوو حوکمی دەکرد وە خەڵك و فەقیر و فەقەراو زۆر خۆشیان دەویست.ڕۆژێك پاشا تەماشای ئاوێنەی کرد، دەستی کرد بە گریان کە بینی ڕیشی سپی بووە کەچی هێشتا منداڵی نەبوو وەزیر وتی:. پاشای گەورەم بۆچی دەگری؟ .**

**پاشاش وتی:. بۆ ئەوە دەگریم کە ڕیشم سپی بووە ، کەچی هێشتا منداڵم نیە تاکو لەدوا ڕۆژ جێگەم بگرێ و لەوە دەترسم نەوەك لەپاش مردنی من یەکێکی زاڵم بێت و حوکم بکات و ئەم مەملەکەتە وێران کات، بۆیە وتی: دەڕۆم دوور دەکەومەوە تا ماوەیەك دەچم دەپاڕێمەوە تاکو خوا ڕوحمم پێ دەکات ، بۆ بەیانی پاشا و وەزیرەکەی سواری ماین بوون و ئازوقەی چاکیان لەگەڵ خۆیان برد لەکاتی ماڵئاوایی کردن خەڵکەکە و میللەتەکەی دەستیان بە گریان کرد. پاشا و وەزیر قۆناغ بە قۆناغ ڕۆیشتن تا گەیشتنە شوێنێ و دەبەزین دەستیان کرد بە سوجدە و پاڕانەوە هەر هەندەیان زانی پیاوێکی ڕیش سپی لێ پەیدابوو سلام عەلەیك عەلەیکە سەلام، کابرای ڕیش سپی وتی: ئێ پاشا بۆ کوێ ئۆغر دەکەی؟ پاشاش وتی: تۆ چۆن دەزانی من پاشام؟ کابراش وتی: من خدری زندەم پاشای دادوەر خوای گەورە دوعاکانی لێ قبووڵ کردی ئەوا بگرە (3) سێوت دەمێ. یەکی بەخۆت بخۆ یەکی بدە ژنەکەت وە یەکیش بدە ماینەکەت کە ماینەکەی (13)ساڵ بوو نەزابوو ، وە کاتێ منداڵەکە بوو ناوی لێ مەنێ هەتا من دێم. دەڵێ: پاشا دەستی ماچ کرد و کابرا هەندێ ڕۆیی بزر بوو، پاشا و وەزیر گەڕانەوە بۆ شار فەقیر و فقراو بە پیریەوە چون وتیان پاشا مرازت حاسل بێ، دەڵێ: پاشا دەرکەی خەزێنەی کردەوە ئارد و ئازوقەی تەوزیع کرد فەقیر و فەقەرای تێر کرد وەپاشان پاشا سێوێکی خوارد و یەکی دایە ژنەکەی و یەکی دایە ماینەکەی، پاش چەند**

**ڕۆژێك ژنەكەی حەملی و پاش ماوەیەكی زۆر ماینەكەی جوانی بوو و پاشاش كوڕەكی بوو، دەڵێ: كوڕە یەك ساڵ و دوساڵ تا بووە حەفت ساڵ ئینجا پاشا لە قوتابخانەی تایبەتی دانا و پاشا وتی: نامەوێ بەتەنێ بێ بۆیە چووە حوجرەی فەقێیان دیتی كوڕێك لە هەمویان زۆڕەو ترە و زیرەكترە پاشا داوای لێ كرد كە هەموو ڕۆژێ لەگەڵ كوڕەكە هات و چۆ بكات و بیبات بۆ حوجرە و ئاگای لێ بێت ، چونكە لەو گەورەتر بوو ، فەقێ (ئەحمەد)بەمە ڕازی بوو ، ڕۆژێك فەقێ (ئەحمەد)لە ڕێگای گەڕانەوە لە مەكتەب داوای لە كوڕی پاشا كرد كە ڕاوەستێ لەسەری تاكو دەست بە ئاو بگەیێنێ ، بەڵام كوڕە پاشا ملی ڕێی گرت و ڕۆیشت. فەقێ هەر هاواری كرد هۆ فلأن هۆ فیسكە كوڕە جوابی نەداوە چونكە تاكو ئێستا بێ ناو بووە فەقێ لێی تورە بوو گوتی: بۆ ئەوەندی (هێڕی)لۆ هەتا ئێستا بێ ناوی چۆن دەبێ بێ ناوبی؟ وتی: ئێوارێ كە چویەوە كە نانیان خوارد نانی مەخۆ خۆت وا پیشان دە كە عادزی ئەگەر دایكت گوتی: بۆ نان ناخۆی ، بڵێ بۆ هەتا ئێستا ناوتان لێ نەناوم دیارە من كوڕی ئەو ماڵە نیم منتان هەڵگرتیتەوە ، كوڕی پاشا بە گوێی فەقێی كرد ئێوارێ چوەوە وای كرد دایكی لێی پرسی بۆ نان ناخۆی ، ئەویش وتی: :. لۆ هەتا ئێستا ناوتان لێ نەناوم؟ باوكیشی پێكەنی و وتی: ئاسانە ئێوارێ وەزیرەكان كۆ دەكەمەوە مەولودی دەكەین و ناوت لێ دەنێین، بۆ سبەینێ ئێوارە مەولود كرا وەزیرەكان كۆ بوونەوە هەمو داكۆكیان لەسەر ناو لێ نانی كوڕە پاشا دەكرد، ئەو دەی وت: ناوی لێ نێن (ئەحمەد) ئەوی تر دەیگوت:(مەحمود)وە لەپاشان نۆبەتدارانی پاشا دیتیان لە دورەوە پیرە مێردێكی ڕیش سپی بە دەر كەوت داوای لە نۆبەت دارەكان كرد كە ئیزنی بدەن بچێتە كن پاشا، بەڵام ئەوان نەیانهێشت ، پیرە مێرد وتی: بڕۆ ئێوە بە پاشا بڵێن ئەو دەزانێ، یەكێ لە نۆبەتدارەكان چوە كن پاشا و لەبن گوێی پاشا وتی: پیرەمێردێ هاتیە دەیەوێت چاوی بە جەنابت كەوێ ، پاشا وتی: بڕۆ ئیزنی بدە بابێتە ژورەوە پاشا زانی كێیە ، كە پیرە مێرد هاتە دیوەخان پاشا لەبەر پیرەمێرد هەستاوە بەرەو پیری چوو دەستی ماچ كرد پیرەمێرد وتی: بە ئیزنی خوا ناوی لێ نێ (شێخ ئیسماعیل)پیرەمێرد ڕۆیشت و بزر بوو بووە**

چرپە چرپ ئەو وتی: پاشا ئەوە کێ بوو ئەوی تر وتی: ئەوە کێ بوو؟ پاشا گوتی: ئەوە (خدری زندە)بوو هەموو وتیان: بۆ بە ئێمەت نەوت دەستمان ماچ دەکرد پاشا وتی: ئەی من هەڵنەستام دەستم ماچ کرد، کوڕە گەورە بوو خوێندنی تەواو کرد گەنجێکی زۆر جوان و قۆزی لیچ دەرچو ، ڕۆژێ فەقێ وتی:. کورە بۆ نابێ بۆ خۆمان ڕۆژێ بچینە ڕاو چییە واز لە خوێندن نایني هەر خوێندن، خوێندن فەقێ وتی: ئێوارێ چویەوە دیسان خۆت عادز بکە ئەگەر وتیان: بۆ نان ناخۆی؟ بڵێ حەزم لێیە بچمە ڕاو ئێوارێ کە چوەوە بەگوێی فەقێی کرد بابیشی گۆتی: ئاسانە بەیانی بەخۆت و جەماعەتەوە بڕۆن لۆ ڕاوی بۆ بەیانی پاشا ئەمری کرد کە ماینەکی زۆر پیری بدەنێ نەوەك لە ڕێگا شتێکی لێ بێ، دەڵێ چون بۆ ڕاو مامزێکیان لە دور دیت کەوتنە دو مامزی سوارەکان هەمو ڕۆیشتن تەنیا کوڕە پاشا و فەقێ مانەوە ئەسپەکانیان بەزین فەقێ گۆتی دەك داوەشێی بەتوش دەڵێن کوڕە پاشا ئەوە ماین و ئەسپە بۆ داوا لە باوکت ناکەی کە ماینەکی چاك و بەغارت داتێ ئێوارێ کە چویەوە داوا لە باوکت کە ئەو ڕۆژە گەڕانەوە مامزیان پێ نەگیرا کوڕە دیسان هەروەك جاران عادز بوو ، باوکی لێی پرسی بۆ ئاوا تورە دیاری ئەویش وتی: ئەوە ماین بوو دات بەمن شکامەوە لەناو سوارچییەکان بەزیم ، باوکی وتی: ئەوە هەمو ئیشی فەقێیە ئەو ئیشانەت لەبن سەری دەخوێنێ باوکی بۆ بەیانی ئەمری دا ئەو ماینەی بۆ بێنن کەکەس تا ئێستا پێی لەسەر پشتی دانەناوە وە ئاوزی کوڕە پاشایەکەشە ، ماینەکەیان بۆ هێنا بە خۆو فەقێ و جەماعەتەوە دەرچون بۆ ڕاو ، ئەو جارەیان فەقێ و کوڕە پاشا بەپێش جەماعەتیان چون کەوتنە دو مامز بڕۆ بڕۆ تا کەوتنە ناو چیاو چۆڵەکی مامز لێیان بزر بوو ، فەقێ گۆتیە شێخ ئیسماعیل کوڕە وەرە با بڕۆینەوە ئەوا ئێوارەمان بەسەرهات لەو قسانەدا بوون مامزیان دیت چوە ناو ئەشکەوتی: شێخ ئیسماعیل گوتی: وەرە با بچینە ناو ئەم ئەشکەوتە بزانین لۆ ئەو مامزە چوە ژۆرێ ، فەقێ گوتی: وەرە مەچو بەڵکو مامز نییە، جنە یا سحرە ، کوڕە پاشا وتی: هەر دەچم ، فەقێی لە دەرەوە بەجێ هێشت و چوە ناو ئەشکەوتەکە دیتی مامزەکە چوە کن کچێکی نە بکەی و نە بخۆی بەس تەماشای کرد کچەکە قسەی لەگەڵ مامزەکە

**دەکرد و دەستی دەدایێ دەی وت:. ئەی مامزی خۆشەویستم ئەوا بۆ دو ڕۆژە ئەوا ماندی بوویت کێ ئەوا ئەزیەتی دایی؟ شێخ ئیسماعیل سەلامی لە کچەکە کرد وتی: ناوت چییە ؟ بۆ لێرەی بەتەنیا ؟ کچەکەش وتی: ناوم (فاتمە)یە من خوشکی حەوت برایانم کوڕی قەراری واتە (حاکم ، یان پاشا)داوای منی کردیە ئەوە حەوت ساڵە برایەکانم شەڕ لەگەڵ ئەو پاشایە دەکەن بەس لەسەر من شێخ ئیسماعیلیش لەبەر ئەوەی کچەکی زۆر جوان بوو وتی: من چەند لە مێژە بەدوای کچەکی وەکی تو دەگەڕێم ڕازی شو بە من کەی کچەش لەبەر ئەوەی شێخ ئیسماعیل زۆر جوان بوو چووە ناو دڵی و وتی:. بەڵێ ڕازیم ئەنگوستیلەی یەکتریان گۆڕیەوە (شێخ ئیسماعیل) لە ئەشکەوتەکە هاتە دەرەوە لەگەڵ فەقێ چونەوە بۆ ئێوارێ شێخ ئیسماعیل داوای لەباوکی کرد کە حەزی لێیە ژن بێنێ باوکیشی وتی: دەست لەسەر هەر کچێ دادەنێی هەڵبژێرە کوڕەش وتی: من تەنیا (فاتمە)خانم دەوێ و باوکیشی وتی: (فاتمە)کێیە؟ ئەویش وتی: ئەو کچە لەناو ئەو ئەشکەوتەیە خوشکی حەوت برایانە باوکیشی وتی: کوڕم وازی لێ بێنە بەڵکو (جن)بووە خۆی بەتۆ نیشان داوە ئەویش وتی: نا من بەچاوی خۆم دیومە و قسەم لەگەڵی کردیە باوکی ڕازی بوو بەوەی لەگەڵی بچێ بەیانی بۆ سبەینێ چونە کن ئەشکەوتەکە چوار دەوریان گرت شێخ چوە ژورێ دیتی کچە نەماوە نامەیەکی بەجێ هێشتوە نوسیویەتی : براکانم بێزار بوون لەشەر کردن بۆیە لەگەڵ قەراری سولحیان کردیە کە من بدەن بەو ، بەلاّم من عەهدم کردیە کە جگە لەتۆ شو بە کەسی تر ناکەم ئەوەی بێتە کن منیش بە خەنجەر پارچە پارچەی دەکەم ، شێخ ئیسماعیل بە توڕەیی لەناو ئەشکەوتەکە هاتە دەرەوە باوکی وتی: کوا (فاتمە)ئەویش بۆی گێڕانەوە باوکی دیسان پێی وت وازی لێ بێنە بەڵکو جن بووە خۆی نیشان داوە ئێستا بزر بووە ، بەلاّم شێخ ئیسماعیل موسر بوو لەسەر ڕۆیشتنی ، سبەینێ چەك و ئەساس و ماینی حازر کرد و فەقێ وتی: من دێم لەگەڵت بەلاّم نەیهێشت وتی: نەوەك لە ڕێگا توشی شتێك بی سواری ماینی بوو لێی دا ڕۆیشت قۆناغ بە قۆناغ ڕۆیی ، ڕۆیی لە ڕێ توشی بە قەسر و باغ و ڕەزەکی زۆر جوان کەوت چاوی دایە وێ چەند خورام کارێك لەوێ**

بوون دەرگەیان لێ کردەوە جڵەوی ئەسپەکەیان لێ وەرگرت و بەستیانەوە کاو جۆیان دایێ وە نانیان دایە شێخ ئیسماعیل، پاش ماوەیەکی درەنگ دیتی ئاغا ژنەك هات و بەخێرهاتنی شێخی کرد و شێخیش لێی پرسی بۆ بەتەنیا لەناو ئەم باغ و ڕەزەی ئایا سڕی ئەو قەسرە چییە ؟ کچەش وتی:. من ناوم (عائشە)یە من حەوت برام هەیە من پاشای ئەو مەملەکەتەی داوای ئەو قەسر و باغ و ڕەزەو داوای منیشی کردیە کە کابرایەکی کافرە ، بۆیە براکانم ئەوا حەفت ساڵە شەڕی دەکەن ، هیچ لە پاڵەوانەکانی لەشکری براکەم نەماون تەنیا خۆیان کە هەموویان کوژراون ، پاشان شێخ ئیسماعیل خۆی ئامادە کرد و پێش ئەوەی بڕوات وتی: : عائشە خان من لەبەر ئەوەی نمەکی ئەوماڵەم کردیە جا پێم بڵێ کوا براکانت ؟ لە کوێن ؟ عائشە خان وتی: دەستە ڕاست بگرە هی ئەو ڕێیە براکانم وا دیارن ئالاّی سپیان هەڵکردیە ئیسلامن بڕۆ کنیان سەلامیان لێ بکە سەلامت لێ وەردەگرنەوە ، شێخ ئیسماعیل ڕکێفی لە ماینەکەی داو ڕۆیشت، لەوێ براکانی کچەکە دیتیان سوارەك بە دەرکەوت لەسەر ماینەکی حدود، سوارەکە نێزیك بۆوە سەلامی لەوان کرد ئەوانیش سەلامیان لێ وەرگرتەوە، شێخ ئیسماعیل چووە مەیدانی شەڕ نەعرەیەکی لێ داو سەری دە کەسی پەڕاندو گوتی: (الله اکبر)هەرچی هاتە پێش لێی داو سەری پەڕاند و کوشتی تا لەشکرەکەی بە تەواوی شکاند ، ئینجا گوتییە: براکانی کچەکە جا من ئیشم تەواو خوا حافیز، براکانی کچەکەش وتیان: کو ئاوا ئیزنی بدەین با بزانین دەچین پێی دەڵێین:(گورێکمان هەیە لە باغی پێش کێشت بی)ئەگەر گەڕاوە ئەوە عەگید و پاڵەوان دەگەڕێتەوە، یەکێ لە براکان هاواری کرد هۆ سوار ڕاوەستە، شێخ ئیسماعیل ڕاوەستا برای کچەکە وتی: گورێکمان هەیە لە باغی پێش کێشت بێ ، شێخ ئیسماعیل پێی شەرم و عەیب بوو گەڕاوە کە گەڕانەوە خوشکەکەیان لە شێخ مارە کرد و قەسرێکی جوانیان بۆ ڕازاندنەوە پاش چەند ڕۆژێك براکانی کچەکە لە خوشکەکەیان پرسی داخوا ئەو کوڕە لەگەڵی چۆنە خوشکەکەش وتی: چیتان لێ بشێرمەوە شەوان ئەو لەو بەری دەنوی منیش لەو بەری خۆم تێ ناگێنێ براکانی کچە تووڕە بوون بەو قسە وتیان دیارە پێی شەرمە کە خوشکی مەی لە کنە ، یەکێك لە براکانی

وتی: ئەوە دیارە شتێکی هەیە؟ بەیانی لەناو باخ قسەی لەگەڵ دەکەم، با بزانم چی دەوێ بۆچی هاتوە ؟ بۆ سبەینێ برای کچەکە لەناو باخ لەگەڵ شێخ پیاسەیان دەکرد برای کچەکە وتی: ئێمە خوشکیخۆمان پێش کێش بەتۆ کرد کەچی تۆ خۆتی تێ ناگەیەنی دیاری پێت شەرمە خوشکی مەت لە کنە ، شێخ ئیسماعیل وتی: نەخێر بەلاّم من عەهدم لەگەڵ (فاتمە)خان کردووە هەتا ئەو نەهێنم ناچمە کن هیچ ژنی تر، جا برای کچەکە تێ گەیی دەستی ماچ کرد وشێخ ئیسماعیل پێش ئەوەی بڕوات وتی: ئەگەر هاتمەوە ئەوا خوشکتان ژنی خۆمە و ئەگەر نەهاتمەوە با لەسەرم دانەنیشێت مێردی بکات، سواری ماینی بوو ڕکێفی لێ داو ڕۆیشت چەند ڕۆژ و شەوان ڕۆیشت ئەگەر شەوی بەسەر هاتبووایە دەهاتە خوارێ دەنوست بەلاّم ماینەکەی نەدەنوست هەر شتێك ڕوی بدایە چەنگی لێ دەداو هەڵی دەستاند ، ڕۆژەك تەماشای کرد تاقە ڕەشماڵێك لە سەحرایێ بەتەنێ دیارە چاوی دایێ دیتی ڕەشماڵ چۆڵ و هۆڵە و هەموو شتی لێیە بیری لێیە ئاخوڕی لێیە نان و برنج و ڕونی لێیە هاتە خوارێ و ولاّخەکەی بەستاوە کاو جۆی دایێ و بەخۆی شیوێکی چاکی لێ نا وتی: دیارە ئەو ڕەشماڵە خاوەنی هەیە ئەوا ئێوارە دەگەڕێتەوە ، ئێوارە دیتی سوارەك دەرکەوت نقابی کردیە لەسەر ئەسپەکی ڕەش و بە توڕەیی هاتە خوارەوە و وتی: ئەی سوار تاکو ئێستا یەك کەس نەهاتیتە ئێرە شێخ ئیسماعیلیش وتی: من ڕێبووارم لام دایە سوار چیە وتی: ئەم شەو با نانی بخۆین بنوە بەلاّم بەیانی دەبێ زۆران بازی بکەین، کێ پشتی ئەوی تری لە عەردی دا دەبێ بکوژرێ . سبەینێ دەستیان کرد بە زۆران بازی یەك لەوی یەك لەوی تا نیوەڕۆ شێخ ئیسماعیل نەیتوانی پشتی لە عەردی بدا سەری بڵند کرد گوتی: خوایە ئەوە چییە تاکو ئێستا من نەمبەزاندوە؟ بۆیە نەعرەیەکی لێ داو گوتی: بەتەمای تۆ خوایە هەر هەندە پشتی سوارچیەکەی گرت و لە عەردی دا شیری لێ بڵند کرد و ویستی بیکوژێ گوتی: نەکەی من کچم وتی: من ناوم (هەرەم سەعید)ە بەلاّم ناوی ڕاستیم( گوڵ ئەندام)ە جا لێی پرسی کچەکە بۆچی هاتویتە ئێرە؟ ئەویش باسی خۆی لۆ گێڕاوە کچە وتی: با بڕۆین منیش لەگەڵت دێم، بەڕێ کەوتن، لەگەڵ (هەرەم سەعید)چونە ناو

شار كه گەیشتنه شار (هەرەم سەعید)وتی: كو ئەمه ماڵەكی ئەمین بدۆزینەوه شەو لەویْ بین له سواری ئەسپ هاتنه خوارەوه پرسیار به پرسیار تاكو ماڵی پیرێژنێكیان نیشان دا وتیان: ئەو ئیسلامه و میوان ڕادەگریْ چون له دەرگەی ماڵی پیرێژنیان دا پیرێژن بەخێرهاتنی كردن وتیان میوان ڕادەگری وتی: بەڵیْ : بەلاّم من جێی ئەسپم نیه لێی ڕاگرم ئەوانیش وتیان قەینا ئێمه ئەسپەكان دەبەینه ئاخوڕ خانه ماڵی پیرێژنیان دەست نیشان كرد وچەنگه لیرەیەكیان دایێ وتیان شیوێكی چاك لیْ بنیْ تا ئێواره دەگەڕێینەوه ئەسپەكانیان برده ئاخوڕ خانه كه ئێواریْ گەڕانەوه پیرێژن شیوەكی چاكی لیْ نابوو پاش نان خواردن له پیرێژنیان پرسی چ خواس و باسه لەم شاره ؟ پیرێژن وتی: ماڵی قەراری ژنیان هێنایه بووك نایەڵیْ كەس بچیته ژوریْ ئەوی بچی خەنجەری لیْ ڕادەكێشیْ بۆیه ماڵی قەراری بڕیاریان داوه ئەوەی بووك ڕازی بكات خەلاّتی دەكەن. شێخ ئیسماعیلیش داوای له پیرێژن كرد كه عەلەشیشەكی سۆر كاتەوه بیبات لۆ بووكیْ پیرێژن گۆتی: چما نامكوژی ئەویش وتی: نەو ناتكوژی ئەگەر ئەو ئەنگوستیلەیەی نیشان دەی پیرێژن شێخ ئیسماعیل چی وت وای كرد چوه ماڵی قەراری وتی: ئیزنم بدەن ئەو شیوه دەبەمه كن بووكیْ ئەوانیش پیْ كەنین و وتیان: پیرێژن بەئاخیری عومری دەتەویْ خۆت به كوشتن بدەی؟ پیرێژن چووه ژوریْ (فاتمه)خانیش خەنجەری لیْ ڕاكێشاو وتی: نێیه پێش پیرێژنیش ئەنگوستیلەكەی نیشان دا وتی: هەی بیْ ئەخبار شێخ ئیسماعیل هاتیه (فاتمه)خان له خۆشیان شا گەشكه بوو! پیرێژن له ژۆریْ هاته دەریْ وتی: وەلاّ بووكم ڕازی كرد بەس گوتی: دوو كچم هەیه دەیانەویْ بووك ببینن پیرێژن كه گەڕاوه جلی كچانی لەبەر شێخ ئیسماعیل و (گوڵ ئەندام)ی كرد چوونه ژوری بووكیْ شێخ ئیسماعیل خۆی به فاتمه خان نیشان دا بەلاّم فاتمه خان شەرمی كرد لەبەر (گوڵ ئەندام)ی وای زانی پیاوه كه باوەش له شێخ ئیسماعیل بگری بەلاّم شێخ ئیسماعیل وتی: ئەمه كچه پیاو نیه. جا ئەو شەو كوڕی قەراری خۆی ئاماده كرد بەسەد خۆشی بچیْ بۆ كن بووكیْ هەر كه هاته ژوریْ یەك شیریان له گێزەرەی ملی دا كوشتیان هەر ئەو شەو شێخ ئیسماعیل و گوڵ ئەندام و فاتمه خان سواری ئەسپ بوون ڕۆیشتن

تا گەیشتنە شارەکی، جا کە بەیانی بۆوە قەرار وتی: ئەوا نیوڕانە ئەوە لۆ کوڕم نەهاتە دەرەوە کە چوون دیتیان کوڕە کوژرایە، بابگەڕێینەوە کن شێخ ئیسماعیل کە چونە شارەکە دیتیان شارەکی کش و مات کەسی لێ نیە، گولێ ئەندامیش دەستی بە پێ کەنین کرد و وتی: ئەمە شاری بابمە باوکم کە مرد دیتم کەس نیە من شوی پێ بکەم، بە پیاوان بچی، بۆیە شەوێ لە دەرکەی هەر یەکەکم دەدا پیاوەکە بە کراس و بێجامە دەهاتە دەرەوە، منیش یەکسەر لە گێژەرەی ملم دەدا تا وای لێ هات خەڵك ترسا وایان زانی ئەوە دەعبایە بەم شارە فێر بووە بۆیە چۆڵیان کرد منیش ناچار لەو سەحرایە ڕەشماڵم هەڵدا بە تەنیا ژیام وە بڕیارم دا کە ئەوەی پشتم لە عەردی بدات شوی پێ دەکەم وەکو بەخۆت پشتمت لە عەردی دا و ئیسلامیش بووم لەسەر دەستت، جا هەرسێکیان لە شارەکە دەرچون تا گەیشتنە قەسر و باغ و بێستانەکەی ماڵی (عائشە)خان براکانی لای شێخ ئیسماعیل و عائشە خان و فاتمە خان لە کن شێخ ئیسماعیل مانەوە، بەلأم وایان زانی (گولێ ئەندام)پیاوە بۆیە جێیان ویان لەگەڵ خۆیان دانا بەلأم شەوێ درەنگ (گولێ ئەندامیش)چووە تەنیش شێخ ئیسماعیل و ژنەکان کە برایەکانی عائشە بە خەبەر هاتن دیتیان کوڕە لەسەر جێی نەمایە و لە تەنیشت خوشکیان و شێخ ئیسماعیل پاڵ کەتیە دەستیان کرد بە هەرا ویستیان بیگرن وتیان عەیب ناکەی ئەتو لەکن ئەوانە نووستی شێخ ئیسماعیل دەستی کرد بە پێکەنین وتی: کاکە ئەوەش کچە کە خێزانی منە ئینجا تێگەیشتن مەسەلە چییە بۆ بەیانی شێخ ئیسماعیل داوای لە براکانی کچەکە کرد گۆتی من دەگەڕێمەوە وڵاتی خۆم لۆ ئەنگۆش نایەن لەگەڵ من سەد قەسری لەوە جوانتر و ڕازاوە ترتان دەدەمێ؟ جا هەمویان بار و قۆناغیان تێ ناو بەڕێ کەوتن تا شێخ ئیسماعیل گەڕایەوە وڵاتی خۆی جا بۆیە بەخۆشی و شادی هەمویان پێکەوە ژیان .

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: خدری زیندوەو سێوی منداڵ بوونێیە.

# حیكایەتی سوڵتان مەحمود و حەبیبی نەجاڕ

**گێڕانەوە : ئاسۆس مەحەمەد قادر**

**جارێك سوڵتان مەحمود داوا لە حەبیبی نەجاڕ دەكات، كە 40 بارە حوشتر كای دار (ئەوەی لە ئەنجامی بڕینەوەی دار پەیدا دەبێت لە كاتی ئیش و كاری دارتاشی)دا، لەماوەی 24 سەعاتدا بۆ بنێریَ ئەگەر ئەم مەرجە جێ بەجێ نەكات، ئەوا لە سێدارەی دەدات.ئیتر كە حەبیب دێتەوە ماڵەوە، نازانێ چی بكات ژنەكەی پێی دەڵێ: بێ خەم بە خوا لەسوڵتان مەحمود گەورەترە، ئیدی كاتێ كە 24 سەعات مۆڵەتی سوڵتان مەحمود تەواو دەبێ لە دەرگا دەدرێ حەبیبی نەجاڕ لەرزی لێدێ دەڵێت: ژنەكە بڕۆ دەرگاكە بكەرەوە ئەوا هاتوون من بدەن لە سێدارە، كە ژنەكە دەچێت دەرگا دەكاتەوە" بەڵام، ژنە هەر دڵی مێردەكەی دەداتەوە دەڵێ خوا لە سوڵتان گەورەترە، یەكسەر ژنەكە بە خۆشی خۆشی دێتەوە بۆ لای حەبیب و پێی دەڵێ: حەبیب موژدەم بدەرێ موژدە ئەوانە هاتوون ئەڵێن با حەبیب دارە مەیت بتاشێ بۆ سوڵتان مەحمود، ئەی حەبیب پێم نەگووتی خوا لە سوڵتان مەحمود گەورەترە .**

***ئەم حكایەتەش لێرە بە كورتی گێڕدراوەتەوە، دەنا درێژترە.**

# حه‌كایه‌تی بالوری

**گێڕانه‌وه : خه‌لیل ئه‌نوه‌ر حوسێن**

هه‌بوو نه‌بوو، كابرایه‌ك هه‌بوو، ناوی بالور بوو، كوڕێكی هه‌بوو كه‌ قه‌ت به‌ قسێی ناكرد و ئه‌گوێی دا نه‌بوو لۆیێ هه‌موو ڕۆژێ بالوری هه‌را ئه‌گه‌ره‌ كرد به‌لآم كه‌ڵكی نه‌بوو، ئه‌و كوڕه‌ هه‌ر به‌ قه‌سێ خۆیه‌كرد و گوێی نادا بالوری و تووشی خه‌م و خه‌فه‌تانیه‌كرد . بالوریش ئه‌زانی كه‌ ئه‌و كوڕه‌ی برا ده‌ریێ خه‌رابیاهه‌نه‌ لۆیێ ئیوه‌ هه‌یه‌، چونكه‌ هه‌موو ڕۆژێ له‌ماریێ پاره‌ وه‌ره‌گرت و ئه‌چوو له‌ براده‌رانی خه‌رجه‌كرد . ئه‌و براده‌رانه‌ش وا گوتیێ: ئه‌گه‌ر تووشی چه‌بووی ئه‌وه‌ وه‌بریێ مه‌، ئه‌مه‌ تاله‌ پارپشتێن ئه‌ویش هه‌ر گه‌وره‌ بوو به‌و قسانه‌و . وه‌یه‌زانی به‌ڕاستیانه‌، لۆیه‌ چاتری پاره‌ لۆ دینان ڕۆژه‌كی بالوری وه‌گۆتیێ: باش كوڕم ئه‌تو ئه‌و پاره‌ی هه‌نده‌ چ لێ ئه‌كه‌ی هه‌موویه‌خۆی ئه‌ویش وه‌گۆ نا بابه‌ ئه‌من هه‌نده‌ك براده‌ر گه‌له‌ك چاكما هه‌نه‌، به‌خۆ ئه‌وان ئه‌و پاره‌ی پێكه‌وه‌ خۆین، بالۆریش وه‌گۆتیێ: كوڕم ئه‌تو ئه‌و براده‌رانه‌ت به‌سه‌ر كردینه‌وه‌ تا خوا ئه‌كونه‌ كو له‌خۆڕا وارێی براده‌رم ئه‌چاكن؟ ئه‌ویش وه‌گۆ بابه‌ هه‌موو ڕۆژێ مه‌ وارێنیێ ئه‌گه‌ر تووشی چ هاتی وه‌ بریێ مه‌، ئه‌مه‌ تا له‌پارپشتێین ئه‌گه‌ر تووشی چ بووی ئه‌مه‌ تا له‌پارپشتێین، بالوریش وه‌گۆ باشه‌ ئه‌منیان به‌سه‌ره‌كه‌مه‌وه‌ . چوو به‌رانه‌كی گه‌وره‌ی كڕی و له‌ مارێی كوشته‌وه‌ و ئه‌ناو پێستی دا گرواند و پاش هه‌نگینیێ چوو هاویشتیه‌ ناو كفنی و كردیه‌ جه‌نازه‌ و له‌ حه‌مامێی دانا بیێ ئه‌وه‌ی كه‌س هاگالێبی هه‌نگینیێ وه‌ی گۆته‌ كوڕی خۆ كوڕم زه‌لامه‌كمان كوشتیه‌ ئه‌وا له‌ حه‌مامێم دانایه‌ و كفنما كریه‌ .

هه‌ڕوو وه‌ بریێ براده‌ریێ خۆ بابێن ئه‌گه‌رن بێن تا بچین له‌ كه‌نده‌كی وه‌شێرین و بزری كه‌ین هه‌تا كه‌س نه‌زانی و لێن ئاشكرا نه‌بیێ كوڕه‌كه‌ش چوو وه‌ی گۆته‌ براده‌ران باوم زه‌لامه‌كا كوشتییه‌ و ئا له‌ماریێ دانایه‌ و كفنیا كردیه‌،

لەگەرن وەرن تا بچین لەکەندەکی وەشێرین و بزری کەین نەخۆ لێن ئاشکرا بی بەس با کەس نەزانی، ئەوانیش وەگۆتیێ: ئەتوو هەڕۆوە حازری کەن ئەمەشا دێین کە ئەو ڕۆیشت ڕاست چوون پۆلیسیان هاگادار کردەوە و چوونە سەر مارێیان بەخۆ پۆلیسیان کە پۆلیس چوونە ژۆریێ وەیان گۆ کوا ئەو زەلامەن کوشتیتو چ وەلێ کرد؟ بالوریش وەگۆ: ئەوەتەیە ئەوە زەلامی کوشتیم کەسەر کفنی هەرداوە و وەی گۆ دەوجا بخۆن پۆلیسانیش لەویێ تێر گۆشت خواردو گەڕانەوە بالوری وەگۆ کوڕم ئەوەش برادەریێ توو بوون کەلەخەراپەیان زیاتر نەبوو . لۆتو بەس ئەتو ناناسین وەتەزانی تاخوا چەندە چاکن نەتەزانی بەس پارەتاپیێ سەرف کەن بەس وەی گۆ کوڕم ئەمن نیو برادەرا هەیە ئەویش قەسابە هەڕوو وەی بریێ باوم وەگۆ باڕانە گۆشتەکی زۆر چاکن وێدا میوانیێ زۆر خۆشەویستمان هەنە . ئەویش چۆکن قەسابەکەی و وەی گۆتیێ: باوم وەگۆ با ڕانەگۆشتەکی زۆر چاکم وێدا میوانیێ خۆشەویستمان هەنە قەسابیش ڕانەگۆشتەکی زۆر چاکی وێدا کوڕەکە گەڕاوە ماریێ بەخۆ ڕانەگۆشتی کە گەیشتەوە ماریێ بالوری ئێکسەر ڕانەگۆشت لێوەرگرت و ئەناو قوڕاویێ وەرداو وەی گۆ ها کوڕم لۆی بەوە وەی بریێ باوم وەگۆ ئەوە گۆشتە لۆ منی ناردییە وەی بریێ با ڕانە گۆشتەکی زۆر چاکم لۆ بنێری میوانیێ خۆشەویستمان هەنە ئەویش گۆشتەکەی لۆ قەسابی بردەوە و وەی گۆتیێ: باو وەگۆ با ڕانەگۆشتەکی زۆر چاکم لۆ بنێری قەسابیش ڕانە گۆشت لێوەرگرتەوە و ڕانە گۆشتەکی زۆر چاکی وێدا دیسان کوڕەکەی ڕانە گۆشت بردەوە و ئەوجارەش بالور لێ وەرگرت و ئەناو قوڕاوێشی وەرداو وەی گۆ کوڕم لۆی بەوە وەی بریێ باوم وەگۆ ئەوە گۆشتە لۆمنا نێری با ڕانە گۆشتەکی چاکم لۆ بنێری میوانی خۆشەویستمان هەنە، ئەوجارەش کوڕەکەی گۆشت لۆ قەسابی بردەوە و وەی گۆ باوم وەگۆ با گۆشتەکی چاکم بۆ بنێری ئەوە گۆشتە لۆ منی ناردیە قەسابیش دیسان ڕانە گۆشت لێ وەرگرتەوە و چ ڕانەکی پیێ ئی چاك بوو وێی داو ئەوجارەش کوڕەکەی گۆشت بردەوە و بالوری لێ وەرگرت و ئەناو قوڕاوی وەرداو وەی گۆ کوڕ هەڕوو لۆی بەوە وەبریێ باوم وەگۆ: گۆشتی هەر بەکەلك نایێ و هەر نامەویێ . دیسان ئەوجارەش کوڕەکەی ڕانە گۆشتی بە قوڕاوی لۆ

**قەسابی بردەوە و وەی گۆتیٚ: باوم وەگۆ گۆشتی هەر بەکەڵك نایێ و نامەویٚ. قەسابیش گۆشت لیٚ وەرگرتەوە و کوڕەکە گەڕاوە ماریٚ و بالوری وەگۆتی: کوڕم ئەوەش نیو برادەری من بوو سیٚ جارم گۆشت ئەقوڕاویٚ وەردا و لۆم ناردەوە لۆییٚ برادەری خۆ بەسەر کەوە تا خوا ئی کوە ئەوجا هەنگینا زانی ئی چاکە یان ئی خراپە هەتا تووشی برادەری خراپ نەبی و برادەری چاکیشت هەر هەبی چونکە هەموو وەختەکت بە کەڵك دیٚ .**

***حەکایەتێکی پەند ئامێزە.**

# برادەرایەتی کوڕی پاشای ئێران و هیندستان

**کۆکردنەوە:ئەحمەد قادر خدر**
**گێڕانەوەی:کارزان حوسێن مولود**

**هەبوو نەبوو، دوو برادەر دەبێ، یەکیان پاشای ئێران و ئەوی تریان پاشای هیندستان دەبێ، هەریەکەیان کوڕەکیان دەبێ، ئەو دوو برادەرە زۆر یەکتریان خۆش دەویست زۆر یارمەتی یەکتریان دەدا . ساڵ ڕۆیی ساڵ هات پاشای ئێران مرد ، پاشای هیندستان بە کوڕەکەی خۆی گووت: کوڕم وەرە با بچینە ئێران بۆ تازیەی پاشای ئێران، کوڕەکەشی بەخۆشحاڵییەوە بەگەری کەوت چوونە ئێران و کوڕی پاشای ئێران بەخێرهاتنێکی زۆر گەرمی لێ کردن و ڕێزی لێ گرتن و مێوانداریيەکی زۆری کردن. کاتێك گەڕانەوە بۆ هیندستان پاش ماوەیەکی کورت پاشای هیندستانیش مرد . هەربۆ ڕێزلێنان و بەوەفایی کوڕی پاشای ئێران هەستا چووە هیندستان و تازیەی پاشای هیندستانی کرد. کوڕی پاشای هیندستان زۆر بەخێرهاتنی کرد و ڕێزێکی زۆری لێ گرت بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك مایەوە لە هیندستان. ڕۆژێکیان لەگەڵ کوڕی پاشا دەچن بۆ سەربان چاوی بە کچێکی زۆر جوان دەکەوێ لەژیانی کچی وا جوانی نەدیبوو، یەکسەر لەهۆش خۆی دەچێت و دەکەوێتە ئەو گۆڕە! کوڕی پاشای هیندستان هەڵی دەگرێتەوە و دەیباتە خوارەوە، پاش ئەوە بەخۆ دێتەوە لێی ئەپرسێ بۆچی لەهۆش خۆت چووی؟ لە هەمان کاتدا ئەم کچە جوانە دەزگیرانی کوڕی پاشای هیندستانە، ئەویش بەمە نازانێ بۆیە هەموو سەربردەکەی بۆ دەگێڕێتەوە. کوڕی پاشای هیندستانیش هەڵدەستی بە دزی کوڕی پاشای ئێران مەلایەك بانگ دەکات و دەستگیرانەکەی تەڵاق دەدات و ئینجا بانگی کوڕی پاشای ئێرانی کرد و لێی مارە کرد و تاوەکو سەر ئاوێی بردن و سواری بەلەمی کردن و گەڕانەوە بۆ ئێران. بەڵام پاشای هیندستان ئەمەندە دڵ ساف بوو بۆیە ئەو ماڵەی کە هەی بوو هەمووی بە پیاوەتی**

سەرف کرد و ماوەیەکی زۆری پێ چوو ڕۆژەکی سەیری پارەکانی کردن کە حەفت سەد لیرەی ماوە فکری کردەوە ئەگەر ئەوها بڕوا ڕۆژەك دادێ هیچ پارەی نامێنێ دەبێ دەرۆزە بکات. یەکسەر کوڕی پاشای هیندستانی بە بیر هاتەوە کە لەکاتی خۆی پیاوەتیەکی گەورەی لەگەڵ کردووە بچێتە لای ئەو بۆ ئەوەی یارمەتی بدات و لەوێ بژی هەستا سواری بەلەم بوو پارەکەشی لەگەڵ خۆی برد شەویان بەسەردا هات، بووە باران. بەیانی تەماشا دەکات پارەکەی نەماوە، گاسی خاوەن بەلەمەکەی کرد. ئەو گووتی: من ئاگام لێ نییە بەلەمەکەش خەرکی زۆر تێدابوو پارەکەی نەدیتەوە خاوەنی بەلەمەکەش گووتی: لەڕای خوا تازە دەت بەم کاتێك گەیشتە ئێران چووە بەردەم کۆشکی کوڕی پاشای ئێران بە یەکێ لە پاسەوانەکانی بەر دەرگای گووت: کەوا کوڕی پاشای هیندستان هاتییە بۆ لات واشی چاوەڕوان دەکرد کەوا ئێستا پێشوازیەکی زۆر گەرمی لێ دەکات. بەڵام پاسەوانەکە هاتەوە گووتی: پاشامان دەڵێ: جارێ مەجالم نییە بۆیە سەری خۆی هەڵگرت و چووە ناو کەلاوەیەك لە شاردا کاتێك شەو داهات کوڕی پاشای هیندستان ئەوەی زانی نۆ کەس جلی بازرگانیان لەبەرەو یەکەو بارێکیان لە وڵاخەکانیان داوە بە ژوورەوە کەوتن سەلامیان لێ کرد و گووتیان: قوربان ئەم نۆ تورەکە هەر هەمووی ئاڵتونە ئێمە لای تۆی دادەنێین دەچینە ناو ئەو دارستانە بۆ سەندنەوەی حەقی خۆمان لە یەکێ ئەگەر تاوەکو بەیانی گەڕاینەوە ئەوە بارەکانمان بدەوە ئەگینا ئەوە بزانە کەوا ئێمە مردووین و نەماین گەردەنت ئازا بێت و بۆ خۆت بیخۆ. ئەویش تاکو بەیانی دانیشت و چاوەڕێی کرد. نەهاتنەوە، نەیزانی چیان لێ بکات بۆیە بڕیاری دا بە پاراستنی ئەم مارە چونکە زۆر لەخوا ترس بوو. چووە ناو شار و لەگەڵ خاوەن کۆگایەك ڕێککەوت کەوا ئەم ئاڵتونەی بۆ بپارێزێ و ووڵاغەکانیشی بۆ بەخێو بکات لە بری (50)لیرە بۆ هەر هەفتەیەك بۆیە کەمێك لە ئاڵتونەکەی هێنا بردیە بازاڕ و کردیە پارەی دەیدایە خاوەن کۆگایەکە تاوەکو حەوت ساڵ ژیانی بەدەردە سەری بردە سەر ڕۆژی بەڕۆژی بە پێنج لیرە ئیشی دەکرد و دەچووە کەلاوەکەی دەیکردە مەسرەف کاتێك لەوە دڵنیا بوو کەوا خاوەنەکانی ئەم ئاڵتونانە نایەنەوە بۆیە هەڵسا داوای

پارچەیەك زەوی لە پاشا کرد و پاشان کۆشکەکی پێ دروست کرد. زۆر لە کۆشکی پاشا خۆش تر و جوان تر بوو، بۆ ماوەیەك بە تەنیا لە کۆشکەکەی بوو . ڕۆژێکیان پیرەژنەك لە دەرگای پاشای هیندستانی دا گووتی: فەقیرم ئەگەر ڕێ بدەی بێمە ژوورەوە نانی نیوەڕۆ لێرە بخۆم؟ ئەویش کە چاوی پێ کەوت زۆر دڵی پێ سووتا کە سەیری کرد جلەکانی هەموو پینە پینەیە، بۆیە گووتی: فەرموو. بردیە ژووری نانەکی باشی دایێ پیرەژن پێی گووت: کوڕم وا دیارە تۆ بەتەنها بووی کەست لەگەڵدا نییە؟ ئەویش سەرو سەربردەی خۆی بۆ گێڕایەوە بە تەواوی پیرەژنەکەش گووتی: مادام وایە کچێکم هەیە لە جوانیا هیچ کەسی نییە لەم شارە شان لەشانی بدات. تەنانەت لە ژنی پاشاش جوانترە وەرە داخوازی منیش ڕازی دەکەم و لێت مارە دەکەم . کوڕەکە وای زانی پیرێژنەکە سوحبەتی لەگەڵ دەکات بەڵام پیرێژنەکە لەسەر قسەی خۆی موسرِ بوو کوڕەکەش گووتی: باشە مادام وایە سبەینێ دێم تەماشای دەکەم. جێگایەکم پێ بڵێ، ئەویش کەلاوەیەکی تری هەبوو لەشار ناونیشانی دایێ و بەیانی چوو بەڵام چ چوون! کاتێك چاوی بە کچەکە کەوت زۆر لە دەستگیرانەکەی جوانتر بوو بۆیە هەر هەمان ڕۆژ مارەی کرد و دوای چەند ڕۆژەکی ئاهەنگەکی گەورەی کرد بۆ ماوەی چەند ڕۆژەکی گواستیەوە، بەڵام لەناو قەومی ئەم شارە عادەتەك هەبوو هەموو ساڵێك لە پیاوە گەورەکان و پاشا و پیاو ماقولان دەوڵەمەندیان لە ڕۆژێکدا کۆ دەبوونەوە هەر کەسەیان چاکەی خۆی لەسەر یەکی باس دەکرد و بێ وەفایی بەرامبەرەکەی نیشان دەدات کاتێك سرەی کوڕی پاشای هیندستان هات لەسەرەتا باسی پیاوەتی خۆی لەگەڵ کوڕی پاشای ئێراندا کرد و بۆ خەڵکەکە باسی کرد کە ئەو دەستگیرانی لە پێناو برادەرایەتی تەڵاقدا و هەرخۆشی لە کوڕی پاشای ئێران مارە کردووە بەبێ ئەوەی بزانێ ئەمیش ڕۆژگار وای لێ کردم کەوا دەست کورت بووم ڕووم کردە لای دەرگای وی ئەو لەبری پیاوەتیەکەم بە پاسەوان وەڵامی بۆ ناردم کەوا مەجالم نییە لەگەڵی دانیشم. خەڵکەکەش تفیان لەچارەی کوڕی پاشای ئێران دەکرد بۆ ئەم بێوەفاییە بەڵام کاتێك سرەی کوڕی پاشای ئێران هات لەپێشدا باسی پیاوەتی کوڕی پاشای هیندی کرد و

گۆتی: ئەمن لەبەر ئەوە وەڵامی کوڕی پاشای هیندستانم نەدایەوە گووتم: با نانی شەرمەزاری نەخوات هەست بەوە نەکات کەوا من لە ئەو دەوڵەمەند تر و خاوەن پایە ترم، بۆیە وەڵامم نەدایەوە بەڵام بە شێوەیەك یارمەتیم دا کەوا خۆشی نازانێ چۆنە بۆ ئەوەی بەبیریشی بێنمەوە ئەو نۆ بازرگانەی کە بارە ئاڵتون و وڵاغەکانیان پێ بوو من ناردنم بۆت بۆ ئەوەی هەست بەوە نەکەی کەوا لەبری چاکەکەت یارمەتیم دای بۆیە بەم شێوەیەم بۆ ناردی و پارچە زەویەکەش، لەباش ترین جێگا بۆم هەڵبژاردی لەسەروی هەموانەوەش ئەو پیرێژنە کە بەناوی فەقیر هاتە لات ئەوە دایکم بوو من ناردم بۆ ئەوەی خوشکەکەمت پێشکەش بکات ئینجا خەڵکەکە کە بەوەیان زانی زۆر دڵخۆش بوون و هەردوو کوڕە پاشاش دەستیان لە ملی یەکتری کرد و ژیانیان بەیەکەوە لە ئێران بەخۆشی و پڕ لەشادی بردە سەر .

*ئەم حکایەتە هیچ ڕەگەزێکی ئەفسانەی تێدانییە، بەڵام گێڕانەوەی زەمەنی ئەفسانەیی تێدایە.

# سەعد و سەعید

**کۆکردنەوەی : ئەحمەد قادر خدر**

**گێڕانەوەی : م. هـــاوار خـــدر**

هەبوو نەبوو، پیاوێك و ژنێك هەبوون، کە دوو کوڕیان هەبوو، بەناوی (سەعد و سەعید)سەعد برا گەورەکە بوو سەعیدیش برا بچوکەکە. ڕۆژێکیان سەعد و سەعید لەگەڵ دایك و باوکیان بۆ قەسەر خڕ کردنەوە چوون بۆ دەشت لەناو پەرێز وە لەو کاتەدا سەعد و سەعید لە دایك و باوکیان دوور کەوتنەوە . لەناکاو تەیرێك هەڵفڕی لەشوێنی ناو هێلانەکەی خۆی لەناو پەرێزەکە و لەناو هێلانەکەدا هێلکەیەك بەجێ ماببوو. سەعد و سەعیدیش بانگی باوکیان کرد وتیان: بابە هێلکەیەك بەجێ ماوە لەناو ئەم هێلانەیەدا .

باوکی سەعد و سەعید : هێلکەکەی هەڵگرت بردی لەگەڵ خۆی بۆ شار لەناو بازاڕ هێلکەکەی بە دەستەوە بوو دەیفرۆشت لەناکاو پیاوێکی جولەکە لێی پەیدا بوو گووتی: ئەم هێلکەیە چییە؟ پیاوە جولەکەکەش لە هێلکەکەی دەزانی هی چی تەیرێکە .

گووتی: هەرجارێ ئەم هێلکەیەت هێنا بەهەر چەند بێت من دەیکرم تەنها بۆمن بێنە .

باوکی سەعد و سەعیدیش گووتی: زۆر باشە . کە گەڕاوە بۆ گوندی ڕۆژی پاشتر چوو بۆ شوێنی هێلانەکە دیتی هێلکەیەکی تری تێدایە هەڵی گرت و بردی بۆ شار بۆ لای پیاوە جولەکەکە . ئەم جارە دوو هەندە پارەی دایە باوکی سەعد و سەعید . باوکی سەعد و سەعیدیش گەڕایەوە ماڵەوە بە شمەکێکی زۆرەوە کە بەپارەی هێلکەکەی کڕیبووی .

باوکی سەعد و سەعید : شەوێ لەماڵەوە بیری کردەوە گووتی: ئەگەر من ئەم تەیرە بگرم گەلەك باشترە لەئیشکردن بە درێژایی ژیانم دەحەسێمەوە .

وە بۆ بەیانی داوی داناوە، تەیرەکەی گرت و بردیە ماڵەوە لەناو قەفەسی داینا . هەرکاتێك هێلکەی بکردایە دەیبردە بازاڕ بۆ لای پیاوە جولەکەکە وە هەندەی تر زیاتر پارەی دەدایێ تا وای لێ هات زۆر دەوڵەمەند بوو .

باوکی سەعد و سەعید: بەبیری هات بچێت بۆ زیارەتی حەج پێش بڕوات بە ژنەکەی خۆی گووت: هەرکاتێ ئەم تەیرە هێلکەی کرد بۆ ئەم پیاوە جولەکەیەی ببەن . شوێنەکەی پێ نیشان بدەن .

باوکی سەعد و سەعید: بۆ حەج ڕۆیی لە ماڵەوە سەعد و سەعید و دایکی مانەوە .

دایکی سەعد و سەعید: هەموو جارێ هێلکەی تەیرەکەی بۆ پیاوە جولەکەکە دەبرد. وە ڕۆژێکیان پیاوە جولەکەکە بانگی دایکی سەعد و سەعیدی کرد گووتی: تۆ بۆ نایەی ئەم تەیرەی بۆ من سەر بڕی چەند بڵێی منیش زێڕت دەدەمێ بۆ خۆت .

دایکی سەعد و سەعیدیش: ڕازی بوو کە تەیرەکە سەر بڕێت و بی کوڵێنێت بۆ پیاو جولەکەکە. بەڵام بە مەرجێ هیچ لە گۆشتەکەی نەخورێت تاوەکو پیاوە جولەکەکە دێ بۆ ماڵیان .

دایکی سەعد و سەعید: هەمووی ئامادە کرد  تاوەکو پیاوە جولەکەکە هات بۆ ماڵیان یەکسەر داوای مەنجەڵە گۆشتەکەی کرد دیتی جەرگەکە و سەرکەکەی تەیرەکە لەناو گۆشتەکە نەبوو .

سەعد و سەعید بە دزی دایکیان جەرگ و سەرکەکەیان خواردبوو .

پیاوە جولەکەکە یەکسەر ڕۆیشت گووتی: ئەمە جەرگ و سەرکی خوراوە من نایخۆم. دایکی سەعد و سەعید زۆر پاڕاوە لە جولەکەکە لەبەر ئەو سەری بڕیوە  باوکی سەعد و سەعید بێتەوە دەیکوژێ، بەڵام بێ سوود بوو وە دایکی سەعد و سەعید بانگی سەعد و سەعیدی کرد گووتی: ئێوە ئەم گۆشتەتان خواردووە؟ سەعد گووتی: من جەرگەکەم خواردووە سەعید گووتی: سەرکەکەم خواردووە . دایکیان زۆریانی لێداو هەتا توانای هەبوو هەڕەشەی کوشتنی لێ کردن . سەعد و سەعیدیش گووتیان: دایکمان ئەوەندەی لێ داین ئەی باوکمان بێتەوە دەبێ چیمان لێ بکا! بۆیە بڕیاریان دا بڕۆن ماڵەوە بەجێ

**بێڵن ڕۆیشتن تا تووشی قەرەباڵغیەك بوون دیتیان پاشای ئەم شارە مردووە . لەم کاتەدا بۆ دانانی پاشای نوێ باز هەڵدەفڕێنن لەبان سەری کێ بنیشێ ئەو دەبێ بە پاشا بازیان هەڵساند فڕی لەبان سەری سەعد نیشت و خەڵکی شار وتیان: ئەمە منداڵەو باز غەڵەتی کردووە. دوو بارە بازیان هەڵفڕاند دیسان لەسەر سەری سەعد نیشت. دیسان خەڵکی شار ڕازی نەبوون ببێت بە پاشا چونکە منداڵ بوو بۆ جاری سێیەم سەعدیان برد بۆ ژوورێك، پاشان بازیان هەڵفڕاند لە پەنجەرە چوو بووە ژوورەوە و لەبان سەری سەعد نیشت . ئینجا خەڵك ڕازی بوون و سەعد بوو بەپاشاو لەبرای جیا بۆوە .**

**سەعد بوو بە پاشای شار و چەند خزمەتکارێکی هەبوو پاشا لە جیاتی سەیارە بە عارەبانە هاتووچۆیان بە پاشا دەکرد ئەم کاتە وە شەوان لەچوار دەوری پاشا کۆ دەبوونەوە هەرکەس باسی شتێکی دەکرد یەکێك باسی چایەخانەیەکی [2] بۆ پاشا کرد ووتی: چایەخانەیەکی زۆر خۆش هەیە دڵمان لێ دەکرێتەوە زۆر پاك و خاوێنە و شتی وا نییە لەم شارە . پاشا ووتی بەیانی با بچین بۆ ئەم چایەخانە .**

**پاشا : چوو بۆ چایەخانە دیتی شتی وا نییە لەم شارە زۆر سەری سوڕما و هەر پێی دەکرا تەماشای بکا لەجوانی ئەم چایەخانە و بانگی شاگردەکەی کرد و گووتی: خەڵکی کوێی ؟**

**شاگرد گووتی: من خەڵکی شارێکی ترم .**

**پاشا گووتی: چۆن هاتی بۆ ئێرە .**

**شاگرد باسی سەربردەی خۆی بۆ گێڕایەوە، و گووتی: دوو برا بووین بە ناوی سەعد و سەعید و باسی دایك و باوکیشی کرد و باسی تەیرەکەشی کرد .**

**پاشا گووتی: کەواتە تۆ برای منی دەبێ بێیت بۆ لای من شەوێ دانیشتن و پێکەوە گووتی: با بچین بۆ لای دایك و باوکمان چەند ساڵە نەماندیوە بزانین چی بەسەر هاتووە .**

**سەعد و سەعید گەڕانەوە ماڵەوە دایك و باوکیان پیر بوونە سەعد و سەعیدیش گەورە بوونە دایك و باوکی نەیانناسینەوە .**

---

[2] لە جیاتی(چایخانە) لە حکایەت زۆرتر باسی قاوەخانە دەکرێ، چونکە قاوە لە چایە کۆنترە .

گووت: ئێوە کەستان نییە وەڵامی دایەوە و گووتی: دوو کوڕم هەبوو بەناوی سەعد و سەعید و پیاوەکەم چوو بوو بۆ حەج ژیانم لەسەر هێلکەی تەیر بوو سەعد و سەعیدیش بەردێکیان لە تەیرەکە داو مرد و منیش زۆرم لێ دان و هەڵاتن لەترسی باوکیان وە باوکیشیان لە حەج هاتەوە و زۆر بۆیان گریا تا چاوی کۆرە بوو . بەڵام دایکیان بە درۆ بۆ باوکی گێڕابۆوە چونکە بەخۆی تەیرەکەی سەر بڕێبوو بۆ پیاوە جولەکەکە . ئەوانیش سەعد و سەعیدیش خۆیان کەشف کرد و گووتیان: تۆ دایکمانی و تۆش باوکمانی دایە تۆ ڕاست ناکەی و دایکیان کوشت و باوکیان برد لەگەڵ خۆیان ئەو شارەی کە ئەوان پاشا بوون تاوەکو مردن خزمەتیان کرد باوکیان لە ناو قەفەس دانابوو لە کۆتاییدا کراشم دڕا هیچم پێ نەبڕا .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: هێلکەو تەیرەکەیە، بە تایبەت. خواردنی سەروجەرگی تەیرەکە، کە دەبنە هۆی بەختیاری بۆ ئەو کەسەی کە دیانخوات.**

# خاتون

**کۆکردنەوە: ئـالا عـــەلی سـالـح**
**گێڕانەوە : هەمین مەحەمەد مەحمود**

هەبوو نەبوو، ئاغایەك هەبوو، هیچ منداڵی نەدەبوو، لەدوایدا کچێکیان بوو ناوی لێنا (خاتون)ووتی: ئەگەر مردم لە شوێنی من دایبنێن، لە دوایدا پاشا مرد کچەکەیان لە شوێنی ئەم دانا، جێگاکەیان زۆر خۆش بوو، ڕۆژێ لە ڕۆژان لەناو باخچە دانیشت بوو دیتی سندووقەك بە ئاودا هات سندوقەکەیان گرتەوە پاشا (قراری)دەرکرد کە وەزیر ئێوارە کۆببنەوە، سندوقەکەیان کردەوە دیتیان کوڕەکی تیٚ دابوو سەر سوڕهێنەر بوو، لێیا پرسیار کرد بۆچی لەناو سندوقی دای؟ لەوەڵامدا گوتی: باوکم پاشای شارەکی بوو زۆر ڕکیان لە باوکم دەبۆوە، بەباوکم نەدەوێران لە منیان دا لەترسی باوکم منیان لەناو ئەم سندوقەیان داناو کچە پاشاش گووتی: خوشك و برا دەژین لە ژیانی ڕۆژانەمان دا، ناوی نا (ئەحمەد)هەموو ڕۆژیٚ بەیانیان زوو دەڕۆیشت هەتاکو خۆرئاوا نەدەهاتەوە، ڕۆژێکیان کچە پاشا لێی پرسی هەموو ڕۆژیٚ بەیانیان تاکو ئێوارە دەڕۆی بۆ کویٚ؟

ـ (ئەحمەد)وتی ئەدی ڕەزی باوکمان کیٚ سەری لیٚ بداو ئاو بدریٚ و چاودێری لیٚ بکە، کچە پاشا پێی باوەڕ نەدەکرد ڕۆژێکیان لەدوای چوو دیتی لەگەڵ کچە گاوانێك دابوو پاش گەڕانەوەی (ئەحمەد)کچە پاشا وتی: من تۆم دیوە لەگەڵ کچی گاوان ئەمجا (ئەحمەد)وتی: من کچە گاوانم خۆش دەویٚ کچە پاشاش چوو بۆ داخوازی ئەم کچەی بۆ خواست ماڵی ئەم گاوانەیان پاك کردەوە و یارمەتییەکی زۆریان دان لە هەموو ڕووێکەوە .

هەموو ڕۆژیٚ بەیانیان زوو کچە ئاغا خواردنی بۆ دەبردن، دەچوو بۆ لایان ڕۆژێك کچە گاوان وتی: (ئەحمەد)ئەوە چییە هەموو بەیانیان ئێمەی بێزار کردووە هەر دێتە لامان؟ من دەیگرم تۆش (8)خەنجەری لێدە (ئەحمەد)وتی:

چەند ساڵە وەکو خوشك و برا واین، منی بەخێو کردووە و تاکو ئێستاش، کچەکە وتی: ئەگەر نا من ڕازی نابم. کچە پاشا هەروەکو ڕۆژان چووە لایان کچە گاوان گرتی: (ئەحمەد)(8)خەنجەری لێدا خستیانە ناو سندوق و وایان زانی مردوە لەم کاتەدا پیاوێك دیتی کە دەیان شاردەوە ئەوی دیتی وتی: ماڵی پاشا زێڕ دەشارنەوە بەشەو دەیهێنمە دەرەوە، شەو داهات (مەحەمەد)چوو سندوقەکەی دەرهێنا و دیتی کچە پاشا لەناو سندوقەکەدا بوو، بردی بۆ ماڵی خۆیان، دەرمانی بۆ کڕی چاکی کردەوە ڕۆژێکیان کچە پاشا وتی: (مەحەمەد)من چاکەی تۆ لەبیر ناکەم من ئیزندە دەچم تۆڵەی خۆم دەکەمەوە. کەواتە منیش لەگەڵ تا دێم. (مەحەمەد)و کچە پاشا کە ناوی (خاتون)بوو کەوتنە ڕێ چوون لە گوندێك مێوان بوون، کە خاتون جلی خۆی گۆڕیەوە بە جلی پیاوان، کە لەم کاتەدا لە ماڵی ئاغا بوون. (خاتوون) وتی: (مەحەمەد)بەیانی بە دزی دەڕۆین، عەبدی ماڵی پاشا گوێی لێ بوو بەیانی پێش (مەحەمەد)هەستا چوو گازی (خاتون)ی کرد ڕۆیشتن لەڕێیدا لەپاش (خاتون)دەڕۆیی، کە(خاتون)هەستی کرد (مەحەمەد)نییە! (خاتون)لاقەکانی بارگینی عەبدی بڕی و هەڵات چوو بۆ گوندێکی تر پرسیاری کرد لە ماڵی موختاری گوندی گووتی: دەبم بە خەدامە، لەم ماڵەدا بووە خەدامە، ڕۆژێکیان ژنی موختار گووتی: دەچم جل و بەرگمان دەشۆم لەسەر کانی ئاگات لە کوڕەکەم بێ .

خەدامەکی دیکەیان هەبوو ناوی (عەبد)بوو، کە هەستی کرد ژنی موختار ڕۆیی گووتییە خاتونی یان مێردم پێ دەکەی یانیش ئەت کوژم؟ (خاتون)یش (عەبد)ی دەرکرد و دەرگای لەسەر قەپات کرد (خاتون)کەوتە خەو (عەبد)یش سەری کوڕی موختاری بڕی و چەقوەکەی لە باڕکی دانا واتە لە باڕکی (خاتون)ی. ژنی موختار کە هاتەوە وتی: خانم کوڕەکەم هەڵ نەستاوە لەخەو، ئەویش وتی نا، لەوەتەی ئەتۆ ڕۆیشتی لەخەو هەڵنەستاوە، ژنی موختار سەیری کوڕەکەی کرد دیتی سەری هەڵدڕاوە (عەبد)گووتی: چەقۆی بە خوێن لە باڕکی کوێ بێ ئەو سەری بڕیە گەڕان چەقۆکە لە باڕکی خاتونی دا بوو .

ژنی موختار وتی هیچ نابیٚ له ماڵی ئیٚمه دابیٚ. دەی برِۆ له ماڵمان (خاتون)رِۆیشت و دیتی (عەبد)ی له دوابوو .

خاتونیش که ئاورِی داوه دیتی (عەبد)لەدوای بوو (خاتون)ماینی (عەبد)ی کوشت و (عبد)بەجیٚ ما (خاتون)له رِیٚی گەیشته چوار عەرەبان که هەر چواریان به شەرِ دەهاتن .

نزیك بۆوه وتی: بۆچی لیٚك دەدەن، عەرەبەکان وتیان: لەبەر تۆ لیٚك دەدەین ئەو دەڵی بۆ من ئەو دەڵیٚ بۆ من (خاتون)یش وتی: بەشەرت میٚردتان پیٚ ئەکەم .

چوو چوار داری هیٚنا له دووری چەقاندی وتی: کویٚ پیٚشان دارم بۆ بهیٚنیٚ میٚرد به ئەم ئەکەم! که ئەوان هەر چواریان بۆ دار غاریان دا (خاتون)هەلاٚت و گەیشته گوندی خۆیان، دیتی باوکی گاوان له شویٚنی وی دانراوه، گاوانیش مردوه له پاشان که (باز)یان هەڵدا بچووبایه سەر شانی هەرکەسیٚ ئەو دەبوو به پاشای گوندەکه .

(خاتون)جلی پیاوانی لەبەر بوو تاریك بوو سیٚ جار (باز)یان هەڵدا دەچووه سەر شانی خۆی دەنیشت .

برِیاری دا که دەبیٚت شورەیەك بۆ ئەم شاره دروست بکەین که یەك دەرگای تیٚدا ببیٚتەوه گووتی: کوپەیەکی ئاوی دانیٚن لەگەڵ پەرداغیٚك که رِسمی خۆی لەسەر دانابوو وتی: هەر کەسیٚ ئەو ئاوەی خوارد سەیری کرد بیگرن رِۆژیٚکیان موختار و ژنەکەی هاتن ئاویان خواردو سەیری ویٚنەی (خاتون)یان کرد یەك سەر گرتیان. چوونه لای پاشا و پاشاش وتی: بیان بەن بۆ شویٚنیٚکی خۆش .

بۆ رِۆژی دوایی (ئەحمەد)هات و ئاوی خوارد دیتی رِسمی (خاتون)ی لەوی درابوو ئەویشیان گرت و بردیان بۆ لای پاشا. پاشاش وتی: ئەوەش ببەن بۆ ژوورەکی خۆش دڵی مەشکیٚنن بۆ دوا رِۆژ چوار عەرەبەکه هاتن به نۆره ئاویان خواردەوه سەیریان کرد هەر چواریان قۆڵ بەست کردن و گرتیان بردیان بۆ لای پاشا. پاشا وتی: بیان بەن بۆ ژوورەکی پیٚیان نەکریٚ دانیشن و هەڵستنەوه .

بۆ ڕۆژی دوایی (عەبد)خەدامەی ماڵی موختار هات ئەویش ئاوی خواردەوە سەیری وێنەکەی کرد گرتیان بردیان بۆ لای پاشا وتی: بیبەن بۆ ژووری چوار عەرەبەکان. ڕۆژێکیان پاشا بە کزی لەلای پەنجەرەکە دانیشت بوو وتیان: پاشا ژنی دەوێ .

باشترە ژنی بۆ بێنین چوون لەشار گەڕان کچەکی جوانیان دیتەوە لێیان مارە کرد .

پاشان بە بوکی وت: منیش هەروەکو تۆ کچم بەس نابێ ئەم نهێنیە لەکن کەس ئاشکرا بکەی .

هەتاکو ڕۆژی خۆم دادێ شەرتبێ لە شوێنی خۆم بتدەم بە کوڕەکی جوان! پاشا قراری دا خەڵك کۆ بکەنەوە پاشا وتی: ئەوانی سجن دەریان بێنن بەرانبەر خەڵکیان ڕاگرن وتی: من پاشای ئەم شارە بووم جلی پیاوەکەی لەبەر کردەوە خۆی بە خەڵکەکە ناساند بۆ یەکەم جار بانگی کچە گاوان و(ئەحمەد)ی کرد وتی: تۆم لەناو سندوق دەرهێناو چاکەم لەگەڵ تۆ کرد، بەلاّم لەگەڵ من خراپ بووی ئەوجا وتی کچە گاوان بکوژن (ئەحمەد)یش بهێلن ئەمجارەیان بانگی (مەحەمەد)ی کرد و وتی: ئەدی تۆ منت هەڵ نەگرت وات زانی ماڵی باوکم زێڕیان شارتەوە منت چاك کردەوە ئێستا منیش ئەو کچەت لێ مارە دەکەم چونکە چاکەی تۆ قەت لەبیر ناکەم .

پاشان بانگی موختارو ژنەکەی کرد و وتی: من چاکەی ئێوە لە بیر ناکەم هەرچەندە کوڕەکەی ئێوە من نەم کوشت بوو (عەبد)کوشت بووی .

ئەمجارەیان بانگی (عەبد)ی کرد و بردیان کردیان بە پرد و چوار عەرەبەکەش لە سەر پشتی (عەبد)قوڕیان دەگواستەوە .

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە، باز هەڵدانە بۆ هەڵبژاردنی پاشا.

# نەگبەت و بێ بەخت

**کۆکردنەوە: ئەنوەر سەعدوڵلا ئەحمەد**

**گێڕانەوە : عوسـمـان ئـەحمـەد قادر**

دەگێڕنەوە کابرایەکی زۆر نەگبەت و بێ بەخت دەبێ، لەهیچ شتێکدا بەختی نییە بۆیە. ڕۆژێك بڕیار ئەدا بچێ بگەڕێ بەدوای خۆیدا و سوئالێ بکا بزانێ بەختی لەکوێ خەوتووە. دەست دەکا بە ڕۆیشتن لەڕێگا توشی شێرێکی گەورە دەبێ ، شێرەکە پرسیاری لێ دەکات کابرا بۆ کوێ دەچی؟ کابراش دەڵێ: بەختم نییە و دەچم بەدوای بەختی خۆمدا دەگەڕێم، شێرەش پێی دەڵێ: توخوا پرسیاری منیش بکە هیچم پێ ناخورێ . لەوێ شێرەکە بە جێ دێڵێ، لەپاش ماوەیەك بەردەوام بوونی لە ڕۆیشتن توشی باغەوانێك دەبێو باغەوانەکە پرسیاری لێ دەکات ئەوە کابرا بۆ کوێ دەچی؟ کابراش دەڵێ: من کابرایەکی بێ بەختم دەچم لەدوای بەختی خۆم دەگەڕێم . باغەوانەکەش پێی دەڵێ: بزانە پرسیارێکی منیش بکە بزانە ئەم باغەی من بەردەوام ئاوی بەسەرەوەیە کەچی هەر وشك دەبێتەوە ، بزانە هۆیەکەی چییە؟ خێرت دەگات. کابرا بەردەوام دەبێ لە ڕۆیشتنی لە کەناری ڕوباری نیل تووشی حوتێکی گەورە دەبێ و پرسیاری لێ دەکات کابرا بۆ کوێ دەچی؟ کابرا دەڵێ: بەختم خەوتووە دەچم بەدوای دا دەگەڕێم حوتەکەش دەڵێ: توخوا ئەگەر لەگەڵ هەر کەسێك قسەت کرد پرسیاری لێ بکەو بڵێ: من بە درێژایی ڕۆژگار لەناو ئەم ئاوەم ئاو دەخۆمەوە بەڵام بەردەوام ناو سکم وشکەو تێر ئاو ناخۆم . بپرسە بزانە هۆیەکەی چییە؟ کابرا بۆ جارێکی تر دەست دەکاتەوە بە ڕۆیشتن بەپێی گێڕانەوەکە دەگاتە لای حەزرەتی (موسا)پێی دەڵێ: حاڵ و مەسەلە ئەوهایە من کابرایەکی بێ بەختم هاتوومە بزانم بەختم بەچی دەکرێتەوە حەزرەتی (موساش)بەپێی گێڕانەوەکە لەگەڵ خودای گەورە گفت و گۆ دەکات و بەکابرای بێ بەخت دەڵێ: تۆ بڕۆ لە ئێستا بەدواوە بەختت دەکرێتەوە سەبارەت بە حوتەکەش پێی بڵێ کە دووڕەك لەناو سکێتی ئەگەر دەری بکات چاك دەبێتەوە ، وە کابرای باغەوانیش لەو پەڕی باغەکەی لە سەرو چاوەی

ئاوەکە لەژێر زەوی سێکوپەڵە لیرەی لێیە ئەگەر دەبی بهێنی ئەوا زەویەکەی و باغەکەی وشك نابێتەوە لەمەولا وە بەشێرەکەش بڵێ کە گۆشتی پیاوێکی بێ عەقڵ بخوا بۆ ئەو دەرمانەو چاك دەبێتەوە. لەپاش گەڕانەوە لەڕێگادا یەکەمجار تووشی حوتەکە دەبێ و حوتەکە دەیخاتە سەر پشتی و لە ئاوەکە دەیپەڕێنێتەوە و کابراش پێی دەڵێ: چارەسەری تۆ ئەوەیە کە دووڕێك لەناو سکتە هەتا دەرنەچێ چاك نابیتەوە . حوتەکەش هەوڵدەدات و پارچە دووڕەکە دەردەکات بە دیاری دەیداتە کابرا دەڵێ ئەمە بۆ تۆ بۆ منداڵەکانت سەرفی بکە. کابرا لە وەڵامدا دەڵێ: من شتی تۆم ناوێ دەڕۆم بەختم کراوەتەوە. لەوێ حوتەکە بەجێ دێڵێت. بۆ دووەم جار تووشی باغەوانەکە دەبێ و باغەوان پرسیاری لێ دەکات ئەرێ کابرا چیت بۆم کردوە؟ کابراش دەڵێ: کابرا کامە سەرو چاوەی ئاوەکەتە سێ کوپە لیرە لەژێری دایە ئەو ئاوەی لەوێوە دێ بۆ ناو باغەکەت بەسەر ئەو سێ کوپە لێرەیە دا دێ هەتا ئەو سێ کوپە لیرە دەرنەکەی باغەکەت هەر وشك دەبێتەوە. کابرای باغەوانیش دەچێتە سەرو چاوەی ئاوەکەو زەویەکە هەڵدەکەنێ سەیر دەکا سێ کوپە لیرەی لەژێرە هەرسێکی هەڵدەگرێ و بە کابرا دەڵێ: برا ئەوە دوو کوپەی بۆ تۆ یەکیشیان بۆ من برۆ بۆ ماڵ و منداڵەکەت بیکەرە مەسروفی ماڵ و حەقی ئەو چاکەیەی تۆ لەگەڵ منت کرد. کابراش دەڵێ: لیرەی تۆم بۆ چییە من دەڕۆم بەختم کراوەتەوە لێ ئەدات و ئەڕوات بۆ سێیەم جار تووشی شێرەکە دەبێ و شێرە لێی دەپرسێ ها کابرا بزانم چیت بۆم کردووە؟ کابراش بەسەر هاتی حوتەکەو باغەوانەکەی بە دوورو درێژی بۆ باس دەکات و دەڵێ: بۆ مەسەلەکەی تۆش وتیان گۆشتی پیاوێکی بێ عەقڵ بخۆی باشترین دەرمانە . شێرەکەش پاش بیر کردنەوە بە کابرا دەڵێ مادام ئەو هەموو لیرەو دووڕە بە قیمەتەیان داوەتە تۆ وەرت نەگرتوە کەواتە لە هەموو دونیادا بگەڕێم لە تۆ پیاوێکی بێ عەقڵ تر نادۆزمەوە بۆیە وا چاکە تۆ بخۆم. بۆیە شێرەکە پەلاماری پیاوەکە ئەدات و دەیخوات و دەیکاتە دەرمانی چارەسەری خۆی .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: قسەکردنی حوت و بینی موساو دواندنی خوداو، چارەسەری نەخۆشی شێر گۆشتی پیاوی بێ عەقڵ .**

# مەرقەد

دەڵێن لە زەمانی زوودا شێخێك هەبوو زۆر بەناو بانگ بوو، خەڵكی زۆر سەردانیان ئەكرد بۆ چەندین مەبەستی جیا جیا وەك نەخۆشی و شێتی و ...هتد ئەم شێخە ناودارە نزیكەی (23 هەتا 30)دەروێشی هەبوو، هەموویان لە مەرقەدێك كۆ دەبوونەوە بە مەبەستی خوا پەرستی ئەو دەروێشانەش بەرە بەرە ناو بانگیان لەناو خەڵكدا بەرز دەبۆوە و باسی بەهێزیان زۆر شوێنی گرتبۆوە ببوە مایەی سەرنجی خەڵكەكە . ڕۆژێكیان یەكێك لە دەروێشەكانی بە شێخ دەڵێ: من لێرە دەڕۆم بەڵكو ژیانێكی تر بدۆزمەوە و كارو كاسبیەك بكەم ماڵ و منداڵەكانمی پێ بەخێو بكەم . شێخەكەش دەڵێ: مادام هەر دەڕۆی ئەم جاشكە شینە لەگەڵ خۆت ببە بۆ خۆت بەڵكو كاسبی پێ دەكەیت، چونكە زۆر لەگەڵمان هیلاك بویتە ، هەر لەو كاتەوە دەروێش بەخۆی و جاشكەكەیەوە ئەو شوێنەی بەجێ دێڵێ . لەپاش ماوەیەكی زۆر و گەڕانی كابرای دەروێش ئەم لا بۆ ئەولا و ئەم دێ و بۆ ئەو دێ كاتێكی زۆری بەسەردا تێدەپەڕێ . ڕۆژێك جاشكە شین دەتۆپێ، كابراش زۆر غەمبار دەبێ بە دیار جاشكەكەیەوە چونكە كارو كاسبی لەسەر ئەو جاشكە بوو بۆیە دەڵێ: مادام تۆ ئەوەندە بەخێر و بەرەكەت بوی بۆ من شەرت بێت بتكەم بە مەرقەد و خۆ منیش دەبم بە شێخ بۆ ئەوەی خەڵكی سەردانت بكەن، خۆ كەس نازانێ! بۆیە هەڵسا قەبرێكی هەڵكەند و دوو كێلی بۆ چەقاند و كردیە مەرقەدێكی گەورە و جوان . ئیتر لەو كاتەوە بوو بە مەرقەد و خەڵكێكی زۆر دەهاتنە سەری پەیتا پەیتا بۆ ئەوەی مرازەكانیان حاسڵ بێت ناو و ناوبانگی ئەو شێخە بە هەموو لایەكی وڵاتدا بڵاو ببۆوە لە هەموو لایەكەوە سەردانیان دەكرد تا وای لێهات مەرقەدی شێخەی پێشوو هیچ ناوی نەماو كەس سەردانی نەدەكرد دەنگ و باسی ناوبانگی ئەو شێخە نوییە گەیشتە شێخە كۆنەكە . بۆیە شێخە كۆنەكە بڕیاری دا بچێتە مەرقەدی شێخی نوێ كە هاتە لای شێخی تازە پاش ئەوەی ماوەیەكی زۆر لەلای مایەوە دەیبینی كە خەڵكێكی زۆر دێنە خزمەتی مەرقەد و سەردانی دەكەن بۆ مەبەستی چارەسەر كردنی چەندین نەخۆشی و نەزۆكی

و ... هتد لەپاش ئەم سەیر کردنەی شێخی کۆن بە شێخی تازەی گووت باشە پێم ناڵێی ئەم مەرقەدە هی چ شێخێکە؟ بۆیە لەوەڵامدا دەستی کرد بە پێکەنین وتی: ئەمە قەبری ئەو جاشکە شینەیە کە تۆ داتە من بۆ ئەوەی کاسبی پێ بکەم . لەبەر ئەوەی زۆر بەخێر و بێر بوو بۆم بۆیە ئەو مەرقەدەم بۆ کرد هەر لەو کاتەدا شێخی پێشو زۆر بە سەیری دەستی کرد بە پێکەنینێکی زۆر سەیر بۆیە شێخەکەی تر وتی: بەچی پێدەکەنی ؟ شێخ وتی دەزانی بەچی پێدەکەنم ئەو مەرقەدەی منیش دەروێشی بووم قەبری دایکی ئەو جاشکە شینە بوو کە دامە تۆ بۆ ئەوەی کاسبی پێ بکەی .

***ئەم حەکایەتە باس لە سادەیی عەقڵی عەوام دەکات، دەکرێ رویدابێ .**

# مەلای دێی شیلەخان

شیلەخان یەکێکە لەدێیەکانی کوردستان و سەر بەناحیەی سورداشە دەگێڕنەوە: لەکاتی خۆی لەو دییە مەلایەك هەبووە و ماوەیەکی دوور و درێژ مەلای ئەو دێیە بووە، بەردەوام لە خزمەتی خەڵکی ئەو دێیە چ لەکاتی خۆشی و چ لەکاتی ناخۆشی وەك پرسەو خەم خواردن لەگەڵ خەڵکی دێیەکە بووە بەڵام خەڵکی ئەو دییە بەهیچ شێوەیەك یارمەتییەکی ئەو مەلایەیان نەداوە وەك دانی سەرفترەو زەکات و .... هتد . مەلای دێیەکە ناوی (مەحەمەد)بووە لەپاش ماوەی چوار ساڵ کە هیچیان نەداوەتە ماڵی مەلا بۆیە ڕۆژێ مەلا ژن بە مەلا ئەڵێ : مەلا ئەوەی ناوی خواردن بێ لەماڵمان نەماوە و ئیتر چی بخۆین . بۆیە لە ئەنجامدا بڕیار ئەدەن کە ئەو دێیە بەجێ بهێڵن و بڕۆن بەرەو ناوچەیەکی تر بەبێ گەڕانەوە کە لە دوکان نیشتەجێ دەبێ لەپاش ماوەیەکی دوور و درێژ خەڵکی ئەو دێیە بەبێ مەلا دەمێننەوە ڕۆژێکیان خەڵکی ئەو دییە یەکێکیان لێ دەمرێ کەس نابێ نوێژی لەسەر بکات خەڵکی ناچار دەبن بچن بەدوای مەلاکەی خۆیاندا بۆیە کاتێ ئەچن بۆ لای مەلاکە مەلاکە پێیان دەڵێ ئەوانە با بێن کە خاوەن ژنن چونکە چەند مەرجێکم هەیە بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ ئەو دییە ئەوانیش ئەوەی کە خاوەن ژنن لە دەوری مەلا کۆ دەبنەوە مەلا پێیان دەڵێ: تەواو بوون هەر ئەوەندە خاوەن ژنن ؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ. دەڵێ: دەباشە گوێ بگرن دەبێ یەك یەك تەڵاق بخۆن کە من چیم کرد ئێوەش ئەوها بکەن ئەوانیش بە قسەکانی مەلا ڕازین بۆیە دەکەونە ڕێ بۆ دێی (شیلەخان)کاتێ دەچنە ئەوێ مەلا دەست دەکات بە نوێژ کردن کاتێ دەگاتە ڕکاتی دوەم و دەچێتە ڕکوع پشتی بەرز ناکاتەوە هەتا ماوەیەکی درێژ ئیتر خەڵکەکە بێزار دەبێ و پێی دەڵێن: مەلا بۆچی پشتت بەرز ناکەیتەوە . مەلاش دەڵێ بەشەرتێ پشتم بەرز دەکەمەوە دەبێ هەمووتان تەڵاق بخۆن کە سەر فترەو زەکاتی ئەو چوار ساڵەم دەدننێ ئەگەرنا پشتم بەرز ناکەمەوە ئیتر خەڵکەکە دەڵێن: باشە کە دوای تەواو بوونی نوێژەکە زەکات و سەر فترەی چوار ساڵی بۆ کۆ دەکەنەوە و دەیکەنە پارە ئینجا مەلا بۆ نانی ئێوارە دەڵێ:

من دەبمە میوانی ماڵێکی فەقیر دەگەڕیٚ هەتا ماڵێك دەدۆزێتەوە کە ژنێك و پیاوێکن لەپاش نان خواردن مەلا دەڵیٚ: من دەستێك بەئاو دەگەیەنم هەر لەو کاتەدا مەلا بەو شەوە دێیەکە بەجیٚ دەهێڵیٚ و دێتەوە ماڵی خۆیان ژنەکەی دەڵیٚ ها مەلا خێرە بەم شەوە درەنگە؟ مەلاش دەڵیٚ: زەکات و سەرفترەی چوار ساڵم بە دوو ڕکات نوێژی فەرز وەرگرتەوە .

***ئەم حەکایەتە باس لە ژیانی مەلا دەکات لە ڕۆژگارێکی زوو، ڕوودانی دوورنییە!.**

# سێ برا

وا باس دەکەن کاتی خۆی کابرایەك هەبووە، لەناوچەیەك تەنیا یەك کچی هەبووە و بەس! بەلآم ئەم کابرایە سێ برازای هەبووە ، واتە ئامۆزای کچەکە بوونە ڕۆژێك دێت و دەڕوات جارێکیان هەر سێکیان وا ڕێك دەکەوێ بەیەکەوە داوای کچی مامەکەیان دەکەن . مامەکەش هەر چەند سەردێنێ و سەر دەبا نازانێ چی بکات لەدواییدا بیری بۆ دێ و دەڵێ :باشە من کچەکەتان دەدەمێ بەلآم بە مەرجێ کێ لەئێوە (100)دیناری هەیە دەیدەم بەو کەسە . بەلآم کەس لە کوڕەکان (100) دیناری نییە . بۆیە مامەکەیان پێیان دەڵێ: دەباشە کێ لە ئێوە لە (100)دیناری پەیدا کرد ئەوە من کچەکەم دەکەم بەو کەسە. بۆیە هەرسێ براکە بۆ سبەینێ دەکەونە ڕێ بەیەکەوە بۆ ئەوەی بچن پارە پەیدا بکەن . لەپاش ڕۆیشتنێکی زۆر دەگەنە شارێك برا گەورەکە دەڵێ : براکانم ئیتر لێرە بەدواوە هەر سێکمان لەیەکتر جیا دەبینەوە هەر کاتێك یەکێ (100)دینارمان پەیدا کرد لەم شارە چاوەڕێی یەکتر دەکەین . ئیتر لەوێ بە دواوە هەر سێ برا لەیەکتر جیا دەبنەوە و هەر یەکە ڕوو لەشارێك دەکەن ، لەپاش ماوەیەکی دورو درێژ ، براکانی هەریەکەو (100)دینار ئیش دەکەن و دەگەڕێنەوە . لەو شارەدا یەکتر دەبیننەوە کە لەیەکتر جیا بونەوە لەدوای ئیسراحەت کردن ، برا گەورەکە دەڵێ : بزانم یەکێ چەن ئیشتان کردوە ؟ هەردوو براکەش بە نۆرە دەڵێن: یەکێ (100)دینار ئیشمان کردوە برا گەورەکەش دەڵێ : وەڵا منیش (100)دینار ئیشم کردوە ، برا گەورەکە دەڵێ : مادام وایە دەبێ بچین ئیشی زیاتر بکەین بۆ ئەوەی پارەی کاممان زیاتر بوو مامەم کچەکە بدات بە ئەومان . دەڵێ: ن باشە، ئەمجارەیان پێکەوە دەڕۆن لە ڕێگا تووشی کابرایەك دەبن (بەرماڵێکی)پێیە دەیفرۆشێ . لێی دەپرسن کابرا ئەم بەرماڵە بای چەندە کابراش دەڵێ بە (100) دینارە ئەوانیش دەڵێن: چۆن بە ئەوەندەیە ئەمە زۆر گرانە؟! کابراش دەڵێ: کاکە ئەم بەرماڵە وەکو بەرماڵی تر نییە ئەمە لەکوێ هیلاك بووی یەکسەر بچۆ سەر بەرماڵەکە کوێت دەوێ

دەتباتە ئەو شوێنە ئیتر بەرماڵەکەی لێ دەکڕن . کەمێکی تر دەڕۆن دەگەنە پیاوێکی تر (ئاوێنەیەکی) پێیە دەیفرۆشێ دەڵێن: کابرا ئەم ئاوێنەیە بای چەندە؟ ئەویش دەڵێ کاکە بای (100) دینارە براکانیش دەڵێن: کاکە ئەمە زۆر گرانە . کابراش دەڵێ: کاکەگیان ئەم ئاوێنەیە هەر شوێنێکت بوێت دەتوانی لەناویدا ببینی ئەویشی لێ دەکڕن پاش تۆزێکی تر دەڕۆن تووشی کابرایەك دەبن کە (میرویەکی)شینی لەلایە دەیفرۆشێ دەڵێن: کابرا ئەم میرویە بە چەندە؟ کابراش دەڵێ بای (100) دینارە ئەوانیش دەڵێن: وەڵا زۆر گرانە کابرا دەڵێت: کاکە ئەم میرویە ئەگەر هەر کەسێ نەخۆش کەوت خەریك بوو بمرێ لەسەر دڵی دابنێ یەکسەر چا دەبێتەوە ئیتر میرویەکەش لە کابرا دەکڕن و دەڕۆن پاشان یەکێ لە براکان سەیری ئاوێنەکە دەکات کە کچە مامەکەی زۆر نەخۆشە خەریکە بمرێ بۆیە یەکسەر سواری بەرماڵەکە دەبن و دەگەنەوە ماڵ دەچن میرویە شینەکە لەسەر دڵی کچەکە دادەنێن ئیتر کچەکە چاك دەبێتەوە ئینجا مامەی نازانێ بداتە کامیان دەڵێ دەچینە لای مەلا دایە کامتان بۆ ئەوە بێ کە دەچنە ماڵ مەلا ، مەلا لەماڵ نییە . دەڵێن لە ماڵی فلان کەسەو کچەکەیان نەخۆشەو لە قسە کەوتوە کە دەچنە لای مەلا قسەکەی لە یەکەمەوە بۆ باس دەکەن مەسەلەی ئاوێنەو بەرماڵ و میروی شین ، مەلا دەڵێ : وەڵاهی نازانم بەبەر کامتان دەکەوێ ئەگەر ئاوێنەکە نەبوایە کەستان نەتاندەزانی کە نەخۆشە ئەگەر بەرماڵەکە نەبوایە ئەوها خێرا نەئەگەیشتنە لای کچەکە ئەگەر میرویەکە نەبوایە کچەکە وا بەئاسانی چاك نەدەبۆوە و بۆیە هیچی لێ نازانم لەو کاتەدا ئەو کچەی کەوا زمانی شکاوە یەکسەر دێتە قسەو دەڵێ: هەمووتان درۆ ئەکەن حەقی وایە بدرێتە خاوەن میرویەکە چونکە ئەگەر ئەو نەبوایە چاك نەدەبۆوە بۆیە کچەکە دەدەنە خاوەن میرویەکە .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: بە زمانی فڕین و ئاوێنەی جیهان بین و مێروی شفای دەردان.**

# کێ منی کرد بە پاشا

**کۆکردنەوە: ئـــەیـــــام ئـــەحـــمـــەد**

**گێڕانەوەی:حیکایەتی یەکەم رەبیع هەزال**

پاشایەك هەبوو، زۆر زۆردار و زاڵم بوو، هەر کاتێك شتێکی ویستبایە ئەوا ڕاپرسیەکی کارتۆنی دادەهێنا و لەچەند کەسێك تێپەڕی نەدەکرد سەیر لەمە بوو هەر بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی چەندین کەسی زانا و لێهاتوی سەر دەبڕی بێ ئەوەی هیچ حیسابێك بۆ دەورو بەری بکات .

هەر کارێکی پاشا بیکردایە، هیچ بەرگریەك لەلایەن میللەتەوە بەدی نەدەکرا، بەبێ دەنگی و بەبێ جوڵە فەرمانەکانی پاشا دادەبەزیە سەر میللەت و بە ئەنجام دەگەیشت ئەمەش وای لە پاشا کرد بیر لەخۆی و دەسەڵاتەکە بکاتەوە چونکە هیچ نەما بەم خەڵکەی نەکا! دەردو بەڵای دونیای بەسەر دا هێنان کەسێك نەبوو بڵێ بۆ ؟ پاشا هەرچەند سەیری دەورو پشتی خۆی دەکرد لەخۆبایی تر دەبوو وەك تاوس خۆی گیڤ دەکردەوە خۆی بە زلتر دەهاتە پێش چاو وەك بڵێی بە خەیاڵی داهات کێ ئەم دەسەڵاتەی دایە من کێ منی کرد بە پاشا و دەم ڕاست و دەست بەرزی ئەم خەڵکە، دەبێ من هەر لەباب و باپیرانەوە ئەم دەسەڵاتە فراوانەو ئەم میللەتە هەژار و بێ دەنگەم بۆ بە میرات مابێتەوە ؟ یان خودای گەورە منی بە زاتێکی هێندە شەریف و بە توانا و لێهاتوو زانیوە هۆ کارەکانی بۆ من سازاندبێت و جڵەوی دەسەڵات بۆ من کرابێت ؟ ئەمەش وەڵامی لای پاشا نەبوو نەی دەزانی چۆن ئەم وەڵامانەی گێ لێ بێت و لەکێ بیبیستێ ، قەناعەتی بەخۆی هێنا بوو کە نە ڕای یەکەم و نە دووەم تەواو نین هیچیان ئەوەیان نەدەگەیاندۆتە ئەم پلە و پایەیە بۆیە بیری لەمە کردەوە چەند زاناو داناو ڕۆشنفکران[2] و ڕۆشنبیرانی[3] دەڤەری خۆی کۆ کردەوە تا وەڵامی ئەم پرسیارەی دەست کەوێت، کێ منی کرد بە پاشا؟ سەیر

---

[3] کارتۆنی: وشەیەکی نوێیە، گێڕەوەر تێکەلی حەکایەتی کردووە .

[2و3] ڕۆشنفکر و رۆشنبیر: وەك وشەی کارتۆنی سەرەو نوێیە .

لەمەدا بوو زانایان ڕۆشنبیران لە هەموو کۆ بونەوەیەك چەندێکیان لێ سەر دەبڕا لە هیچ خۆڕای لەسەر میزاجی خاوەن شکۆ ئەم هێندە کەسە لەسەر بدرێن یان لە سێدارە بدرێن گرنگ ئەوە بوو ئەم جارەیان ووتیان پاشا خۆش بێت وەڵامە بەڕێزتان دیاری بکەن با ئێمە هەڵبژێرین یان ئەمەیانی ئان ئەوەیان هەتا لەمەشدا واتە لە وەڵامەکەش دا نەدەوێرا ڕای بیری تایبەتی خۆیان بدرکێنن ترسان لەوەی شتێك بڵێن خاوەن شکۆ پێی ناخۆش بێت و بن گومیان بکات لە کۆبونەوەیەکی گەورەی یەکێك لە هۆڵەکانی خاوەن شکۆ هەمویان بەڕێزەوە وەستابون، پاشا زاری موبارەکی لێك ناو فەرمووی یەك پرسیارە و هیچی تر! من دەمەوێ بزانم من چۆن بووم بە پاشا ؟ ئایا باب و باپیرانم ئەم دەسەلاَتەیان بۆ من بەجێ هێشتووە یان خودای گەورە منی هەڵبژاردووە، ئامادە بوان هەر چەندیان دەکرد سەریان سوڕ مابوو چی بڵێن یەکەمیان بڵێن نازانن کاردانەوەی لەسەرپاشا چی دەبێت دووەمیان بڵێن بەڵگەیان نییە کە پاشای پێ دەمکوت بکەن و بیبڕنەوە کەس نەوێرا دەم بکاتەوە ناچار پاشا خۆی چەند کەسێکی هەڵبژاردوو ئەم پرسیارەی ئاراستە کردن کێ منی کردووە بە پاشا لەباب و باپیرانەوە بۆم ماوەتەوە ؟ یان خودای گەورە منی بە لێهاتوو زانیوە چاکترینتانم بۆیە منی هەڵبژاردوە بە پاشا و دەم ڕاست؟.

ئەوەی وەڵامی یەکەمی هەڵبژاردو بەسەر شان و باڵی پاشای دا هەڵگوت پاشا فەرمووی لەسەری بدەن !!! ئامادەبوان سەریان لێ شێواو بوو بۆیە یەکسەر وەڵامی دووەمیان بۆ پاشا ئامادە کرد و وتیان: دیارە پاشا مەبەستی وەڵامی دووەمە و خوای گەورە هەڵیبژاردووە بەمە پاشا دڵی خۆش دەبێت پاش ئەوەی لە یەکێکی تری پرسی وەڵامی دووەمی هەڵبژارد پاشا بێ یەك و دوو فەرموی لەسەری بدەن !!! خەڵکەکە بە جارێك شڵەژان و ورتە و پرتە و چیە چیە دەستی پێ کرد. پاشا وتی: بڕۆن بەیانی وەرنەوە بەلاَم پاش بیر کردنەوە ئینجا وەرنەوە. هەر ئەو کاتەی خەڵکەکە پاشایان جێ هێشت دەنگ و باس بلاَوبویەوە کە پاشا توڕەیەو خەڵکی سەر دەبڕێت چونکە کەس لە زانایان و ڕۆشنبیران وەڵامی ئەم پرسیارەیان نەداوەتەوە، ئەمە بوو بەترسەوە

خەڵکەکە جۆرەها پلانیان دانا سەرەتا دەوروبەری شار بە دزی و بێ دەنگی بە بیانوی جیا جیا دەستیان کرد بە ڕاکردن. یەکێك بە بیانوی سەردانی خزمان لە دەرەوەی شار هەندێك بە بیانوی چوونە سەر زەوی و زارەکانیان و بژار و ئاودان و خزمەت کردنی باخچەکان، لە کۆتایی شار چۆڵ بوو شەو کەسی تیا نەما تەنها دەست و پێوەندی پاشا و خزمەتکارەکانی نەبێت. پاش زانینی پاشا بەم دەنگ و باسە زۆر دڵتەنگ بوو کێ ئەو بە پاشا و سەرکردە دەزانێ ؟ پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر بڕیاری دا بچێتە چیاوچۆڵ بیابان و باخچەکان لەگەڵ خەڵکی لەوێ پاشایەتی بەزۆر بەسەریان بچەسپێنێ و خۆی ڕازی بکات کە هێشتا هەر دەسەلأت دارو سەرکردەیە .

بڕیاری دا دەست و پێوەندی و پاسەوانەکان کە هەوار بگوازنەوە بۆ ناو خەڵك و لەوێ ئەو پرسیارانەیان ئاڕاستە بکەن تا بگاتە ئەنجام چونکە تازە بۆی دەرکەوت بوو بێ خەڵك و بێ جەماوەر و پاڵپشتی میللەت هیچی بۆ نامێنێتەوە پاشا وەڕێ کەوت لەگەڵ دار و دەستەکانی و ئەسپەکانیان و تاژی ڕاوکردن و دەواریان بارکرد لە ڕێگا ڕۆیشتن بۆ ناو چیاو دۆڵ و گردەکان تا خەڵکی بدۆزنەوە پاشایەتی خۆی بسەلمێنێ ئەم پرسیارەیان ئاراستە بکات تا وەلأمێکی دەست بکەوێت خۆی پێ ڕازی بکات لە ڕێگا پاشا فەرمووی: با تۆزێ خۆمان بەڕاو خەریك بکەین تاژیەکان بەربدەن بزانین چیمان بۆ دەهێنن پاش ماوەیەك تاژیەکان کەوتنە دوای کارمامزێك پاش ڕاکەو هات و هاوێکی زۆر تاژیەك بەردێکی پێ کەوت سەرودەم و چاوی شکاو قاچیشی شکا پاسەوانەکان گەیشتنە سەری خەریك بوو دەمرد ، لەناکاو دەنگێك هات لەسەر بەردێك هاواری کرد (ئەگەر تاژیەکەتان ماوە پێی بڵێن: قەت ناگاتە نێچیرەکەی چونکە مامز بۆ ئەم سەگە ئاژەڵە و نازانێ لەگەڵ سەگەکانی تر هێرش بکاتە سەر سەگی فەقیر و هەژار و برسی !!!)پاسەوانەکان ترسان و تاژیەکەیان بە برینداری هەڵگرت و گەڕانەوە لای پاشا و سەر بردەکەیان بۆ گێڕایەوە پاشا زۆر سەری شێواو هەستی بە شتێك کرد خەریك بوو تێ دەگەیشت، دوو خاڵ سەرنجی پاشایان ڕاکێشا یەکەم (قسەی شوانەکە ووتی: بە تاژیەکە بڵێن: ناگاتە مامزەکە .... دووەم وتی: ئەم سەگە لەئێوە بە وەفاترە لەگەڵ هەژار

.....)پاشا فەرمووی با بچینە لای ئەم زاتە و بزانین چییە و کێیە؟ پاسەوانەکان سەریان سوڕما چۆن پاشا وا بە ئاسانی قەناعەتی هات بچێتە لای شوانەکە و فەرمانی کوشتنی دەرنەکرد و نەرم و نیانی نواند. بۆ خۆی بۆ ڕزگارکردنی ژیانی خۆی ڕادەکا، بەلاّم ئەم تاژیە بۆ خاوەنەکەی ڕادەکات . ئەم دەنگە پاسەوانەکانی بۆ خۆی ڕاکێشا و ڕایان کرد خاوەن دەنگەکە شوانێك بوو لەگەڵ مەڕەکانی ئەم کارەی کردبوو، پاسەوانەکان کردیانە هەراو هات و هاوار وتیان: نازانی ئەمە تاژی پاشایە ؟ وتی: با بەڵێ دەزانم تاژی پاشایە بۆیە لێم داوە، وتیان: با بچین بۆ لای پاشا شوان ووتی: ئەو ئیشی بە منە زۆر سەیرن با بێتە لای من من نایەم بۆ لای پاشا پاسەوانەکان زۆر توڕە بون ویستیان بە زۆر بیبەن. بەلاّم، سەگی پاسەوانی مەڕەکان و شوان زۆر مەردانە هاتنە پێش هەڕەشەی لە پاسەوانەکانی پاشا کرد سەریان سوڕما لەم بەرگری کردنە ، شوانە وتی: ئەمە زۆر لە ئێوە بەوەفاترە بۆ پاشاتان بەلاّم پاسەوانەکان ئاگایان لە مێشکی پاشا نییە چۆن خەریکی لێکدانەوەی قسەکانی شوانە و بیریان لێ دەکاتەوە هەڵیان دەسەنگێنێ .

پاشاو پاسەوانەکان جڵەوی کاروانیان شل کردو کەوتنە ڕێ تا بچنە لای شوانەکە، شوانەکەش لەسەر بەردەکە دانیشتبوو بەرامبەر بە مەڕەکانی خۆشی تێك نەدابوو، بەلاّم، دەنگ و باسی شار و پرسیارەکانی بەتەواوی دەزانی و خۆی بۆ پرسیارەکەشی ئامادە کردبوو، کاتێك گەیشتنە لای شوان و پاشا خۆی گیڤ کردەو هاواری کرد تۆ چۆن بەرد دەگریە تاژی من و چۆن نایەی داوای لێبوردن بکەیت ... تا دوایی زۆری لە شوان توند کرد .

شوانە زۆر لەسەرخۆ وەلاّمی دایەوە وتی:. تۆ لێرە هیچت لەمن و لە پاسەوانەکان زیاتر نییە تۆ پاشای کێی؟ کێ لێرەیە تا پاشایەتی بەسەردا بکەی؟ تاژی تاژی تۆیە ڕاستە بەلاّم خۆ نابێ ئەویش وەك تۆ زۆرداری لە مامزی ئەم چیاو چۆڵە بکات ، پاشا زانی شوانەکە زۆر زمانی درێژە و خەریکە لەبەر چاوی پاسەوانەکان پاشا سفر دەکا زوو پاشا چاڵەکەی بۆ شوانەکە ئامادە کردو وتی: پرسیارێکت لێ دەکەم ئەگەر زانیت دەت کەم بە وەزیری خۆم وە هەموو پرس و ڕایەك لەتۆ زیاتر بەکەس ناکەم و لە ئامۆژگاریەکانت

دەرناچم بەڵام ئەگەر نەتزانی تۆڵەی تاژیەکەت لێ دەکەوە و لەسەرت دەدەم شوانە چارەی نەما وتی: فەرمو پرسیارەکەت بڵێ!! پاشا وتی:و پرسیارەکانی لە شوانە دووبارە کردەوە ئایا کێ منی کردووە بە پاشا؟ شوانە زوو ڕێگای لەپاشا گرت وتی: پاشای چی و پاشا کێ؟ کێ دەڵێ تۆ پاشای کوا لەم دەشت و چۆڵە پاشا و گەدا هەیە؟ گرنگ ئەوەیە بزانی پاشای بەسەرکێ؟ نەخوای گەورە تۆی کردووە بە پاشا نە باب و باپیرانت ئەم میراتەیان بۆ بەجێ هێشتوی ئێمە، خەڵك میللەت تۆیان کردوە بە پاشا ئێستاش کە خەڵك و میللەت و جەماوەرت نەبێ پاشای خۆت و ئەم شەش حەوت پاسەوانەی تەنها، پاشا تەماشایەکی پاسەوانەکانی کردو موچڕکێکی بەلەش دا هات ماوەی نەما نەیزانی چ وەڵامێکی شوان بداتەوە بە چاوێکی ترسەوە سەیری پاسەوانەکانی دەکرد شوان هاواری کردە سەر پاشا و پاسەوانەکان وتی: ئێوەن پاشا دەگەیننە لای خەڵکی هەڵاتوو تالەویش خەڵکی ببڕن و بکوژن خۆ پاشا هەر پاشای ئێوەیە پاشای کەسی تر نەماوە زۆری بەسەر پاسەوانەکان قیژاند پاشان ڕووی کردە پاشاو وتی: ها کابرا ئێستا زانیت کێ تۆی کرد بە پاشا؟ پاشا وەڵامی نەبوو تەنها ئەوە بڵێ بڕیارم دا تۆ بکەم بە وەزیر و دەم ڕاستی خۆم و لێرەش دەگەڕێمەوە شار واز لەم خەڵکە دەهێنم پاسەوانەکانی بەمە دڵخۆش بوون و شوانەکەش ووتی: وەرە پاشا وەرە هەر تۆ بوی ئەم خەڵکەت دەربەدەر کرد هەر دەبێ تۆش بچیە شوێنیان وبیان گەڕێنیتەوە، بەمە پاشا دڵگران بوو بەڵام وتی: ئەم ئامۆژگاریەت لێ وەر دەگرم وەزیری دەستە ڕاست و پاڵپشتی پاشا چی دەڵێی وا دەکەم لەگەڵ پاسەوانەکان بانگیان ڕاهێشت کە خەڵکەکە بگەڕێنەوە شار پاشا پرسیاری نەماوە شوانەکەش کەوتەهاواری خەڵکەکە و داوای گەڕانەوەی لێ کردن خەڵکەکە بە قسەی شوانەکە گەڕانەوەو شار ئارام بوەوە شوانەکەش بوو بە وەزیر و پاشاش (80٪)گۆڕا و ژیان ئاسایی بۆوە .

*** ئەم حەکایەتە بنەمایەکی فۆلکلۆری هەیە، بەڵام، لە داڕشتنی تازە دەچێ.**

# کوڕە هەڵگیراوەکە

دەگێڕنەوە پیاوێك دەبێت بازرگان دەبیٚ، کە وچاغ کوێر دەبیٚ و دەوڵەمەند دەبیٚ، بۆیە کوڕەکی بۆ خۆی هەڵدەگرێتەوە کوڕەکە گەورە دەبیٚ دەبێت بە کوڕێکی جوان و قۆز ڕۆژێك کوڕەکە کە ولاٚغان ئاو دەدا کچی پاشای ئەم شارە دەیبینیٚ زۆر عەقڵی ئەو کوڕە قۆز و جوانە دەگریٚ، بۆیە یەکەم ڕۆژ لە کۆشکەوە کچی پاشا سێویٚکی بۆ دەهاویٚ بۆ ڕۆژی دواتر لە هەمان شوێن سێوێکی تری بۆ داویٚ، دوایی چەند جارێك ئیتر کچە و کوڕە یەکتر دەبینن و عاشقی یەکتر دەبن کوڕەکە گشت سەربردەی خۆی بۆ کچە پاشا باسی دەکات، کە ئەو هەڵگیراوەتەوەو لە ماڵی ئەو بازرگانە بەخێو کراوە ، لەدوایی کچی پاشا داوا لە کوڕەکە کە ناوی (سەلیم)بوو دەکات دەڵێت: دەبێت بێن بۆ داخوازی من بۆ لای باوکم لە کۆشك کوڕە لەم ناوە توشی ترسان دەبێت کە پاشای شار کچەی خۆی بە ئەو نەدا ، بۆیە کوڕەکە بڕیار دەدات بچێتە داوای ئینجا هەر شتێك ڕوودەدات با ڕوو بدات ، سەلیم باوکی کە بازرگانی ئەم شارە بوو ئاگادارکردەوە ئەوانیش چون بۆ داوای بۆ کۆشك چون کە مەلاو ڕدێن سپی دەبەن لەگەڵ خۆیان لەم شەوەدا کە پاشا نازانیٚ ئەمە کوڕی حەقیقی بازرگانەکە نیە مارەی دەکەن بۆ بەیانی لەناو خەڵك کە بلاٚوبوویەوە کە پاشا کچی خۆی داوەتە کوڕی بازرگانە هەڵگیراوەکە تا ئەم قسەیە دەگاتە لای پاشا ، پاشا زۆر توڕە دەبیٚ ئەم قسەیە دەگاتە لای کچی پاشاش بەلاٚم کچی پاشا دەڵێتە باوکی کەوا ئەو زانیویەتی کە کوڕی خەقیقی بازرگانەکە نەبوە دەڵێن: من ڕازیم مێرد بەم کوڕە بکەم پاشا زۆر توڕە دەبیٚ دەڵێن: مادام تۆ لەمن نی دەچێتە دەرەوە لەگەڵ سەلیم لە کۆشك دوور کەدەوێتەوە. بۆ سبەینیٚ کچی پاشا لیرەیەکی دەداتە سەلیم بۆ ئەوەی کەل و پەلی ناو ماڵ لە بازاڕیٚ بکڕیٚ و کوڕەم لە بازاڕ توشی پیاوێك دێت کە بانگ دەکا دەڵێت: قسیەکم هەیە بە دوو لیرانە، بەلاٚم ئەوەی دەیکڕی بە لیرەکی دەدەم کوڕەکەش ڕازی دەبیٚ کە ئەم قسەیە بکڕیٚ قسەکەش ئەوەیە کە دەڵیٚ: (قسەی دڵی خۆت لۆ کەس باس مەکە)بۆ ڕۆژی دوایی کوڕە دەچێتە بازاڕ و دیسان توشی کابرا دەبی دەڵێت:

قسەیەکم هەیە بە سێ لیرانە بەڵام ئەوەی دەیکڕێ بە دوو لیرانی دەدەم ئەویش ڕازی دەبێ دەیکڕێ قسەکەش ئەوەیە (لە ئیشان سەبر بگرە) .
ڕۆژان هات و ڕۆیی کوڕەکە لەگەڵ باوکی دەچن بۆ بازرگانی بۆ بازرگانی کە بازرگانی ئەو کات لەگەڵ ئەمریکا بوو چەند ساڵانێکیان پێ دەچوو تا دەهاتنەوە بۆ شار کچی پاشا لەم کاتەدا سکی دەبێ بە جارەکی دوو کوڕی دەبێ .

لەکاتی بازرگانی دا قافلەکەیان توشی سحرا دەبێ قافلە و قەتارەکەیان لەسەر بیرێك دەگیرسێنەوە هەندەی دەولکیان دەهاویشتە ناو بیرەکە بۆ ئاودانی وڵاغەکان ئاو نەبوو کابرای بازرگان وتی: کێ بێ بچێتە ناو ئەم بیرە ئاو هەڵێنجێ ئەوا خەڵاتێکی باشی دەکەم کەس نەوێرا بچێتە ناو بیرەکە ناچار (سەلیم)بچێتە ناو بیرەکە چونکە ووڵاغەکان لە تێنان دەخنکان ، ئینجا سەلیم هەڵسا کندرێکیان لە قەدی خست شۆڕی کردەوە ناو بیرەکە سەلیم بینی دێوێك دانیشتبوو لە بن بیرەکە کە نەیدەهێشت ئاو بچێتە سەرەوە دێوەکە وتی: ئەوە چۆن هاتووی ئەویش ووتی: لەبەر قافڵەو قەتارەکان ئەویش وتی: ئاوی خۆت هەڵێنجەو بەڵام لای کەس باسی نەکەی ئەویش پەیمانی پێ دەدات کە لای کەس باسی نەکات هەتا قافڵەکەیان تێر ئاویان خواردەوە لە دوایی دا دێوەکە دوو دوڕی یاقووتی: لە ناو کیسەیەك دا بە (سەلیم) سەلیم سەرکەوتوو چووە دەرەوەی بیرەکە ، ئینجا سەلیم لەسەر پارەکەی خۆی کیسەکەی کردەوە یەکسەر شەوقی دوڕەکان دایە ئەم ناوە ئەویش یەکسەر قسەکەی کابرای بیرکەوتەوە ووتی: قسەی دڵی خۆت لای کەس باس نەکەی ئەویش باسی نەکردو بردیەوە لایەکی تر ، جا سەلیم ئەو دوو پارچە دوڕەو لەگەڵ ئەو دیاریەی کە لەباوکی وەرگرتبوو بە کابرایەکی نارد بۆ خێزانەکەی کە کچی پاشا بوو کچی پاشاش بەم پارانە کۆشك و تەلارێکی جوانی دروست کرد کە هاوشێوەی ماڵی کۆشکی پاشا بوو، کە ژیانێکی بەختەوەر لەگەڵ دوو کوڕەکەی بەسەر بردو ، ئینجا قافڵەکە گەڕایەوە شار سەلیم یەکەم جار چوە خانوە بچکۆڵەکەی خۆی، بەڵام خانوەکەی ببوە کەلاوە و ئەویش ووتی: ئەی ماڵی سەلیم چوون بۆ کوێندەرێ ئەوانیش دەڵێن ئەو کۆشکە هەوە کە سەلیم

---

[4] ئەمریکا: ناوێکی نوێیە، بە حەکایەت، زۆرتر مەغریب زەمین و هیند و چین باس دەکرێ .

چوه ناو کۆشکەکە بینی ژنەکەی لەگەڵ دوو کوڕان نوستوە ئەویش لە دڵی خۆی دا وتی: ویستی دەست بهاوێ بەڵام ئەو قسەی بیر کەوتەوە کە کڕیبوی کە (لە ئیشان سەبر بگرە)یەکسەر کوڕەکە بانگی کرد (دایە)ژنەکەش لەم کاتە بەخەبەر هات چاوی بە سەلیم کەوت یەکسەر هەڵسایەوە و زۆر دڵی خۆش بوو وتی: ئەوانەش هەردوەك کوڕی خۆتن بەیەك شادبون و سەلیم بۆ پاشا چەند دیاری بە نرخی بۆ هێنابوون لەگەڵ کچی پاشا چون بۆ کۆشك وە پاشا زۆر دڵخۆش بوو پێیان بەیەکتر شاد بوونەوە .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: دێوی نیو بیرەکەیە کە دوو دوڕ دەداتە سەلیم .**

# سیٚ دزەکە

**کۆکردنەوە: ئەیام ئەحمەد مەحەمەد**

**گێڕانەوە : ئامینە حەسەن ئابو بەکر**

دەگێڕنەوە: لە شاری غەزنە هەر دزی دەکرا (سوڵتان مەحمود کە سوڵتانی ئەم شارە بوو گوتی: ئەم دزیانە بۆچی دەکرێت؟) جا سوڵتانیش بە شەوان جل و بەرگی خۆی دەگۆڕی دەچووە ناو شار بۆ ئەوەی ئاگاداری کاروباری خەڵك بیٚ، شەویٚ لەشەوان جل و بەرگی خۆی گۆڕی چوە ناو شار گەڕا دیتی ئاگرێك لە دووری شاری دیار بوو، گوتی: با بچمە کن ئەو ئاگرە. دیتی سیٚ پیاو دانیشتبون پاڵیان بە کێلەکان دابوو، سوڵتان مەحمود هەستی ڕاگرت گوتی: بزانم ئەم سیٚ پیاوە چین؟ ، سیٚ پیاوەکە دیار بوو باسی دزیان دەکرد ، جا سوڵتانیش چووە لایان وگوتی: ئەمنیش وەك ئێوە دزم لە پیاوی وەك ئێوە دەگەڕێم دەبمە ڕەفیقی ئێوە، ئینجا کۆ بونەوەیەکیان کرد یەکیٚ لە دزەکان گوتی: کە سەگ بحەپیٚ دەزانم چ دەڵیٚ! جا لەم کاتە سەگێك حەپی گوتیان: ئەم سەگە چ دەڵیٚ؟ گوتی: دەڵیٚ سوڵتان مەحمودتان لەگەڵە ، سوڵتانیش گوتی ڕاست دەکات من لە منداڵیەوە پێم دەڵێن: سوڵتان مەحمود . دزی دوەمیان من کەسێك بەشەو ببینم ئەگەر تاریکیش بیٚ بەڕۆژ دەیناسمەوە، ئەوی تریان کە دزی سێیەم بوو گوتی: من ئەگەر بچمە هەر ماڵێك ئەگەر هەر شتێك بخۆم ئەوا دزی لەم ماڵەدا ناکەم واتە نمەك بە حەرامی ناکەم ، سوڵتانیش گوتی: من ئەگەر لاقم لەسەر لاقم دانا دەستەکی لەبن پێم بدەم ئەوا ئەو کاتە کەسێك ڕزگار دەکەم ئەگەر لەکاتی لە سێدارەدانیش بێت ، هەر ئەو شەوە هەرچواریان واتە دزەکان چونە ماڵی سوڵتان بۆ دزینی خەزنەی سوڵتان ، دزی سێیەمیان لەماڵی سوڵتان قلە خوێیەکی هاویشتە دەمی گوتی: من نمەکی ئەو ماڵەم کردیە نایەڵم ئەم ماڵە بدزن ، دزەکانی تر گوتیان: مادام نمەکی ئەم ماڵەت کردیە دزی لیٚ ناکەین ئینجا ڕۆیشتن سوڵتان گوتی: بۆ سبەینیٚ لەکوێتان ببینمەوە ، ئەوانیش وتیان خانوەك لە دوری شاریە ئێمە لەویٚ دەژین ، بۆ بەیانی کە خەزێنەی ماڵی سوڵتان شکێندرابوو یەکەم کەس

که هاتبووه کۆشکی سوڵتان وەزیری سوڵتان بوو که بینی خەزێنەی سوڵتان شکاوه به نهێنی لچکه کەوێی پڕ کردو دزی ، هەروەها قازی و پیاوه گەورەکانی سوڵتان هێندێکی تریان لێ دزی ، که سوڵتان مەحمود خۆی ئاگاداری ئەم هەموو کارانەیه ئینجا لەناو کۆشك بووه هەرا گوتیان: که خەزێنەی سوڵتان دزراوه. سوڵتانیش بێ ئەوەی خۆی تێك بدات لەسەر کورسی دانیشت که زانی کێ لەدارو دەستەکانی کێ لەگەڵی ڕاسته کێ خیانەتی لەگەڵ دەکات ، ئینجا سوڵتان وەزیرو قازی پیاوه گەورەکان و خەڵکی شارەکه کۆ کردەوه سوڵتان بڕیاری دا سەر بازەکان که سێ پیاو هەنه له دەرەوەی شار دەژین، سێ دزن. دزیان له خەزێنەی من کردوه سێ دزەکەیان هێنا، جا سێ دزەکه له نێوان خۆیان کەوتنه گفت و گۆ دزی دوەمیان گوتی: ئەو سوڵتانه ئەو پیاوەیه که ئەم شەو لەگەڵمان هات بۆ دزینی خەزێنەی سوڵتان خۆ سوڵتان بو ، دزی یەکەمیان گوتی: ئەدی سەگەکه نەحەپی گوتی: سوڵتان مەحمودتان لەگەڵه دزی سێیەمیان گوتی: ئێمه دزیمان لەماڵی سوڵتان نەکردوه چونکه نمەك به حەرامی ناکەم ، جا لەم کاتەدا که دادگای ئەم سێ دزه دەکرا بۆ لەسێدارەدانیان، سوڵتان مەحمود لاقی لەسەر لاقی داناو دەستێکی لەبن پێی خۆی دا، هەر سێ دزەکەی ڕزگار کردو لەجیاتی ئەوان قازی و وەزیرو پیاوه گەورەکانی که خیانەتیان لەگەڵ کردبو له سێداره دان .

*حەکایەتێکی پەند ئامێزەو یەکێکه له حەکایەته زۆرەکانی سولتان مەحمود.

# کیسەڵ

**کۆکردنەوە : بەیان عەبدولڕەحمان قادر**
**گێڕانــەوە: خــەدیجــە عــــــەلی**

**پیرە مێردەك هەبوو ژنەکەی سکی هەبوو فەرخە کیسەڵەکی بوو کاتەك کە مێردەکەی هاتەوە ماریَ گۆتی: وەرە کورە عاجباتیەکمان بووە گۆتی: وەرە با بیکوژین، هەندیان لێ دا بە دیواریان دادا هیچ نەدەمرد، قیت دەبۆوە، گۆتیان با بیخەینە ڕوبارێ، ڕۆیشتن هێخستیانە ڕوبارێ، وەکی هاتنەوە دیتیان لە پێشەوان لە مارێیە وا لە بنە بانێ دانیشتییە، دیسان هەندیان لێ دا پانیا کردەوە، قیت دەبۆوە کیسەر گۆتی: دایە باوە لۆ لێم دەدەن ئەدی ئەمن ئەولادی نگۆ نیمە. ئەوانیش لێیان گەڕا ماوەك لە مارێ بوو" گۆتی: باوە کچی پاشام لۆ بخوازە، باویشی گۆتی وەڵڵا ئەگەر کوڕم سەرم بڕم ئەو داوایەی ئەتو دەیکەی نابی باوی کیسەڵ چوو لە پشت دەرکەی ڕاوەستا هەر تەماشای دەکرد، پاشا گۆتی: ئەوە چی دەوێ بڵێن بابێتە ژۆرێ. پیرە مێرد گۆتی: گەورەم چت لێ بشارمەوە حار و مەسەلە ئەوهایە، کوڕەکم هەیە کیسەرە و داوای کچی تو دەکا پاشا چم لێ دەکەی سەرم بڕە پاشا گۆتی: سەری بڕن. وەزیری دەستە ڕاست گۆتی: گەورەم با نەیکوژین دوایی دەرێن لۆ دەرۆزەی چویتە دەرکەی سەریان بڕیە، بارەکی گرانی لەسەر دانێ ئەگەر پێی جێ بەجێ نەکرا ئەوا لەسەری دەدەین ، گۆتیان: سبەینێ قەسرەکمان دەوێ لە زێڕ و زیوی پڕی دار و بار بێ هەر داری تەعامەك بی هەر دارە و تەیرەکی لەسەر بی، ئەوجا کچی پاشاتان دەدەینێ پیرە مێرد چۆوە مارێ بە کیسەری گۆت: پاشا ئەو داوایەی هەیە. گۆتی: ئەوە سانایە. بۆ بەیانی زوو کیسەر قەسرەکەی حازر کرد و کە پاشا چاوی پێکەوت واقی وڕما، گۆتی: چ قسەم نەما ، بوکیان ڕازاندەوە و لۆ کیسەریان برد .**

دوای ئەوەی فاتمەی کچی پاشایان دا کیسەر، کچە پاشا پلکەکی هەبوو هەموو ڕۆژێ دەهات سەری لێ دەدا هەر دەیگۆ ها چ بو فاتمەش دەیگۆ ما چ پەیابێ لە کیسەرێ ڕۆژەك دەنگەك هات لە دەرێ، دوو سواربون لە دورەوە هاتن هاتنە بەر دەرکەی ماری کیسەری گۆتیان: شازادە ئەحمەد وەرە دەرێ کیسەریش بە لەقە لەق چۆ دەرێ، لەناو قەپێلکی خۆی هاتە دەر، کوڕە گەنجەکی هەند جوان بوو هەند جوان بوو دوو سوارەکە چون لە ڕوبارێ شوشتیان و جلی جوانیان لەبەر کرد و (فاتمەش)چاوی لەو هەمو شتە بوو ئەوجا دیتی چووە ناو قەپێلکی خۆی و دوو سوارەکەش ڕۆیشتن. کیسەر هاتەوە مارێ فاتمەش گۆتی: با سەلامی لێ بکەم سێ جار لە دری خۆی سەلامی لێ کرد و جاری سێیەم کیسەر جوابی داوە گۆتی: لێم گەڕێ با بەکەیفی خۆم بێمە دەرێ دوایی بۆ من نابی، دەزانی کو دێمە دەرێ دەبی، قەپێلکی من نە سەرمای بی نە گەرمای بی، نە مێروی لێ بدا نە مێشی لێ هەر نیشی، فاتمەش چی پێ گۆ وەی لێ کرد. شازادە ئەحمەد لە قەپێلکی هاتەدەر. فاتمەش لە خۆشیا دەرکەی پێوە نەدا هەن کەیفی خۆش بوو هەتا خوا دەرێ بەسە، پلکی لێی وەژۆرێ کەت دیتی وا فاتمە لەگەر کوڕەکی هەن جوان نوستیە قەپێلکی کیسەریشی لەکن پەنجەرەی بە دارێ وەیە، پلکی فاتمەی پڕی دایە قەپێلکەکەو خستیە ناو تەندورێ ڕاست شازادە ئەحمەد بزر بو، چونکە (جنی پەری بوو)فاتمەش هەندی جون دایە پلکی، گۆتی: ئەمن لەخۆشیان دەرکەم پێوە نەدابوو لۆ وەت کرد! ئەوجا فاتمە چو یەقەی پیرەمێردی گرت، گۆتی: ئەمن چوزانم فاتمە گۆتی وەرە لەگەرم با بگەڕێین گۆتی ئەی چ لە پیرە ژنێ بکەم. هەندەك لیرەیان لۆ پیرە ژنی بەجێ هێشت و ڕۆیشتن، حەفت ساران گەڕان پێراوی ئاسنیان دڕا گۆپاریان شکا، فاتمە هەمو جلکی لەبەر کەون بوو هیلاك بون ئەوجا بە قوربانی بم خدری زیندەیان گەیشتێ، گۆتی: بڕۆ فرانکە جێی ئێستا سێ سواری پێ دا دێ، لۆ خۆت مێردی خۆت بناسەوە فاتمەش دیتی سێ سوارەکە هاتن، چوو جڵەوی ئەسپی پێشەوەی گرت و ڕاست هەری دا، ئەوەندە دور هەری دا بەسێ مانگان لەگە پیرە مێردی ئەوجا یەکدیان دیتەوە، دیسان خدری زیندەیان لێ

پەیدا بوو. گۆتی: سیٚ سوار بێرە دا دێن لۆ خۆت مێردی خۆت بناسەوە دیسان چوو جڵەوی ئەسپی پێشەوەی گرت، دیسان هەری دا لۆ جاری سێیەم چوو جڵەوی ئەسپی یەکەم بگری زگی پیٚ سوتا هەری نەدا، گۆتیە سواری سێیەم گۆتی: وەرە دەستی ژنی خۆت بگرە و بڕۆ دەچن ژنی سونیان مارە دەکەن و دوایش بەجێیا دێڵن ، دەی ژنی خۆت ببە و بڕۆ .

خدری زیندە چییە ؟

دەرێن بە هەمو نەوعیٚ خۆی نیشان دەدات

بە پیری بە جاحێڵی لە وەختی تەنگانەدا

جاران دەهات خۆی نیشان دەدا عالەم بە دین بوو دەیگۆ ئەوها مەکەن ئەوها بکەن بەس ئێستا نایەت .

*** ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: ژنە لە جیاتی منداڵ کیسەڵی دەبی .**

# داوده بیژی

دەرێن ڕۆژەك كابرایەك بەڕێی دا دەڕۆیشت قاشەكی دیت لەسەر ڕیگا كەوتبوو. گۆچانەكەی لۆ درێژ كرد ڕاست قاشەكە بەسەری گۆچانەكەوە دەنوسیٚ دەیهێنێتەوە ماریٚ و دەیداتە خوشكەكەی ، خوشكەكەشی جلكی دەشوا دەست بە كەفە بە دەوی وەری دەگری ئەوجا قاشەكە یەكسەر لە دەوی دەچێتە خواریٚ و قوت دەدریٚ، پاش ماوەكی خوشكی كابرا زگی گەورە دەبێت، براكەی پێی دەریٚ خوشكم ئەتو ئەوەندە بە ناموس و بەحەیا بووی ئێستا ئەمن چیت لیٚ بكەم؟ گۆتی: بەخوا برام ئەو ڕۆژەی ئەتو ئەو قاشەت هێناوە لە دەوم چووە خواریٚ زگم پڕ بووە ئەوجا كوڕەكی دەبی و گەورە دەبی هەمو ڕۆژیٚ داكی كوڕە نانی بۆ براكەی دەبردە سەر جۆتی، كوڕەكەش ناوی داود بو گۆتی بینە دایە ئەمن ئەوڕۆ نانی لۆ خارم دەبەم، گۆتی: كوڕم ئەتو پێنازانی. گۆتی: دایە پیٚ دەزانم ئەتو بینە ئەمن دەبەم، داود چوو نانی لۆ خاری برد و لەویٚ گۆتیە خاری ئێستا قازی بێرە دادیٚ خەون و تەعبیری لەبیر چووە دەیەویٚ كن قازیەكی دی لۆی لێك بداتەوە، ئەمن ڕێی لیٚ دەگرمو تەعبیری خەونەكەی پیٚ دەرێم هەندەك پارەی لیٚ وەردەگرین. خاری گۆتی: وس بە كوڕە ئەتو چوزانی خەونی لێك بدەیەوە. گۆتی: با خارە دەزانم. لەوقسانە دابون قازی بەویٚ دا تێپەڕی و گۆتی: سەلام و علیكم مام جۆتیار ماندی نەبی، دوای ئەوەی سەلامی كرد و ویسی بڕوا داود گۆتی: وەرە ئەو شتەی بەدوی دا دەچی لەبیرت چوە وەرە پێت برێم، گۆتی: ئەتو خەونت دیتیە لە خەونت (وەكی ڕۆژ هەردیٚ وا دەزانی لە ئەستونەكی ناو ماری تو دەدا)قازی گۆتی: وەڵا ڕاست دەكەی خەونەكەم ئەوەیە داود پێی گۆت: بڕۆ ئەستونەكی مارەكەت بڕوخێنە پڕی زێڕ و زیوە قازیش بەگێی كرد و گەڕاوە لەویٚ بە وەزیرەكانی گۆت: مندارەك تەعبیری خەونەكەی بەو جۆرە لۆ لێك دایمەوە ئەوانیش گۆتیان: كو دەبی خانیت. بە قسەی مندارەكی بڕوخێنی ڕاست ناكات بڕۆ با قازی لۆت لێك بداتەوە .

قازی هەستا بە قسەی وەزیرەکان چوو لۆ لای قازیەکی دی کە خەونەکەی بۆ لێکبداتەوە، داود گۆتیە خاری ئێستا قازی بێرە دا دێتەوە، باوەڕ بە قسەی من ناکات دەچی لۆ کن قازیەکی دی خەونەکەی لۆ لێك بداتەوە، قسەی داود ڕاست بو قازی چوە کن قازیخەون و تەعبیر گۆتی: خەونم دیتیە لە خەونم (ڕۆژ هەردیٚ لە ئەستونەکەی ناو ماری من دەدا)گۆتی: ئەوە ئەستونەکی خانی تو پڕی زێڕ و زیوە ئەبیٚ خانی خۆ بڕوخێنی زێڕ و پارەکەش لەگەر دەوڵەتی بەش بکە، گۆتی: وەلاٚ مندارەك خەونەکەی ئەوها لۆ لێك دامەوە باوەڕم پیٚ نەکرد. قازیەکی دیش گۆتی: چ مندارەك ئەو خەونەی لۆ لێك دایەوە گۆتی: بەریٚ، گۆتی: ئەتو ئەو مندارەم لۆ بکرە ئەمن زێڕ و پارەی ناو ماری تۆم ناویٚ. ئەو جارەش داود گۆتیە خاری: خارە ئێستا قازی بێرە دادێتەوە دەیەویٚ ئەمنی پیٚ بفرۆشی بم دەییٚ هەر دەچم، نەشم دەییٚ هەر دەچم ئەوجا قازی هات گۆتی: ئەبیٚ ئەو کوڕەم پیٚ بفرۆشی گۆتی منداری خۆ کو دەفرۆشم، قازیش گۆتی: بینە دەنا شکایەتت لیٚ دەکەم ، داود گۆتی: خارە ئەمن بدەیو نەدەی هەر دەچم قازی یەك تورەگەی گەورە پارەی دابیٚ و بردی، لۆ قازی خەون و تەعبیری لێکبداتەوە قازی خەون و تەعبیرا گۆتیە کچی خۆی ئەو کوڕەم لۆ بکوژەوە و لێی بنیٚ کچەکەش هەتا سەری تاژیەکی بڕی هەندێکی لە گۆشتی تاژی خوارد و هەردوو چاوی کۆرە بوو، گۆتی: ئای کچم چت لە من کرد ئەوجا کچی قازی گۆتیە: داودی ئیزنت دەم دەڕۆی؟ گۆتی: بەریٚ ڕۆیی ڕۆیی ڕۆیی ... هەتا گەیشتە کن ئاشەکی بیٚ پەرژین بوو چوو لەویٚ نوست و سبەینیٚ هەستا گۆتی: ئێرەم پیس کردیە، هەستا هەموی خاوێن کردەوە و ماری و ئاو ڕشێنی کرد کاتەك ئاشەوانەکە هات گۆتی: ئەوە کیٚ ئێرەی لۆم خاوێن کردیتەوە؟ داود گۆتی: ئەمن ئاشەوانەکەش گۆتی ئەبییە کوڕی من؟ گۆتی بەریٚ لەویٚ ماوە هەتا ڕۆژەك پاشا خەونەکی دیت گۆتی کیٚ لۆم لێك دەداتەوە هەندە هەندە پارەی دەدەمیٚ. داودیش چو گۆتی تەعبیری خەونی ئەوەیە پاشاش لە کنە خۆی کردیە وەزیر .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: زگ بوونی کچە بە قاش .**

# کوڕە پاشا

**کۆکردنەوە: پەیمان حەبیب مەجید**

وەك باس ئەکرێ لە زەمان قەدیما پاشایەك بووە، ئەو پاشایە تەنیا یەك کوڕی بووە، کە زۆر خۆشی گەرك بووە ئەو پاشایە یەکێ بووە لە پاشا ناودارەکانی ئەو زەمانە ، دەگێڕنەوە ڕۆژێك کوڕی پاشا بە باوکی ئێژیێ: باوە ژنم بۆ بێنە . ئێستە کاتی ژن هاوردنمە، بەڵام باوکی ڕازی ناوێ و ئیتر لەبەر هەر هۆیەك بێ . پاش ماوەیەك کوڕە لەباوکی توڕە ئەوێ و سەری خۆی هەڵەگرێ و ئەو ناوچەیە جێ ئەهیڵێ و ئەڕوا ، لەپاش ماوەیەك لەشوێنێك جێگیر ئەوێ و بەڵام دوای ئەو شوێنەشی بەجێ ئەهێڵێ لەکاتی چونیا لەڕێگا توشی کاورایەك ئەبێ کە هەر خەریکی خواردنی نانە . لێی ئەپرسێ: کاورا ئەوە چی ئەکەی ئەویش ئێژیێ: وەڵاهی چەنێ نان ئەخۆم هەر برسیمە . بۆ نایەی وەتەك خۆتا بم وەی کوڕی پاشایش لەگەڵ خۆیا ئەیوا . پاش چەند ڕۆژێ هەر خەریکی ڕۆیشتن ئەبن دیسان توشی کاورایەك ئەبن کە بەتەنیا خانیەکی بەرز کردۆتەوە بەلادا خەریکە بیڕوخێنێ . ئیتر ئەویش لەگەڵ خۆیان ئەبەن بەرەو ئەو شوێنەی کەبۆی ئەچن لەپاش ماوەیەك ڕۆیشتن سەیر ئەکەن کۆمەڵێ مێرو لە ئاوێك هاتۆتە سەر ڕێگایان ناتوانن بپەڕنەوە ئەو بەری ئاوەکە . ئیتر کوڕە پاشاکە تیرو کەوانی خۆی لەسەر ئاوەکە دائەنا تا هەمو مێرولەکان لە ئاوەکە ئەپەڕنەوە . لەدوای پەڕینەوەی مێرولەکان سەرۆکی مێرولەکان قسە لەگەڵ کوڕە پاشاکە دەکاو ئێژێ ئەم دوو تەڵە موەت با لەلا بێت هەرکاتێ پێویستت بە ئێمە بوو ئەوە ئەو دوو تەڵە موە گرێ بدە ئێمە یەکسەر دێینە لات .

ئیتر ئەو شوێنە بەجێ ئەهێڵێ لەپاش ماوەیەك ڕۆیشتن دەگەنە ئەو شارەی کە بۆی ئەچن ناوی شاری (چین و ماچینە)ئیتر لەوێ لەیەکتر جیا ئەبنەوە بەڵام پاش ئەوەی یەکتر بەجێ بێڵن ئەو دوو کاورایەی کەلەگەڵی بون بە کوڕی پاشا ئێژن : لەهەر شوێنێ پێویستیت بە ئێمە بوو یەك چەپڵە لێ دەی ئێمە یەکسەر دێینە لات . لەوێ یەکتر جێ ئەهێڵن لەپاشا کوڕە پاشا جلێکی شڕ

ئەکاتە بەری و ئەچیٚ بۆ ئیش کردن وا ڕیٚك ئەکەویٚ ئەچیٚتە لای پاشایەك بۆ ئەوەی ئیش بکات بەلاٚم پاشاکە پیٚی ئیٚژیٚ : من ئیش بەهەر کەسیٚ بکەم هەندیٚ مەرجی بۆ دا ئەنیٚم و ئیٚژیٚ : ئەگەر هاتو توانی ئەوا کچیٚکم هەیە ئەی دەمیٚ دەیکەمە یەکیٚ لەسەر کارەکانی خۆم . کوڕەش ڕازی ئەویٚ .

پاشا لەیەکەم مەرجی دا ئەیکاتە ژوریٚکەوە و شەش لاشەی حەیوانی بۆ دا ئەنیٚ و ئیٚژیٚ : ئەبیٚ هەتا بەیانی هەمووی بخۆی ، بەلاٚم کوڕە هەتا درەنگی شەو یەك کەرتی ئەخوا . بەلاٚم لە پڕیٚکا کاورای برسی بە بیر دیٚتەوە بۆیە یەکسەر چەپلٚەیەك لیٚ ئەدات و کابراش پەیدا ئەبیٚ ، لەو کاتەدا کوڕەکە پیٚی ئیٚژیٚ: ئەو هەموو گۆشتە هەمووی بخۆ ئیتر کاورای برسی هەمووی ئەخوا . بۆ بەیانی هەوالٚ ئەگەیەننە پاشا کە هەموو گۆشتەکەی خواردوە ، بەلاٚم پاشا زۆر توڕە ئەبیٚ . ئەم جارە مەرجیٚکی زۆر گرانتری بۆ دائەنیٚ . پاشا هەلٚئەستیٚ ژووریٚك پڕی ئەکات لە گەنم و جۆو نۆك و گەنمە شامی بەلاٚم چۆن هەمووی تیٚکەلٚ یەکتری ئەکات بە کوڕەکەی ئیٚژیٚ : ئەویٚ هەتا بەیانی ئەم گەنم و جۆ و نۆك و گەنمە شامیانە هەمووی لەیەکتری جیا بکەیتەوە وە هەر یەکەی لە قوژبنیٚك دایبنیٚی بۆ ئەوەی تیٚکەلٚی یەکتر نەبنەوە . بەلاٚم کوڕە هەتا نیوە شەو هەر خەریك ئەبیٚ تەنها یەك تۆزیٚ لیٚ جیا ئەکاتەوە لە یەکتری ، ئیتر زۆر بیٚ ئومیٚد ئەویٚ بەلاٚم یەکسەر میٚرولەکان دەکەویٚتەوە بیری و دەست دەکا بە گیرفانیدا دوو تەلٚە موەکە دەر ئەخات و پاشان گریٚی ئەدات . ئیتر میٚرۆلە وەك دارو بەرد لە هەموو لایەکەوە خۆیان دەکەن بە ژوورەکەدا لە کوڕە ئەپرسن چیت ئەویٚ ؟ کوڕەش ئیٚژیٚ ئەم گەنم و جۆو گەنمە شامیانەم بۆ لەیەکتر جیا بکەنەوە و هەر یەکەی لە شویٚنیٚ دا بنیٚن . ئیتر میٚرولەکان دەست دەکەن بە جیا کردنەوەی دانەویٚلٚەکان لەماوەیەکی کەمدا هەمووی لەیەکتری جیا ئەکەنەوە . ئیتر بەیانی هەوالٚ بە پاشا دەدەن کە کوڕەکە ئیشەکەی کردوە . بەلاٚم پاشا زۆر توڕە ئەبیٚ و بە کوڕەکە ئیٚژیٚ : من لە وەعدەکەی خۆم پەشیمان ئەبمەوە کچت نادەمیٚ . بەلاٚم کوڕەکە یەك چەپلٚە لیٚ ئەدات یەکسەر ئەو کاورایە پەیدا ئەبیٚ کە خانوەکەی بەرز کردبۆوە کاتیٚ خۆی برادەری بوو . ئیتر کاوراکە ئیٚژیٚ : ها بزانم چیت گەرەکە؟ کوڕەش پیٚی ئیٚژیٚ ئەو خانووەم

بۆ هەڵگرەو بیدە بە زەوی دا ئیتر کاوراکە خەریکە خانوی پاشا بەرز ئەکاتەوە بەڵام پاشا زۆر ئەترسیٚ و بڕیار دەدا کە کچەکەی خۆی بداتە کوڕە پاشا . ئیتر کوڕەکە کچە پاشا مارە ئەکات و ئەگەڕێتەوە وڵاتی خۆی . منیش هاتمەوە و هیچیان پیٚ نەدام .

خۆشی گەرەك : خۆشی ئەویست

ئێژیٚ : ئەڵیٚ

ئیسە : ئێستا

هاوردن : هێنان

کاورا : کابرا

وەتەك : لەگەڵ

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە تێر نەخواردنی کابراو، تەلەمووی مێروستان و چەپلە لێدان و ئامادەبوونی کابرای خانوو بەرزکەرەوە .

# ڕاوی چیای ڕەش

**کۆکردنەوە: پەیمان فـواد مـەولـود**
**گێڕانەوە : ئەحمەد کانەبی زیندین**

کابرایەك هەبوو سێ کوڕی هەبوو (ئەحمەد ، مەحەمەد ،مەحمود) کچێکی هەبوو. پێش مردنی وەسیەتی کردو گۆتی: مەچونە (چیای ڕەش)لەپاش ئەوەی کە بابیان مرد مەحمود گۆتی: ئەوە بابم مرد. ئەمن دەچمە چیای ڕەش بزانم چی لییە؟ گۆتی: هەر لەسبەینێ گەڕا هەتا هێوارێ . هێوارێ تووشی پیاوێك بوو پیاوەکە گۆتییە: مەحمودی با بچینە ناو ئەو ئەشکەفتەی مەحمودیش گۆتی: باشە ، پیاوەکە گۆتییە مەحمودی ئەتو بەپێش کەوە. وەلاٚ مەحمود لەپێشەوە چوە ناو ئەشکەفتەکەی پیاوەکەش لەپشتی دەڕۆیشت وەلاٚ لەپشتەوە مەحمودی کوشت ، کابرایەکە ماینەکەی برد لەبۆ خۆی هێوارە داهات مەحمود نەگەڕاوە، لەبۆ سبەینێ مەحەمەدیش چو بۆ چیای ڕەش، بە دەردی براکەی چوو . کابرایەکە ئەویشی کوشت. ئەو کابرایەی کە ئەو کوڕانەی کوشت دیارە دوژمنداری هەبووە لەگەڵ بابیان . لەبۆ سبەینێ ئەحمەد ویستی بڕوا .بەلاٚم، خوشکەکەی گۆتی: ئەمنیش لەگەڵت دێم . وەلاٚ خوشکەکەشی بەگەر خۆی داو ڕۆیشت ئەوانیش توشی کابرایەکەی هاتن. بەلاٚم، ئەوجارە ئەحمەد لەکابرای دا بەلاٚم نەمرد ئەو وایزانی بوو مردیە . لەپاشان چوە ناو ئەشکەفتەکەی زانی ماینەکانی هەردوو براکانی وا لەوێنە. لەوێوە لەبۆی دەرکەوت کە ئەو کابرایە براکانی وی کوشتییە. ئەوە ئەوان لە ئەشکەفتەکەی مانەوە ڕۆژەکی ئەحمەد چوە ڕاوی کابرایەکە گۆتییە: کچەکەی کە ناوی (فاتمە)بو گۆتی: دەرمانەك هەیە لەبۆم بینە ئەمن چا دەبمەوە ، وەلاٚ فاتمەش دەرمانەکەی لەبۆ هێناو چای کردەوە، بەس بەبێ ئەوەی برای بزانی . ڕۆژەکیان کابراکە نیازی خراپ بو لە فاتمەی هەر لەو کاتە دەستی لەگەڵ فاتمەی تێکەڵ کرد ، فاتمەش سکی بوو. ڕۆژ بەڕۆژ سکی

گەورە دەبوو ڕۆژێکیان منداڵی بوو بەس پێش ئەوەی براکەی بگەڕێتەوە زوو چوو منداڵەکەی بردە سەر ڕێگای برای کە هەموو ڕۆژێ دەچوە ڕاو . ئەوجا فاتمە گۆتییە: براکەی ئەگەر هیچ منداڵت بەبەر چاوی کەت بیهینەوە ئەمن بەخێوی دەکەم . ئەوا براکەی ئاگاری هیچ نییە نازانێ کە ئەو پیاوە (سحراویە)واتە (دێوە)و وا لەگەڵیان دەژی . ئەوجا ئەحمەدیش سبەینێ چوە ڕاو دیتی منداڵەك لەوێ دانرایە ئەویش بردیەوە لەبۆ خوشکی خوشکی بەخێوی کرد ئەو منالە کوڕ بو ناوی نا (حازرۆکە) ئەوجا ئەو کوڕەی بەخێو کردو هەتا گەورە بوو. کوڕەکە زانی کە خاڵی دەچیتە دەرێ داکی دەچتە کن پیاوەکی قسەی لەگەڵ دەکات کوڕەکە بە دزی دایکی دەچو گوێی لە قسەکان ڕادەگرت هەتا بزانێ ئەوە کێیە قسەی لەگەڵ دەکات .

ڕۆژەکیان دایکی چووە لای پیاوە دێوەکە (حازرۆکە)ش بە دزی گوێی خۆی لە قسەکانی ئەوان ڕاگرتبوو، دێوەکە دەیویست برای فاتمە بکوژی . پیاوە دێوەکە گۆتی: ئەمن ئەو شەو خۆم دەکەمە دو پشك دەچمە ناو قۆندەرەکەی هەر کە لەپێی کرد من دەیکوژم بەس حازرۆکە خاڵی زۆر خۆش دەویست وە قسەکانی هەموو گوێ لێ بوو. شەوێ ئەحمەد چو قۆندەرەی لەپێ بکات و بچیتە دەرێ حازرۆکە نەیهێشت گۆتی: خارە ڕاوەستە قۆندەرەکەت دادەوەشێنم لەو وەختەدا دوو پشکەکە هاتە دەرێ گۆتی: خارە بیکوژە خاری کوشتی بەس چونکە پیاوەکە دێو بو نەمرد . ئەوجارە دیسان گۆتییە فاتمەی هەر دەبی برایەکەت بکوژم . گۆتی خۆم دەکەمە تەیرەك خۆم بە قەلبی ئەحمەد دادەدەم ژەهری دەکەمە ناو سکی دەمری . بەس دیسان حازرۆکە گوێی لێ بوو.

هەر کەخاری گۆتی: دەچمە دەرێ. حازرۆکە گۆتی: خارە ئەمنیش لەگەرت دێم. هەردوکیان چونە ڕاوێ لەو وەختە تەیرەك هات و ویستی خۆی بە ئەحمەد دا بدات، بەس حازرۆکە نەیهێشت. گۆتی: خارە بیکوژە ، وەلاَ خاری تەیرەکەی کوشت و بردیانەوە ماڵەوە و بەس حازرۆکە لە ڕێگا هەموو بەسەر هاتەکەی لەبۆ خاری گێڕاوە، کە چوونەوە تەیرەکەیان بردەوە ئەحمەد گۆتییە خوشکەکەی ها ئەو تەیرەی بکە شیو، با بیخۆین وەختەك کە شیوەکەی لێ نا

هێنایه پێشیان حازرۆکه گۆتییه دایکی: دایه ئەتو لەپێش ئێمه بخۆ بزانه خۆشه لەو وەختەی که دایکی خواردی یەکسەر دایکی بوه جوانه ماین چونکه ئەو تەیرە ڕۆنی ژەهر بوو. ئەوجا گۆتی: خارە ئەمن لەو خوشکەی تومه ئەوا ژنەکه فەوتاو ڕۆیی .

ڕۆژەکی خەبەریان لۆ هات گوندی گۆتیان:(ڕمەك)لەناو ساحەکی چەقیه ئەوەی هەری بقەڵێنیٚ ئەوە پاشا کچی خۆی دەداتیٚ. که ئەوان گوێیان لیٚ بوو چونه ساحەکەو یەکسەر حازرۆکه ڕمەکەی دەرهێنا چونکه حازرۆکه کوڕە دێو بوو توانای هەموو شتێکی هەبوو ئەو ڕمەش بەکەس دەرنەدەهات تەنها ئەو نەبیٚ. ئەوجا چووە کن پاشای . پاشا گۆتی کچی خۆم دەدەمە تو بەس حازرۆکه نەیویست دایە خاری لەوەوە خاری بوە ساحێب ژن .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیڕۆکە: دێوی ساحر و خۆی دەکاتە دووپشك و خۆی دەکاتە تەیری ژەهراوی و ژنە تەیرەکە دەخوات دەبێتە جوانە ماین.**

# حەوت برا

**کۆکردنەوە: بەیان عەبدولڕەحمان قادر**

وا باس دەکەن لە گوندێك ماڵێك هەبووە ئەو ماڵە تەنها ژنێك و حەوت کوڕی هەبووە، کە پیاوەکەی مردووە . بەڵام ژنەکەی سکی پڕ دەبێت . کاتێك ڕۆژ دەبێتەوە حەوت براکە بە دایکیان دەڵێن : دایە ئێمە وا دەڕۆین بۆ ڕاو وشکار ئەگەر کچت بوو ئەوا بێژینگی بکەرە قەد دەرگاکە و هەڵی واسە پێیەوە . بەڵام ئەگەر کوڕت بوو ئەوا زەنگۆڵێ هەڵواسە بە دەرگاکەوە ، چونکە ئەگەر کوڕت ببێ ئێمە سەری خۆمان هەردەگرین و دەڕۆین . دوای ئەوەی لە ماڵ دەردەچن و دەڕۆن لەدوای دەرچوونیان لەماڵ داکیان منداڵیان ئەبێت بەڵام کچ ئەبێت و بێژینگی هەڵئەواسێتە دەرگاکەوە بۆ ئەوەی کە ئێوارە کوڕەکانی لەڕاو هاتنەوە بزانن کچیان بووە . بەڵام مامانەکەیان بە دزیەوە بێژینگەکە لادەداو لە جێگەکەی زەنگوڵی دادەنێ بۆ ئەوەی کوڕەکانی سەری خۆیان هەڵگرن . کاتێ ئێوارە کوڕەکان دێنەوە سەیر دەکەن زەنگوڵی هەڵواسراوە وا دەزانن کوڕیان بووە . یەکسەر ماڵ بەجێ دێڵن و لەدوا چەند ساڵێك خوشکەکەیان گەورە دەبێ گۆلکێکی سوری دەبێت لەماڵەوە هەموو ڕۆژێ دەردەکات بۆ دەرەوە کچەکەیان ناوی فاتمە دەبێت ڕۆژێکیان فاتمە دەچێتە سەر کانی خەریکی قاپ شوشتن دەبێ لەناکاوێك هەوایەك بەردەدات ئیتر کچەکانی سەر کانی دەڵێن فاتمە ئەتو بوی ئەویش دەڵێ بەسەر گۆلکە سورە من نەبووم لەدواییدا دەچێتەوە بۆ ماڵ سەیر دەکا گۆلکەکەی نەخۆشە. بەڵام دوایی مردار دەبێتەوە کە دەیباتە سەرکانی بۆ ئەوەی پاکی بکات لەو کاتەدا حاجی لەق لەقێ دێو پێی دەڵێ تۆ حەوت برات هەیە من شوێنیان دەزانم ئەگەر ئەتەوێ بیاندۆزیتەوە ئەوا وەرە سەر ملم بەڵام بە مەرجێ هەر کاتێ من وتم قخ دەبێ تۆ پارچە گۆشتێ بخەیتە ناو دەمم ئیتر فاتمە من برام نییە با بچمەوە ماڵ پرسیار لە دایکم بکەم . کاتێ دەچێتەوە ماڵ و پرسیاری لێ دەکا

دەڵێ دایە من برام هەیە ؟ دایکیشی دەڵێ: بەڵێ حەوت برات هەیە بەلاَم لەو کاتەی تۆ لەدایك بووی ئەوان سەری خۆیان هەڵگرت و ڕۆیشتن ئیتر فاتمە بە خێرایی دەگەڕێتەوە بۆ لای حاجی لەق لەقەکەو پێی دەڵێ با بڕۆین بۆ ئەو شوێنەی کە براکانمی لێیە ئیتر لەوێ دەچێتە سەر ملی و دەکەونە ڕێ بۆ لای براکانی لەڕێگا هەر دەڕۆن و حاجی لەق لەق دەڵێ قخ فاتمەش پارچە گۆشتێکی گۆلکە سورە ئەخاتە ناو دەمی حاجی لەق لەقەکە . هەتا ماوەیەکی زۆر دەڕۆن ئەوەندەیان نامێنێ بگەنە شوێنی براکانی بەلاَم گۆشتی پێ نامێنێ لەو کاتەدا حاجی لەق لەق دەڵێ: قخ، بەلاَم گۆشتی پێ نەماوە ناچار چەقۆیەك لە پەنجەیەکی خۆی دەدات و دەیبڕێ و دەیخاتە ناو دەمی کاتێ دەگاتە ماڵی براکانی دەچێتە ژوورەوە سەیر دەکات کەس لەماڵ نییە لەبەر ئەوەی چوو بوون بۆ ڕاو وشکار . ئەویش هەڵدەستێ ناو ماڵەکەیان بۆ جوان جوان خاوێن دەکاتەوە و هەمووی ڕێك دەخات لەو کاتەدا پشیلەیەك لەوێ دەبێ و دەڵێ : من دەمرم گوێم دەبێ بە پیاز ئەوەی بیخوات دەبێ بە بەراز . کچەکەش ئەو پیازە دەکاتە ناو چێشتەکەوە . کاتێ نیوەڕۆ براکانی دێنەوە سەیر دەکەن ماڵەکەیان زۆر خاوێن کراوەتەوە . یەکسەر هەست دەکەن بۆیە دەست دەکەن بە گەڕان هەتا فاتمە دەدۆزنەوە دەڵێن تۆ کێیت و چی دەکەی لێرە ؟ ئەویش دەڵێ: من خوشکتانم ئیتر زۆریان پێ خۆش دەبێ بەلاَم کە چێشتەکە دەخۆن هەموویان دەبنە بەراز بەلاَم تەنها خوشکەکەیان نایخوات ئیتر خوشکەکەیان براکانی دەداتە پێش بۆ ئەو دەشتە بۆ ئەوەی بیان لەوەڕێنێت چونکە بونەتە بەراز . بەلاَم لە ڕێگا تووشی کابرایەك دەبێ و کابرا پێی دەڵێ : من دەتوانم ئەو بەرازانەت بۆ بگەڕێنمەوە سەر براکانی خۆت . بەلاَم بە مەرجێ من یەکی سێ داریان لێ دەدەم ئەون دەڵێن ئای تاتە بەلاَم تۆ نابێ هیچ قسەیەك بکەی چونکە ئەگەر قسە بکەی ئەوە چاك نابنەوە . ئیتر کابرا بە دار لە براکانی دەدات هەموویان دەڵێن ئای تاتە بەلاَم ئەم قسە ناکات ، ئیتر هەموویان دەبنەوە کوڕەکانی پێشوو بەلاَم تەنها برا بچوکەکەی نەبێ کەلێی دەدات دووەم جار دەڵێ ئای کاکە کچەش خۆی پێ ناگیرێ دەڵێ: گیانی کاکە. ئیتر براکەی نیوەی ئەبێتە کوڕو نیوەی ئەبێتە بەراز . بەلاَم دوایی دیسان لێی

دەدات و چاك دەبێتەوە . ئیتر هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ و شوێنەكەی خۆیان بە دایكی خۆیان ئاشناو كامەران دەبنەوە .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆكە: سواری لەق لەق و گۆشتی خۆ دەرخوارددان و پشیلە دەمرێ و دەبێتە پیاز و پیاز لە شیو دەكرێ و هەر حەوتیان دەیخۆن و دەبنە بەراز، بەلێدانی سێ دار بەرازەكان چاك دەبنەوە بەومەرجەی كچە لەكاتی لێدانی دەڵێ: وەی كاكە:بەمە نیوەی دەبێتەوە مرۆڤ و نیوەی بەراز .**

# هێلکەی نامێ

**کۆکردنەوە: بێریڤان سەمەد حەوێز**

**گێڕانەوە : عەتیە سالح عومەر**

پیرێژنێك لەسەر کانیەکی گۆزەی پڕ ئاو دەکا، کوڕە پاشایەك کە ناوی ئەحمەدە لەوێ دێ و دەچێ دەرسی دەکا ، پیرێژنەکە بانگی دەکا پێی دەڵێ: وەرە کوڕم ئەو گۆزەیە بخە سەر شانم، ئەحمەدیش گۆزەکە دەخاتە سەر شانی، پیرێژنەکە پێی دەڵێ: کوڕم بگەیە هێلکەی نامێ، ئەویش دەپرسی دەڵێ: داپیرە هێلکەی نامێ چییە؟ پیرێژنەکەش دەڵێ: کوڕم بڕۆ بە باوکت بڵێ باگۆچانەکی ئاسن و قۆندرەکی ئاسنت لەلای ئاسنگەر بۆ دروست بکا ئینجا هەر بڕۆ هەر بڕۆ هەتا گۆچانەکە دەشکێ و قۆندرەکەش دەدڕێ ئەوجە دەگەیە هێلکەی نامێ. ئەحمەدیش دەچێتەوە داوا لەباوکی دەکا کە بۆی پێك بێنێت باوکی لەسەرەتا ڕازی نابێ بەڵام، لەدوایی لەبەر ئەوەی ئەحمەد دەڵێ: هەر دەڕۆم. ناچار باوکی ڕازی دەبێت کە بڕوا، ئەحمەد کەرەستەی خۆی حازر دەکاو ڕوو لە بیابان دەکا، قۆندرەکە لەبەر دەکاو گۆچانەکەش بە دەستەوە دەگری، هەر دەڕوا هەر دەڕوا ڕێگایەکی دوور و درێژ دەبڕی ماندوو و هیلاك دەبێ، پاشان تەماشا دەکا پێڵاوەکە دەدڕێ و گۆچانەکەش دەشکێ ئینجا نزیك دەبێتەوە لە دارێك، ئەو دارە هێلکەی گرتیە لەژێر دارەکە منداڵێکی ساوا هەیە: لەناو لانکە بەجواب دێ و دەڵێ: ئەحمەد لەو دارە سێ هێلکە لێ بکەوە زیاتر لێ نەکەیەوە .

ئەحمەدیش سێ هێلکەی لێ دەکاتەوە، هەندێك دوور دەکەوێتەوە لەدارەکە یەکەم هێلکە دەشکێنێ دەبینێ کچێکی جوانی لێ دێتە دەرێ داوای نان و ئاو لە ئەحمەد دەکا. ئەویش هیچی پێ نیە بیداتێ کچەکە بزر دەبی، هەندێکی تر دەڕوا هێلکەی دووەم دەشکێنێ دیسان کچێکی جوانتر لەوەی پێشتر دێتە دەرێ ئەویش داوای نان و ئاوی لێ دەکا، ئەحمەدیش هیچی پێنیە ئەویش بزر

دەبی، پاشان ئەحمەد بڕیار دەدا هێلکەی سێیەم نەشکێنێ هەتا دەگاتە ئەو شوێنەی کە نان و ئاوی لێیە، دەڕوا دەڕوا دەگاتە نزیك ئاوەکی تەماشا دەکا کۆمەڵێك کچە قەرەج لەوێ دانیشتینە شت دەفرۆشن. ئەویش هەندێك لە کولێرە دەکڕێ و لەگەڵ هەندێك ئاو دەباتە لایەکی دوور لە قەڵەباڵغیەکە، هێلکەی سێیەم دەشکێنێ دەبینێ کچێکی زۆر جوانتر لە دوانەکەی تر دێتە دەرێ. دەڵێ: نان. نانی دەداتێ. دەڵێ: ئاو ئاوی دەداتێ دەیکاتە خێزانی خۆی، ماڵی باوکی ئەحمەد زۆر دوورە لەو شوێنە بۆیە ئەحمەد دەچێتە ئەو شوێنەی کە ئاوەکەی لێ بوو، دارێکی بەرزیشی لێیە کچەکە دەخاتە سەر دارەکەو پێی دەڵێ: من دەچم خەبەری ماڵی باوکم دەدەم پاشان دێم تۆ دەبەم لەگەڵ خزم و کەسانم. ئەحمەد دەڕوا بەیانی زوو سۆرەی چاوشین کە کچێکی قەرەجە دێتە سەر ئاوەکە سەیری ئاوەکە دەکا هێلکەی نامێ دەبینی دەڵێ: ئەڵڵا ئەمن چەند جوانم ئەدی لۆ عالەم دەڵێن: ئەتو ناشیرینی، هێلکەی نامێش بەجواب دێت دەڵێ: ئەتو نی ئەمنم ، سۆرەی چاوشین سەری بەرز دەکا هێلکەی نامێ دەبینی پێی دەڵێ: ئەتو کێی؟ دەڵێ: ئەمن هێلکەی نامێم ژنی ئەحمەدی کوڕی پاشام، پێی دەڵێ: ئەدی ئەتو چۆن چویە سەر ئەو دارەی؟ دەڵێ بە کەزی خۆم ، سۆرەی چاوشینیش دەڵێ: دەکەزی خۆت بۆ من شۆڕ کەوە با ئەمنیش بێمە سەر ئەو دارەی هێلکەی نامێ کەزی خۆی بۆ شۆڕ دەکاتەوە ئەویش بە کەزیەکەی بەسەر دەکەوی ، پاشان سحری لێ دەکا بەخۆی دەچێتە جێی ئەویش دەکا بە کۆتر ، ئەحمەد دێتەوە دەبینی کچەکە زۆر گۆڕاوە و ناشیرین بووە پێی دەڵێ: ئەوە بۆ وا ڕەش بووی؟ دەڵێ: لەبەر هەتاوێ دەڵێ: لۆ وا کز بووی؟ دەڵێ: لە برسان ، ئەحمەدیش نازانی دەیبا لەگەڵ خۆی کە دەچێتەوە خزم و کەسانی زۆر ڕەخنەی لێ دەگرن کە پاش ماندو بونی زۆر ئینجا ئەو کچەی لەگەڵ خۆی هێناوە ، دوای ئەوەی کە خواردنی زۆر ئامادە دەکەن و نان دەخۆن ئەحمەد دەڵێ:تە کچەکە وەرە با بگەڕێین بەناو باخ و باخات دێن و دەچن تەماشا دەکەن کۆترێکی زۆر جوان لەسەریان دێ و دەچێ کۆترەکە لێیان نزیك دەبێتەوە دەست بە قسە دەکا دەڵێ ئەحمەد ئەمن هێلکەی نامێم سۆرەی چاوشین بە سحر ئەمنی کرد بە

**کۆتری ناو داران، پاشان کۆترەکە لەبەردەمیان دەنیشێ و دەبێتەوە کچەکە ، سۆرەی چاوشینیش بە سزای خۆی دەگات ، ئەحمەدیش بە دڵێکی خۆش کچەکە دەباتەوە ماڵێ و پێیان دەڵێ: ئەوە هێلکەی نامێیە ، ئەوانیش هەموویان بە سەرسوڕمانەوە لەجوانی کچەکە ڕادەمێنن و زۆر دڵخۆش دەبن .**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: منداڵی ناو لانکێ قسان دەکات، دار هێڵکەی نامی دەگری، هێڵکەی نامێ کچی لێ دێتەدەر، سۆری چاوشین بە سحر کچەی هێلکەی نامی دەکاتە کۆتر، کۆتر بە قسە دێ و دەبیتەوە کچەی هێڵکەی نامێ.**

# شای پەریان

**کۆکردنەوە : بێریڤان صەمەد حەوێز**

دەڵێ: سەلیم توجارەك هەبوو، خەڵکی بەغدا بوو، زۆر زۆر دەوڵەمەند بوو توجارێکی یەکجار گەورە بوو، کابرایەکی فەقیری لێ پەیدا بوو، خەڵکی بەسرا بوو، هات لەکن سەلیم توجاری بوو بە شاگرد و خزمەتی ولاغانی پێ دەکرد ئەشیای دەبرد لە بەسرا بۆ بەغدا لەوێ دەچوونە ماڵی حوسێن توجاری تا ئەشیایەکەیان دەفرۆشت تا وای لێ هات حوسێن توجاریش دەوڵەمەند بوو بە پارەی سەلیم توجاری، دەڵێ چاوی بەخۆی کەوت وەك ئەو دەوڵەمەند بوو کابرایەکی زۆر بێ سفەت بوو جا گووتی:سەلیم توجار ئەمنیش زۆر دەوڵەمەندم دەچمە بەسرایە توجاری دەکەم خوا حافیزی لە سەلیم توجار کرد چوو بۆ بەسرا بوو بەیەکەم توجاری بەسرا لەسایەی سەلیم توجار، سەلیم توجار وا مایەوە هەتا پیر بوو ئەمری خوای کرد .

سەلیم توجار کەس نەبوو میرات گری بێ، ژنەکەی بە تەنها مایە بەڵام ژنەکە حامیلە بوو، کە ژنەکەی نۆ مانگ و نۆ ڕۆژی تێ پەڕی خوا کوڕەکی دایە ناوی نا ئەحمەد، دایکی ئەحمەدی ئەو کوڕەی زۆر خۆش دەویست چونکە هیچ کەسی نەبوو ئافرەتێکی زۆر جوان و بە حەیاو بە ئەدەب بوو، دەڵێ ئەو کوڕەی بەخێو کرد لەسەر ماڵی دانیشت هەرچی ماڵی هەیبوو لەو کوڕەی سەرف کرد ئەو کوڕە پێ گەیشت. بەڵام، کەس نەبوو ئیشێ بکا ماڵەکە سەرف بوو ، سەروەتەکەی هاتە بڕان. وەختێکی ئەو کوڕە گەورە بوو عومری گەیشتە (20)ساڵ زۆر فەقیر بوو، ماڵیان نەمابوو گووتی: دایە بابی من وەختی خۆی چ ئیشەکی کردووە؟ گووتی: باوکی تۆ کوڕم توجار بوو نیوەی شاری بەغدا هی وی بوو، بەڵام کوڕم ئەو ماڵەم هەموو لەتۆ سەرف کرد هیچ نەماوە گووتی: دایە ئەگەر ڕوخسەتم بدەی دەچم کارەك دەکەم لەووڵاتان، خوا حافیزی لە دایکی کردو ڕۆیشت، دێ بەدێ هیچ ئیشی دەست نەکەوت. هەتا گەیشتە شاری بەسرا، چوو لەچاخانەکی دانیشت، زۆر مەحزون بوو چونکە پارەو پولی پێ نەبوو، کاری دەست نەکەوتبوو، گووتی: کێ هەیە من بگرێ بەشاگرد

**ئەگەر ئیشی بۆ بکەم" کەس نەبوو، گوتیان: ماڵی حوسێن توجاری هەیە ئەویٚ ئەگەر شاگردیان بویٚ لەویٚ حوسێن توجار لێی پرسی خەڵکی کوێی گووتی: خەڵکی بەغدام، ئەویش ووتی:: من وەختێکی کابرایەکم دەناسی ناوی سەلیم توجار بوو کابرایەکی زۆر دەوڵەمەند بوو ئەویش گووتی:: باوکی من بوو، یەکەم دەوڵەمەندی بەغدا بووە . ئەحمەد ووتی: بەس بابی من (20)ساڵە نەماوە من لەزگی داکم بووم کە باوکم مردووە، ووتی:: ئێستاش ئەو ماڵەی هەمان بوو هەمووی لەمن سەرف کردووە داکم . ئێستا زۆر زۆر فەقیرین هاتووم ئیش بکەم ئەگەر ئیشێکم پیٚ بکەن .**

**دەڵیٚ: حوسێن توجار زۆر فکری لەسەلیم توجاری کردەوە لێوی خۆی گەست گووتی: کوڕم هەستە تا ئیشت دەمیٚ بردی لەسەر دوکانێکی گەورە داینا گووتی: ئەم دووکانە گەورەیە بۆ خۆت . ئەحمەد گووتی: حوسێن توجار گاڵتەم پیٚ مەکە من بەس شاگردیم دەویٚ، گووتی: من گاڵتەت پیٚ ناکەم من وەك تۆ فەقیر بووم کە هاتم بۆ بەغدایە باوکی تۆ منی دەوڵەمەند کردوە، کە ئێستا یەکەم توجاری بەسرام ئێستاش ئەمە حەقی خۆتە . ئەحمەد دانیشت لەسەر دوکان و دەوڵەمەند بوو جا گووتی: کوڕم هەستە خۆ سازکە بچین بۆ بەغدایە بۆ سەردانی دایکت بکەین لەویٚ ئەشیایەکی زۆریان هێنا چەند خزمەتکاریشیان لەگەڵ بوو تا ولاغەکان خزمەت کەن لەقەراخ شاری باریان خست ، سینیەکی هێنا بۆ ئەحمەدی لیرەیەکی لەسەر دانا بۆ ئەحمەدی گووتی: ئەو لیرەی بەرە بۆ داکت بڵیٚ لەگەڵ حوسێن توجاری میوانین بۆ سەرەخۆشی سەلیم توجاری دێم، ئەحمەد هەستا ڕۆیی بۆ کن داکی گووتی:: دایە ئەو لیرەی سەرف کە لەگەڵ حوسێن توجاری دێین بۆ سەرەخۆشی باوکم، ئەویش گووتی: کوڕم (20)ساڵە باکت مردووە ئێستا وەختی سەرەخۆشی نییەو لیرەی بۆ بەرەوە .**

**ـ حوسێن توجاریش گووتی: ئەو لیرەیەی پیٚ کەم بووە ها ئەو دوو لیرەی بۆ بەرە، بە هەمان شێوەی جاری پێشوو دایکی وەری نەگرت، ئەمجارە حوسێن توجار گووتی: ها ئەوە سیٚ لیرە بۆی بەرە ئەوجا داکی لێی وەرگرت و**

گووتی: ئەگەر هاتن بەسەرە خۆی مەیەن بە دیدەنی وەرن چونکە (20)ساڵە سەلیم نەماوە .

دەڵێ: ئینجا شەویان لێ بەسەر داهات هاتن لەوێ شەوێ دانیشتن و کەوتنە پرسیار لێك کردن، گووتی: حوسێن توجار ئێستا وەختی سەرەخۆشی نییە (20)ساڵە سەلیم نەماوە، ئەوجا بەیانی چوون شت و مەکەکەیان سەرف کرد شەوانە هەموو شەو دەچوونە ماڵی ئەحمەدی واتە سەلیم توجار .

حوسێن توجار بەداکی ئەحمەدی گووت: دەبێ شووم پێ بکەیەوە ئەویش گووتی: پاش سەلیم توجار شوو بەکەس ناکەم. بەڵام حوسێن توجار هەر وازی لێ نەهێنا گووتی: هەر دەبێ شووم پێ بکەی. دایکی ئەحمەدی ناچار بوو گووتی: حوسێن شووت پێ دەکەم بە مەرجێك دەبێ ئەحمەدم وا بۆ دەوڵەمەند بکەی بەقەد باوکی ئەویش قبوڵی کرد، گووتی: ئەحمەدت بۆ دەوڵەمەند دەکەم وەکو سەلیم توجاری بەڵام ئەو کابرایە خایەن بوو لەگەڵ ئەحمەدی ویستی بی فەوتێنێ، هەستا بەیانی (30)بار گەوهەر و زێڕ و فەرشی بە قیمەتی بۆ بار کرد سی ولاخیشی دایە بۆ خۆشی سێ ولاخی ساز کرد سێ کوندە ئاوی لێ بار کرد کوندە ئاوەکان هی خۆی بوون. ئەشیایەکەش هی ئەحمەدی بوو جا گووتی: ئەحمەد با بچین ئەو ماڵەی سەرف کەین تا تۆش دەوڵەمەند ببی هەستا ڕۆیشتن بە جۆگەو بیابانان دا بە شوێنی وا دادەڕۆیشتن ئاوی لێ نەبوو هیچ شوێنێکی. ئەحمەد تەڕایی ئاوی پێ نەبوو بەخۆ و بە ولاخەوە وەخت بوو بخنکێ لە تێنوان. گووتی: حوسێن توجار کوندێك ئاوم دەیێ، حوسێن گووتی: یەك کوندە ئاو بەیەك باری ولاخەکانت. وەلحاسڵ هەر سێ کوندە ئاوەکەی لێ کڕی بەسێ بارە وولاخەکەی خۆی. ئەوجا حوسێن توجار گەڕایەوە بەخۆی و بارەکەیەوە ئەحمەد بینی هەموو ئاوەکەی بڕا لەو بیابانە مایەوە وەخت بوو بخنکێ لە تێنوان. حوسێن توجار گەڕایەوە بۆ شاری بەغدا چووە کن دایکی ئەحمەد گووتی: وەکو جارانی باوکی دەوڵەمەندم کردووە. ئێستاش بڕوام پێ بکە بەڵام دایکی ئەحمەد گووتی: تا ئەحمەد نەیەتەوە شووت پێ ناکەم! ئەحمەدت فەوتاندووە. دەڵێ: چەند مانگ ئاوا مایەوە ئەحمەد هەر دیار نەبوو دایکی ئەحمەدی خۆی بە

دەستەوە نەدا، حوسێن توجاریش چوو بوو بە وەزیری پاشای بەغدا ئەحمەدیش هەروەکو گووتم: لە تێنوان وەخت بوو بخنکیٚ نەدەگەیشتە ئاویٚ ملی بەچیایەکەوە نا لەبن چیایەکەی ئەژنۆی شکا لە تێنوان زمانی وشك ببوو هەر لەوکاتەدا سیٚ پەری بۆ کن هاتن، ئەحمەدیان هەڵگرت بردیانە سەر چیایەکی لەسەر حەوزێك دایاننا پڕ لەئاو پیاوێکی کوێری لیٚ دانیشتبوو یەکیٚ سام گران ئەحمەد زۆری لیٚ دەترسا گووتی: ئەگەر ئاویٚ بخۆم ئەوا ئەو کابرایە چم بەسەر دێنیٚ ئەگەر ئاو نەخۆم دەخنکێم لە تێنوان دەڵیٚ: ناچار بوو بۆ لای ئاوەکە هەڵکشا هەندەی ئاو خواردەوە سك ئاو بوو چونکە زۆر تێنوو بوو ئەوجا ئەحمەدیش ئاوی لە دەم و لووتان هاتە دەریٚ، ئەو کوێرەی لەسەر ئاوەکە بوو ئەو ئاوەی لە دەمی ئەحمەدی هاتەوە دەریٚ بەسەر و چاوی خۆی دەکرد . ئەو کوێرەیە هەردوو چاوی چاك بوونەوە. وتی: ئەوە تۆ چی بووی لێرە پەیدا بووی منت لەو کوێریە ڕزگار کرد. کوێرە وتی: من حەوت ساڵە چاوم کوێرە چەندەها دکتۆرم کرد چاك نەبوومەوە پێیان وتم: بە ئاوی کابرایەکی زۆر زۆر تێنوو بپشمیٚ ئاوی لە دەم و لووتان بێتە دەریٚ بە چاوانی هەڵبڕژێنیٚ ئەوجا چا دەبی، گووتی:: ئێستاش تۆ منت چاك کردەوە من شەش کوڕم هەیە بەتۆوە ئەوا حەوت بەڵام تۆ برا گەورەی هەر شەشانی ئەمن شای پەریان بووم ئێستاش با بڕۆینەوە بۆ ماڵی ئێمە. ئەحمەدی بردەوە ماڵیٚ بردیە ناو مێرگ و مێرگوزارێکی زۆر خۆش، ئەحمەد بە حەیاتی جێگای وا خۆشی نەدیبوو. شای پەریان بانگی کوڕەکانی کرد گووتی: کوڕم وەرن ئەم کوڕە برا گەورەی هەمووتانە بەهەر هەمووتان خزمەتی دەکەن داوای هەر شتیٚ بکا دڵی ناشکێنن چونکە ئەو چاوی منی چا کردەوە. ئەو کوڕانە خزمەتیان دەکرد بەشەو و بەڕۆژ پاش چەند ساڵان ئەحمەد زۆر وەرس بوو هەناسەیەکی هەڵکێشا دەڵیٚ کوڕی شای پەریان لێی کۆ بوونەوە و گووتیان: ئەو هەناسەیەت بۆ هەڵکێشا هەر چ نارەحەتیەکت هەیە با بۆت چارە بکەین تۆ گەورەی ئێمەی. ئەویش گووتی: براکانم زۆر لەمێژە من لێرەکانم بەڕاستی زۆر حەزم لەڕاوێیەو وەرس بووم ئەوانیش گووتیان: تا پرس بە بابمان نەکەین ناتوانین بچین. کوڕەکان گووتیان: بابە ئەحمەد دەڵیٚ: بمبەن بۆ ڕاو شای

پەریان گووتی: کوڕم مەچۆ بۆ ڕاو ئەویش گووتی: زۆر بیٚ تاقەتم دەمەویٚ هەر بچم شای پەریان گووتی: ئەحمەد ئادەمی زادە نای گەنیٚ لای شاخی مەدەن با هەر لە دەشتەکەی بگەڕیٚ لەبەر ئەوەی لە شاخی لە ئیٚوە ئازاترە. هەستان چوون بۆ ڕاویٚ چەند تاژی و توولەیان بردن چوونە دامیٚن شاخیٚکی خۆیان لای شاخی بوون ئەحمەد لای دەشتیٚ حەیوانیٚکیان هەستاند زۆری ڕیٚ کەوتن بۆیان نەگیرا حەیوانەکە ڕووی لەشاخی کرد ئەحمەدیش بەدووی کەوت لەشاخیدا هەتا گەیشتە سەر شاخی یەك ڕمی لیٚ دا حەیوانەکەی کوشت سەری بڕی. لەسەر شاخی سەری بلٚند کرد شاری بەغدای چاو پیٚ کەوت هیٚندە شاخەکە بلٚند بوو غوربەتی هەستا دەستی کرد بە گریان وەختیٚکی کە پەریان هاتن ئەحمەد دەگریا، گووتیان: ئەحمەد بۆ دەگریەی لۆ خۆ حەیوانەکەت کوشتووە گووتی:: وەلاٌهی براکانم غوربەتیم هەستاوە گووتی: سەبر کەن ئەو شارەی دیارە بەغدایە ئەمن مالٚم لەویٚیە دایکم بەتەنیا بەجیٚ ماوە ئیٚستاش وەرسم و غەریبی داکم دەکەم گووتیان: بەبیٚ بابمان ناتوانین بلٚیٚین بچۆوە بۆ مالٚیٚ، ئەو کاتەی بابم قسەت لەگەلٚ دەکات گووتی: کوڕم مەڕۆوە تۆش بلٚیٚ هەر دەڕۆمەوە ئەویش دەلٚیٚ هەر وەرسی دەست لەسەردانیٚ لەمالٚی دونیایە چیت دەویٚ هەیە، خوشکیٚکمان هەیە ناوی شاگولٚ شای پەریانە دەلٚیٚ پیٚشکەشت دەکەم ئەتووش بلٚیٚ من نامەویٚ هەتا سیٚ جاران، پاشی سیٚ جارەی بلٚیٚ شای پەریان ئەگەر من خەلاٌت دەکەی ئەسپی سور قولم بدەییٚ باوکیشم ئەو ئەسپەی زۆر خۆش دەویٚ دلٚی نایە بیدا بەهیچ کەس دەچیٚ سحریٚکی لیٚ دەکا دەیکات بە ڕیٚویەکی لات میٚشی لە دەمی بیٚتە دەریٚ ئەویش دەلٚیٚ ئەسپی سورقول بەعەمەل تۆ نایە کوڕم تۆش بلٚیٚ: قبولٚمە، ئەویش بە ناچاری دەتداتیٚ ئەتووش وورده وورده لەباخی بیبە دەریٚ دوایی دەبیٚتە ئەسپی سورقول هەر شویٚنیٚکی داوا بکەی دەتگەیەنیٚتە جیٚ . ئەوجا دەگەڕیٚنەوە بۆ مالٚیٚ . لەمالٚیٚ ئەحمەد هەناسەیەك هەلٚدەکیٚشیٚ شای پەریان دەلٚیٚ کوڕم ئەو هەناسەیە چی بوو ئەتووش دەلٚیٚی غوربەتیم هەستاوە غەریبی دایکم دەکەم دەمەویٚ بچمەوە مالٚیٚ ئەویش دەلٚیٚ: مەڕۆ چ ناخۆشیەکت لییە ئەویش دەلٚیٚ هەر دەڕۆم، ئەویش دەلٚیٚ: ئەگەر هەر دەڕۆی ئەمن کچیٚکم هەیە

شاگولْ شای پەریانە ئەمن پێشکەشم کردی، ئەحمەد دەڵێ ئەوا قبوڵم کرد پێشکەش بەخۆتم کردەوە هیچم لەتۆ ناوێ هەتا سێ جار بەم شێوەیە ، ئاخیری شای پەریان گووتی: ئەحمەد هەر ئەمجارەت ماوە ، ئەحمەد قبوڵی نەکرد گووتی: شای پەریان ئەگەر من خەلأت دەکەی ئەسپی سورقولم بدەیە . شای پەریان گووتی: ئەحمەد حەوت ساڵە چاوم کوێر ببوون بەلأم بریا حەوت ساڵیکە چاوم کوێر بایە بەلأم داوای ئەسپی سورقولت نەکردایە. بەلأم ناچارم قەولم پێ داوی هەر دەت دەمێ . چوو بۆ کن ئەسپی سورقول و دوعایەکی لێ خوێند و بوو بەڕێویەکی لاتی ناشیرن مێشی تێوەرهاتبوو ، جا گووتی: ئەحمەد ئەوە ئەسپەکەتە ئەحمەدیش هەر چۆنێ بێ پێش خۆی دا هەتا بە باخی هێنایە دەرێ ڕای کێشا دوور کەوتەوە لە وولأتەکەی. لەسەر مێرگێك لای دا بۆ ئیسراحەت نانی خواردو گووتی: ئەسپی سورقول وەرە سەر شێوەی خۆت گووتی: پێت خۆش بێت و ناخۆش بێ هەر دەتبەم هیچ کەم عەزیەت مەدە ، ئەسپی سورقول هاتەوە سەر شێوەی خۆی حیلانی لە ئەستێرانی دەروانی ئەحمەد سامی لێ دەکرد جا گووتی: ئەحمەد وەرە سوار بە کوێت دەوێ تا بتگەیەنمێ گووتی: بمگەیەنەوە شاری بەغدا ، هەندەی چاو تروکانێك خۆی گەیاندە قەراخ شاری بەغدا جا گووتی: ئەحمەد دابەزە دوو سێ موو لە سمێلأن هەڵکێشە هەر چ کاتێك ویستت مویەك هەرکروزێنە من لەکنت حازرم بەلأم خواردنی من هەر بەباخی شاگولْ شایە ئەمن خوا حافیز ئەسپەکە گەڕایەوە ئەحمەد چووە ماڵێ چوو بۆ لای دایکی دایکی گووتی: حوسێن توجاری چی لێ کردی گووتی: وەخت بوو بمفەوتێنێ بەلأم شوکر سەلامەت بووم ، ئەحمەدیش دەڵێ: دایە حوسێن توجار چی لێ هات دایکی دەڵێ کوڕم زۆر لەگەڵ من خەریك بوو دەبێ شووم پێ بکەی ، ئەمیش گووتم: ئەحمەدت فەوتاندووە جارێکی تر بەو ماڵەدا نێیەوە ئێستا بووە بە وەزیری بەغدایێ . ئەوانیش دانیشتن ئیشی خۆیان دەکرد . حوسێن توجار لەوێ وەزیر بوو گووتی: پاشا با باخێکی دروست کەین لەئاویدا باخێکیان دروست کرد ڕازاندیانەوە کە ڕازاندیانەوە خەڵکی ئەو شارەیان لەو باخەدا دەعوەت کرد جا پاشا دوای دەعوەتێ هەستایە پێ گووتی: کێ ڕەخنەی لەو باخە هەیە

خەڵکەکە ووتیان: پاشا ئەم باخە هەرچی عەیبە نییە. حوسێن توجار هەستایە پێ گووتی: یەك عەیبی هەیە ، پاشا گووتی: عەیبەکە چییە گووتی: شاگوڵ شای پەریان هەیە بیهێنی لەو باخەی دا لەگەڵی ڕابوێری لەو باخەدا . پاشا گووتی: حوسێن توجار شاگوڵ شایەکی پەیدا دەبی گووتی: ئەحمەدێك هەیە کوڕی سەلیم توجاریە باوکی نەماوە لەگەڵ دایکی دانیشتووە شاگوڵ شای پەریان بەوی پەیدا دەبی پاشا لەدوای ئەحمەدی نارد ئەحمەد بە پەلە هات پاشا ئەمری کرد گووتی: دەمەوێ شاگوڵ شای پەریانم بۆ بخوازی . ئەحمەد گووتی: من فەقیرم بەمن پەیدا نابێ ئەویش گووتی: ئەحمەد بە عەجەلەی یەك حەفتە پەیدای دەکەی دەنا لەسەرت دەدەم ئەحمەد تینی بۆ هات ڕۆیشتەوە بۆ ماڵ چووە قەراغ شاری وەسیەتی بۆ دایکی دەکا مویەکی لەموەکانی ئەسپی سورقول هەڵکروزاند ئەسپی سورقول فەوری پەیدا بوو، گووتی: ئەسپی سورقول پاشا دەڵێ دەبێ شاگوڵ شای پەریانم بۆ بخوازی گووتی: وەرە سوار بە هەر هێندەی بڵێی یەك و دوو گەییە جێ لەوێ گووتی: ئەحمەد لێرە خۆ مات دەکەم ئەتۆ بچۆ ئەو دیو هەرچوار دەوری تەلبەندەوە ووتی: دەبێ لۆکە بەری بۆ ئەوەی ئەو تێلانە زۆر تیژن بەسەریان دا بڕۆی تێت هەڵنەچەقێ ئەوا شاگوڵ شا لەوێ نووستووە ماچی کەو وەرەوە ئەو دیو لەوێ بگەڕێی هەلا هەلا دەکرێی ئەگەر گەیشتیە ئەو دیو تەل بەندەکەی دەڵێ: ئەحمەد بوەستە تۆش بوەستە جا ئەحمەد ڕۆیشت ئەو تەلەسمانەی شکاند شاگوڵ شای ماچ کردو غاری دا ئەویش بەدووی کەوت هاتە ئەو دیو جا گووتی: ئەحمەد مەڕۆ تازە من هی تۆم تۆ هی من ، چوونە کن ئەسپی سورقول ، ئەسپی سورقول خۆی گۆڕی بوو بە ڕێویە لاتەیەك زۆر ناشرین لە ترسی شاگوڵ شای پەریان شاگوڵ شا چاوی پێ کەوت یەك شەقی تێ هەڵداو گووتی: ئەم کارە کاری تۆیە دەنا هیچ کەس ناتوانێ بێتە کن من جا گووتی: وەرەوە سەر شکلی خۆت لەگەڵ ئەحمەدی سوار بوون هەتا چوونەوە ئەو مێرگەی ئیسراحەتیان لێ کردبوو لەگەڵ ئەسپی سورقول . لەوێ ئیسراحەتیان کرد نانیان خوارد پاش نان خواردن دەستیان بە سوعبەت و سەیران کرد هێندەیان یەکتر ماچ کرد تا لەیەکتر وەڕس بوون . ئەمجا ئەحمەد هەڵتروشکا لەسەر چۆکان گریا شاگوڵ

شا گووتی: ئەحمەد بۆ دەگرییێی ئەویش گووتی: لەبەر ئەوە دەگریەم تۆ بۆ پاشا دەبەم بۆ خۆم نیت شاگوڵ شا گووتی: ئەگەر بمزانیایە وایە قەد لەگەڵت نەدەهاتم بەڵام دەبێ هەناسێکت لەبن پێی دەم تۆش سەرت بەعەرزی کەوێ . ئەوجا سواری ئەسپی بوون و لە قەراغ شاری شاگوڵ شای تەسلیمی پاشای کرد . ئەوجا پاشا دیسان ئەو خەڵکەی هەموو دەعوەت کردەوە شاگوڵ شای پەریانی لەنێو باخی دانا ئەوجا حوسێن توجار وەخت بوو دڵی ڕاوەستێ لەخەفەتان . ئەوجا پاشا دەڵێ: خەڵکینە ئەو باخە چی کەمە خەڵکەکە هەموو دەڵێن: هیچی نوقسان نییە. خەڵك دەڕواتەوە پاشا شەو دەچێتە کن شاگوڵ شای پەریان، شاگوڵ شا خۆی بە دەستەوە نادات دەڵێ: پاشا تا ئەسپی ڕەشم بۆ پەیدا نەکەی خۆم بە دەستەوە نادەم گووتی: ئەسپی ڕەش بەکێ پەیدا دەبێ ئەویش دەڵێ ئەسپی ڕەش بەوە پەیدا دەبێ بەوەی کە منی بۆ تۆ پەیدا کردووە، بەیانی پاشا لەدوو ئەحمەدی دەنێرێ دەڵێ: ئەحمەد بە (10)ڕۆژی کە ئەسپی ڕەشم بۆ پەیدا کە دەنا لەسەرت دەدەم، ئەحمەدیش دەڵێ: کوا بەمن پەیدا دەبێ ئەویش دەڵێ: چۆن ئەسپی سورقول و شاگوڵ شای پەریانت پەیدا کرد دەبێ ئەویش ئاوا پەیدا کەی . ئەحمەد بە ناچاری ڕۆیشت چوو مویەکی لە ئەسپی سورقول هەڵکروزاند ئەسپی سورقول گەیشتە جێ گووتی: ئەحمەد چت دەوێ گووتی: دەمەوێ ئەسپی ڕەشم بۆ پەیدا کەی گووتی: ئەسپی ڕەش بە هەموو کەس پەیدا نابێ بۆی هەیە منیش و تۆش تێدا بچین . ئەوجارەکانە گووتی: بڕۆ کودەیەك شەرابم بۆ بێنە . ئەحمەد تەکلیفی لە پاشا کرد کوندێك ئارەقی دایە ، هەتا بردیە ئەو مەنتیقەی ئەسپی ڕەشی لێیە کە گەیشتە وێ ووتی: باخێك هەیە باخی ئەسپی ڕەشە لەو باخەی حەوزێك هەیە ئەسپی ڕەش تەنها لەو باخەی ئاو دەخواتەوە گووتی: ئەو ئارەقەی بۆ لەحەوزەکەی کە بۆ خۆشت خۆ بشارەوە لە چاڵێك دا هەتا سەرخۆش دەبێ ئەگەر سەرخۆش بوو سواری بەو لەباخی بیهێنە دەر ئەگەر بتبینێ هەلا هەلات دەکا منیش و تۆ دەفەوتێنێ چونکە ئەو ئەسپە من دەیناسم ئامۆزای منە . جا ئەحمەد هەستا چوو ئارەقەکەی لە حەوزەکە کرد وەختێکی کە ئەسپەکە پەیدا بوو بۆنی بە ئاوەکەیەوە کرد ئاوەکەی

نەخواردەوە ئەحمەد زۆر دەترسا لە ئەسپەکە بەڵام ئەسپەکە ناچار بوو ئاوی هەر خواردەوە ئەوجا کەوتە لەوەڕ خواردن سکی تێك هەڵدەهات و سەرخۆش بوو هەر دەکەوت و هەڵدەستایەوە سواری بوو وورده وورده هێنایە دەر لەباخی چووە کن ئەسپی سورقول کە چاوی پێ کەوت یەکتریان ماچ کرد ئەوجارەکانە ئەحمەد سواری ئەسپی ڕەش بوو هێنای بۆ پاشای ئەویش تەسلیمی شاگوڵ شای پەریانی کرد، ئەوجا پاشا ووتی: ئەوە ئەسپی ڕەش ئەوجا خۆتم تەسلیم کە ، شاگوڵ شا ووتی: پاشا دەبێ گەوهەری شەوچراخم بۆ پەیدا کەی ئەوجا خۆت تەسلیم دەکەم پاشاش دەڵێ شەوچراخ بەکێ پەیدا دەبێ ئەویش دەڵێ کێ منی بۆ تۆ پەیدا کرد پاشا گووتی: ئەحمەد گەوهەری شەوچراخم بۆ پەیداکە ، ئەحمەدیش ناچار بوو دوو بارە بانگی ئەسپی سەرقولی کردەوە ئەسپی سەرقول گووتی: ها دیسان چیت دەوێ ؟

گووتی: دەبێ گەوهەری شەوچراخانم بۆ پەیدا کەی ئەویش پێی گووت: تۆش دەبێ فەردەك نان و نوقڵم بۆ پەیدا کەی ئەحمەدیش داوای لە پاشا کرد پاشا بۆی پەیدا کرد و ڕۆیشتن ئەسپی سورقول ئەحمەدی فڕاند بۆ ئەو سەری دونیایە بردیە سەر بەحرەکی گووتی: لەو باخە دڕندەیەك دێتە دەرێ فەردە نانەکەی بۆ ڕۆکە با بیخوا گەوهەری شەوچراخەکە لەکن ویە فەردە نوقڵەکەش بۆ من ڕۆکە من لە دوور دەیخۆم ، ئەحمەد چاڵێك بۆ خۆت هەڵکەنە بچۆ ناوی ئەگەر دەستی کرد بە نان خواردن تیرو کەوانەکی لێ دە جا گووتی: ئەگەر بیکوژی گەوهەری شەوچراخمان دەست دەکەوێ ئەگەر نەشی کوژی منیش و تۆش تێدا دەچین ئەحمەد چوو خەندەقێکی هەڵکەند خۆی تێدا مات کرد وەختێکی ئەو دڕەندە هاتە دەر دەستی کرد بە نان خواردن ، ئەحمەد تیرێکی تێ گرت لەبن لاقی دا ئەو دڕەندە بە هەرچوار پەلان هەڵدەپەڕی خۆی لە بەحرێ هاویشتەوە سێ شتی لە زاری بەربوونەوە ئەسپی سەرقول ووتی: ئەحمەد چیت کرد ؟ گووتی: سێ شتی لە زاری بەر بوونەوە خۆی لەبەحەر هاویشتەوە گووتی: خێرا بیانهێنە گەوهەری شەوچراخن هێنانی و گووتی: خێرا سوار بە ئەحمەد گەوهەرەکەی برد بۆ پاشا ، پاشا یەکی لەسەری باخی دانا ئەوی تری لەوسەری باخی دانا ، یەکێکیش لە ناوەڕاست . پاشا هەموو

**عالەمەکەی دوبارە دەعوەت کردەوە ئەوجا گووتی: ئەو باخە چ عەیبێکی هەیە ، خەڵکەکە وەك هەمان جاری پێشوو ڕای خۆیان دەربڕی پاشا گووتی: شاگوڵ شا ئەوجا چ تەکلیفێکت ماوە ئەویش گووتی: هیچ تەکلیفێك لەتۆ نەماوە تەنها یەك تەکلیف نەبێ ئەویش ئەوەیە دەبێ هەموو ماڵێك بارێك دار بێنن ئەحمەدیش بێنن لەسەر دارەکانی دانێن ئەتۆش لەگەڵ حوسێن توجاری لە هەرچوار دەورەیەوە ئاگری تێ بەردەی ئەحمەدی بسوتێنن ، پاشا گووتی: ئەوە بەسیتە دەنگی خەڵکی دا هەموو ماڵێك بارە داری خۆی هێنا ، مەنجەنیقیان بۆ ئەحمەدی دانا ئەحمەدی بردە سەر دارەکان دایان نا جا پاشا ئەمری دا ئاگری تێ بەردەن ، شاگوڵ شای پەریان مویەکی ڕەشی لە ئەسپی ڕەشی هەڵکروزاند فەرمووی ئێستا خەبەر بۆ شای پەریان دەبەی بڵێ ئەو کوڕەی کە چاوی تۆی چاك کردەوە ئێستا وا دەیسوتێنێ پاشا. شای پەریان ئەمری کرد هەموو پەریەك کوندە ئاوێك بە دارەکان دا بکات ئاگر کوژایەوە نەدار سوتا نە ئەحمەد پاشا هیچ چارەی پێ نەکرا . شاگوڵ شا گووتی: بیهێنە خوار ئەوجا پاشا تۆبەو هەموو شارەی ئەحمەدت پێ نەسووتا دەبێ تۆ بچیە جێی ئەو . ئەحمەدیش بە تەنیا ئاگری تێ بەردا پاشا دەڵێ من بەو هەموو شارەی ئەحمەدم پێ نەسووتا پاشا چووە سەر دارەکان شاگوڵ شا بانگی ئەسپی سورقول و ڕەشی کرد گووتی: خەڵکەکەی بەر جوتان دەن بێجگە لە ئەحمەد ئەسپی ڕەش یەك جووتەی لەسەری حوسێن توجاری دا کەلەی پڕژا ئەوجا ئەحمەد بە ئیسراحەت ئاگری تێ بەردا پاشا سوتا ئاگری تێ بەربوو ئەوجا ئەحمەد بوو بەپاشا بەغدا و باخەکەو گەوهەری شەوچراخ و شاگوڵ شا هەمووی بۆ بەجێ ما ئەسپی ڕەش و سورقولی ئیزن دا بۆ جێگای خۆیان بۆ خۆی لەجێگای پاشا دانیشت .**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: پەری و شـای پەریان پژمینی ئەحمەدی تێنو، ئەسپ دەبێتە ڕێوی ، ئەسپی سـورقول، موو هەڵکـروزاندن و ئەسـپی کۆنـە مـرۆۆ و ئەسـپی ڕەش و مـوو هەڵکروزاندن ز**

# باوك و سێ كچەكەی

كۆكردنەوە: تریفە جەمیل حەمید

هەبوو نەبوو، كەس لە خودا گەورە تر نەبوو، دەگێڕنەوە: پیاوێك و سێ كچ هەبوون لە خانیەكی گەورەی دوو قاتدا دەژیان و ماڵ و سامانێكی زۆریان هەبوو. لە ژیانێكی خۆشدا دەژیان لە هەموو جۆرە گیانەوەرێكیان هەبوو وەكو: مەڕ و مانگاو بزن و مریشك و كەروێشك .... هتد گیانەوەرێكی یەكجار زۆریان بەخێو دەكرد و كشتوكاڵیان دەكرد و باخچەیەكی زۆر و زەوەندیان هەبوو ، هەموو كاتێ ئەو پیاو و سێ كچەكەی خەریكی ئیشكردن بوون لەناو ئەم خانووە دا هیچ كاتێ بێ ئیش دانەدەنیشتن. پیرێژنێك لەم خانوەدا هەبوو كەس نەیدەزانی كە دەیویست ئەم سێ كچەو باوكیان لەناو ببات و خۆی ببێت بەخاوەنی ماڵەكە. ڕۆژێك كچە بچووكەكە هەویر دەشێلێت و تەندورەكەی ماڵیان دادەخات بۆ ئەوەی ئەستوك پێوە بدات یەكسەر پیرێژنەكە كچە بچوكەكە دەخاتە ناو تەندورە پڕ ئاگرەكە و سەرەكەی دادەخات و كچە بچوكەكە دەسوتێ، ڕۆژێكیش كچە ناوەندیەكە تەندورەكە دادەخات و تاكو ئەستوك بكات پیرێژنەكە دوو بارە دێتە دەرەوە و كچە ناوەندیەكە پاڵ پێوەدەنێت و ئەویش دەسوتێ . ڕۆژێك كچە گەورەكە ناو تەندورەكە خاوێن دەكاتەوە لەدوای خاوێن كردنەوە هەندێ شتی تیا دەبینێتەوە كە هی مرۆڤە بۆیە بیر دەكاتەوە كە چۆن ئەو دوو خوشكەی لەناو ئەو ئاگرەدا سوتاون بۆیە فێڵێك دەدۆزێتەوە كە ڕۆژێك ئاگرەكە لە جاران زیاتر دادەگیرسێنی و تەندورەكە سور دەكاتەوە و هەویرەكە حازر دەكات پیرێژنەكە زۆر چاوەڕێی دەكات بۆ ئەوەی بە دەردی خوشكەكانی تری ببات بەڵام كچە گەورەكە زیرەك دەبێت و ناڕوات تا پیرێژنەكە ناچار دەبێت خۆی لە تەندورەكە نزیك دەكاتەوە و كچە گەورەكە لە پشتەوە پاڵ بە پیرێژنەكەوە دەنێت و دەیسوتێنێ تۆڵەی هەردوو خوشكەكەی لێ دەكاتەوە، بەڵام باوكیان لە خەمی هەردوو كچە

بچوکەکەی دەمرێت ، بۆیە تەنها کچە گەورەکە دەمێنێتەوە ماڵەکە تەنها لەژێر دەستی ئەو دەمێنێتەوە بەڵام ئەویش بەرێکی ئیش و کارەکانی ماڵەکە جێ بەجێ دەکات تاکو ڕۆژێك کوڕێك لە دەرگا دەدات و دەڵێت مامم لەکوییە ؟ ئەویش هەموو بەسەرهاتی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە کوڕەکەش لەخانوەکە لەگەڵی دەژیاو یارمەتی دەدا تاکو ڕۆژێك کچەکە بەڵێنی پێ دەدات کە شووی پێ بکات ئەویش بەهۆی ڕێك و پێکی کوڕەکەو خو ڕەوشتی تا لە ئەنجامدا خۆیان دەبنە سەر گەورەی ماڵ و بە ڕێوەی دەبەن .

***حەکایەتە و ڕەگەزی ئەفسانەی تێدا نییە .**

# بەسەرهاتێکی ئەفسانەیی

**کۆکردنەوە: چیا زێدان بەکر**

ئەم حیکایەتە لە ڕوداوێکی ڕاستی وەرگیراوە، کە پیاوێکی گوندی (هاوار) لە ناوچەی هەورامان لە ساڵەکانی (1917 . 1918)دەچێتە گوندێکی ئێران ناوی گوندەکە (وڕا)دەبیٚ، کە لە نزیك شاری (پاوە)دەبیٚ ئەم ڕوداوە دەبیستیٚ هەر لەو سالأنەدا کە بەم شێوەیە باس کراوە:

جارێکیان (کێخوا شاوەیس)ئەچێتە دێی (وڕا) لەویٚ لە مەجلیسێك دا کە مەجلیسی پیاو ماقولان دەبیٚ دادەنیشیٚ ئەم پیاوە قسەی ئەو سەفەرەی خۆی دەگێڕێتەوە لە مەجلیسەکەدا، هەر لەو کاتەشدا ئەم ڕوداوەیان لیٚ ئەبیستیٚ یەکیٚ لە پیاوەکان ئەڵیٚ: بەچاوی خۆم بینیومە دوو کوڕ لەم لادێیە دەچنە ڕاو یەکێکیان چوار منالّی ئەبیٚ و لەم سەفەرەی ناگەڕێتەوە هەرچەندە خەڵك ئاگادار دەکەنەوە کە ئەگەر هەواڵیان زانی بێن پێیان بڵێن کەس هیچ شتێك دەربارەی نازانیٚ . ئیتر کابرا هەر وون (بزر)دەبیٚ و ئەوانیش لەبیری دەکەن دوای (5)پێنج ساڵ سەیر دەکەن ڕۆژیٚ شێتیٚ هات بۆ لادێکەیان منالأن دوای دەکەون و دەڵێن شێتیٚ هات . کابراش نازانیٚ قسە بکات ، دەڕوات بەرەو مالّی خۆیان وا لە (مالّی کابرای وون بوو).

سەیر دەکەن ئەم کابرایە هەموو گیانی تووکە جلی لەبەر دا نییە و کە دەچێتە ماڵەوە ژن و منالّەکانی بە قیژە قیژ دەچنە دەرەوە و دەڵێن: شێتەکە هاتۆتە ماڵمان کابرایەکی عاقڵ و ژیر دەڵیٚ : بزانن ئەمە پیاوەکەی خۆتان نییە هاتۆتەوە ؟ ئەوانیش دەڵێن : پیاوی ئێمە نییە و نایناسینەوە ئینجا کابرا دەبەن هەندیٚ لە پیاو ماقولان بۆ لای دکتۆر بۆ (تاران)پاشان حەمامی دەکەن و جلی لەبەر دەکەن دکتۆر دەڵیٚ: هەموو بەیانیەك (ڕۆنی خۆمانەی) بدەنیٚ چونکە (5)ساڵە نانی نەخواردووە هەموو بەیانیەك تۆزیٚ ڕۆنی بدەنیٚ ئینجا با خواردن بخوات . ڕۆنەکەش بۆ ئەوە بخوات ناو سکی نەرم ببێتەوە .

کابرا دوای (40)ڕۆژ زمانی بەردەبیٚ و دەڵیٚ: خوای گەورە هەتا سەری دابیٚ ڕزقی بۆ دەنێریٚ لەهەر کویٚ بێت .

پاشان لێی دەپرسن تۆ لەکوێ بویت و چۆن هەتا ئێستا ژیاویت ئەویش دەڵێ:

وەختێ کە ڕاومان دەکرد کەوێکم کوشت، کەوەکە کەوتە خوارەوە بەناوەڕاستی کەژێکی بەرزەوە بوو ، منیش دوای کەوەکە کەوتم بەناو قەدی شاخێکەوە بوو هەر ئەوەندەم زانی بازێکم برد کەوتمە ناو بیرێك ، ناو بیرەکە زۆر تاریك بوو کە چاوم کردەوە مارێکم بینی لە تەنیشتمەوە کە ئاخیر دەرەجە گەورە بوو زۆر ترسام وتم ئێستا دەمخوات و ختێ (چێشتینگاو)بوو کە دەکاتە سەعات (9)ی سەر لەبەیانی . نیوەڕۆ کاتێ سەیرم کرد سەرکێ پەنیر لەسەرەوە هات کەوتە ناوەڕاستی بیرەکە ئەوەندەم زانی مارەکە هات پەنیرەکەی کرد بە دوو پارچەوە ، پارچەیەکی لووت لێ دا بەرەو من پارچەیەکیشی برد بۆ خۆی .

منیش لەترسانا نەموێرا بیخۆم . پاشان لە ئێوارەوە سەرکێ پەنیری تر هاتە خوارەوە دوو بارە مارەکە کردی بە دوو پارچەوە پارچەیەکی لووت لێ دایەوە بۆ من پارچەیەکی تر بۆ خۆی . بەڵام ئێوارە ناچار بووم خواردم ئیتر لەدوای ئەو پەنیرە نە ئارەزووی هیچم دەکرد نە برسیم دەبوو نەتینوم دەبو نە ... هەتا (5)ساڵ ڕۆژێکیان سەیر دەکەم زرەی زنجیرێك هات لە ئاسمانەوە هاتە ناو بیرەکە سەیرم کرد مارەکە خۆی پێچا لێیەوەو منیش لەگەڵ مارەکەدا هاتمە سەرەوە و ئینجا مارەکە کلکی ڕاوەشاند و کەوتمە سەر زەوی . سەیر دەکەم تابڕەکەم هەر لەجێگای خۆی ماوە و بەڵام دارەکەی ڕزی بوو ئاسنەکەی ژەنگاوی ببوو منیش ڕێگای ماڵم گرتە بەر و گەڕامەوە .

ئەم پەندەش لەم ڕوداوەوە هاتوە کە دەڵێ :

خوای گەورە هەتا سەری دابێ ڕزقی بۆ دەنێرێ لەهەر کوێ بێت .

*** هەر چەندە بەناوی بەسەرهات گێڕدراوەتەوە، بەڵام، ڕەگەزی ئەفسانە بیرو مار و سەرکە پەنیر و هەڵکێشانی مارەکەیە بەزنجیر بۆ ئاسمان.**

# چیرۆكی ئەحمەد

**گێڕانەوە:حاجی عوسمان حوسێن قادر**

هەبوو نەبوو، پیاوەكی دەورەمەند هەبوو كوڕەك و دوو كچی هەبوو كوڕەكەی ناوی ئەحمەد بوو، پیاوەكە لەسەرە مەرگێ دا بوو گاسی ئەحمەدی كرد و پێی گوت: كوڕم چەند نسحەتەكت دەكەم گێم لێ ڕاگرەو بەگێم بكە .
یەك زاڵم بووە پرد پێی لێ مەنێ ، دوو عیسانی سەخی و بووسورمانت خۆش بوێ ، سێ برادەراتی عیسانی ڕەزیل مەكە كاتەك كوڕە بابی مرد و فكری لە نسحەتەكان كردەوە گۆتی:چاكە هەندەكی بە گێ بكەم هەندەكیشی جێ بەجێ نەكەم كابرایەكی دەورەمەند هاتە داخوازی خوشكە گەورەكەی و دایێ و كابرایەكی فەقیریش هاتە داخوازی خوشكە گچكەكەی ئەویشی دایێ و كاك ئەحمەد چوو خۆی كردە برادەری كابرایەكی زاڵم و ستەم كار كابرا پاشا بوو ناویشی شەهاب بوو ڕۆژەك كاك ئەحمەد مێوانی پاشا و ڕۆژەك پاشا مێوانی كاك ئەحمەد دەبوو، كاك ئەحمەد هەر كاتەك چووبایە مارێ پاشای یەك كیلۆ گۆشتی لۆ سەگەكەی دەبرد و پاشا نەعامەكی هەبوو زۆری خۆش دەویست ڕۆژەك كاك ئەحمەد ویستی پاشای تاقی بكاتەوە یەكسەر چوو نەعامەكەی بردە كن برادەرەكی لە دووری شاری و نەعامەكەشی كڕی و بردیە مەتبەقی لۆی سور بكەنەوە گۆتیە كابرای مەتبەقچی كە هیناتەوە مارێ برێ ها ئەوە نەعامەكەی پاشای كاتەك ئەحمەد و ژنەكەی و مندارەكان لەنانی ئێوارێ بوونەوە ئەحمەد ویستی ژنەكەشی تاقی كاتەوە هەندەك گارەگاری لەگەر ژنەكەی كرد و شەقەكیشی لە بنا گوێی دا ژنەكە گۆتی: نەعامەی پاشای دەدزی و لێشم دەدەی كردیە گارەگار پاشاش قەرارەكەی دەركردبوو هەر كەسەك دزەكەم لۆ بگری خەراتی دەكەم لەو قسانەی ئەحمەد ژنەكەی جیرانەكەیان گوێی لێ بوو یەكسەر چوە كن پاشای گۆتی: گەورەم پێت برێم كە

کیٚ نەعامەکەی دزی پاشا گۆتی: دەبریٚ ئەمنیش هەر ئەوەم دەویٚ گۆتی: ئەحمەدی برادەرت .

شورتەی نارد تاکو ئەحمەد بینن کە ئەحمەدیان هینا ئەحمەد لەدری خۆیدا گۆتی: ئیٚستا پاشا وەکو چەند جارە پیٚشوازیم لیٚ دەکا بەرام کاتەك کە گەیشتە پاشا پاشا خۆشی تیٚ نەگەیاند پاشا سەگەکی هەبوو زۆر ئازا بوو رکی لە هەرکەسەك ببایەوە دەیکردە ژووری سەگەکەی هەلا بە هەلای دەکرد و دەیخوارد بەرام کە پاشا ئەمری کرد ئەحمەد لە ژووری سەگەکە بکەن سەگەکە کە چاوی بە ئەحمەد کەوت یەکسەر کلکی باداو وای زانی دیسان گۆشتی لۆ هینایە بەرام ئەحمەد زۆر دری توند بوو بەوەی کە پاشا لەگەری کرد یەکسەر خەوی لیٚ کەت . هەتا سبەینیٚ کە شورتەکان هاتن لۆ ئەوەی ژۆرەکەی خاویٚن بکەنەوە لە هیٚسك و پروسك بەرام کە هاتنە ژوریٚ چ ببینن ....! یەکسەر چونە کن پاشای تاکو ئەو حارەی لۆ بگیٚرنەوە !

کاتەك کە پاشا ئەوەی دیت سەری سورما !

ئەوجارە گۆتیە ئەحمەد دەبی شەش سەد حوشترم لۆ بینی جەزای ئەو نەعامەی کاك ئەحمەدیش بریاری دا بچتە کن زاوا دەورەمەندەکەی هەتا شەش سەد حوشترەکەی پەیا بکا کە چوو دیتی زۆر رەزیل بوو هیچ یارمەتی ئەحمەدی نەداو گۆتی: تەنها دەتوانم یەك بزنت بدەمیٚ گۆتی: ئەمن لۆ شەش سەد حوشتری هاتیمە ئەتو دەریٚی یەك بزن هەستا یەکسەر لیٚیدا رۆیی چوە کن زاوا فەقیرەکەی گۆتی: کیٚشەکی ئەوهام بەسەر هاتییە نازانم چ بکەم زاوا فەقیرەکەی پیٚشوازیەکی باشی لیٚ کرد کە یەك حوشتری هەبوو گاسی سیٚ چوار پیاوی کرد تاکو حوشترەکەی لەگەر سەر ببرن ئالاٚیەکیشی لەسەر گرد چەقاند عادەتی ئەو شارەی ئەوها بوو ئەگەر ئارایەکیان بچەقاندبایە لەسەر گرد ئەوا هەر کەسەك خۆی بە پیاو ماقول و گەورە بزانیبایە بە هاواریەوە دەچو .

شیٚخەکان و پیاو ماقولەکان گۆتیان چ قەوماوە پیاوە فەقیرەکە گۆتی: کیٚشەیەکی وامان لیٚ قەوماوە بە شیٚخەکان و پیاو ماقولەکان شەش سەد حوشتریان لۆ ئەحمەد تەواو کرد ئەو پەنجا حوشتر و ئەو سەد حوشتری دا

ئینجا ئەحمەد گەڕاوە کن زاوا دەورەمەندەکەی و گوتی: چیت دەویٚ؟ گوتی: ئەم بزنە . بزنەکەشی هێناو نەعامەکەشی لەکن برادەرەکەی هێناوە و هاتەوە شاری خۆی حوشتری بە ناوشاری وە کردنەوە هەموو خەرکەکە ڕێیان لە کاك ئەحمەد گرت بەرام کاك ئەحمەد گوێی نەدانیٚ گوتی: (تاکو نەچمە سەر گردەك یا جێیەکی برند و چەند قسەیەك نەکەم ئەمن حوشترەکان ناگەڕێنمەوە)کاك ئەحمەد چوە سەر جبیەکی برند و ڕووی لە خەرکەکە کرد ئەوجا دابەزییە سەر پاشا گوتی: سەگ باشترە لە پاشا ئەمن چەند سارە لەگەر پاشای برادەرم بەرام پاشا ئەمنی سزا دا سەگەکە ئەمنی عەفو کرد ئینجا پاشا گوتی: بەسە ئەحمەد ئەمنت ڕیسوا کرد وە گۆتیە وەزیرەکان چی لۆ ئەحمەد بکەم تاکو ڕازی بی گۆتیان: ئەحمەد دەورەمەندە لۆ ژنیش ئەوە ژنی هەیە وەزیرەکان لەسەر ئەوە قایل بون کە هەر حوشترەك یەك تەن قوماشی تیٚ ئالێنن ئەوجا فەرمانی دا یەك مەتریش لە بزنەکە ئالێنن ئەوجا ئەحمەد هاتەوە کن زاوا دەورەمەندەکەی گوتی: ئەم هەموو حوشترەو حەریرە چییە ئەدی هەندەکم نادەییٚ گوتی: تەنیا بزنەکەت ببەوە چەند مەتر حەریر لە بزنەکەی ئارایە هەر ئەوەندە بەشی تۆیە .

ئینجا هاتەوە کن زاوا فەقیرەکەی گوتی: ئەو هەمو حەریرە چییە گوتی: هەمو حوشترەکان بدەوە ساحێبەکانیان شێخەکان و پیاو ماقولەکان گۆتیان هەدیە وەرناگیرێتەوە گوتی: مادام وایە هەر کەسەك حوشتری خۆی جودا بکاتەوە و حەریرەکان لیٚ بکاتەوە حوشترەکانیش هەموو بوە مرکی زاوا فەقیرەکەی ئەمنیش لەو لا هاتمەوە و سەرکە پیازێکیان دامیٚ.

***ئەمەش لە حەکایەتی هەیاسی دەچێت، بەڵام، گۆڕانی بە سەردا هاتووە.**

# حیکایەتی بەرئاگردان

**کۆکردنەوە: خەدیجە ئەحمەد کەریم**

هەبوو نەبوو، پادشایەك هەبوو، ئەو پادشایە یەك کچی زۆر جوان و قەشەنگی هەبوو، ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو پادشایە بڕیار دەدات بچێتە حەجێ، ئەو پادشایە عەبدێکی دەبێت، کاتێك خۆی ڕێك دەخات بۆ حەج کچەکەی لە غرفەیەك دادەنێ و ئەو کچە لە غرفەیەکدا دەبێت، ئەو غرفەیە دەلاقەیەکی تیادا دەبێت، باوکی عەبدەکە ئاگادار دەکاتەوە کە هەموو ڕۆژێك نانێك و قاپە دۆیەکی لەو دەلاقەیە بۆ کچە ڕەوان بکاتە ژوورێ. کاتێك باوکی کچەکە دەڕوات بۆ حەج و دەگاتە حەجەکە پادشا بڕیاردەدا حەجەکەی بەباشی فەرزەکانی جێ بەجێ بکات، عەبدەکە کاتێك تێگەیشت کە باوکی گەیشتۆتە حەج دەرگای ژووری کچەکە دەکاتەوە و دەچێتە ژوورێ و داوای لێ دەکا کە ئیشی خراپی لەگەڵدا بکا. بەڵام، کچە پادشایەکە ڕازی نابێت بۆیە عەبدەکە دەری دەکات و کاتێك باوکی لە حەج دەگەڕێتەوە عەبدەکە خۆی لە قوڕ دەنێت و بەرەو پیلی پادشا دەچێ و پێی ڕادەگەیەنێ کە کچەکەت خراپ و بێ ئەدەب بوە بۆیە باوکی داوا لە کچەکەی دەکات کە بڕوات. بەڵام نای کوژێ ، کچەکەش دەڕوات و دەڕوات تا دەگاتە لای سێ ڕەشماڵ ڕەشماڵی یەکەم یەك ئەستونە ڕەشماڵی دووەم دوو ئەستونە ڕەشماڵی سێیەم سێ ئەستونە کچە بڕیار دەدات بچێتە ڕەشماڵی سێیەم و دەڵێ: هەر خۆری ئاگردانی گەورە بەخوداکەی لە ئاگردانی گچکە باشترە. ئەو ڕەشماڵەی کە سێ ئەستونە کچەکە دەچێتە ئەو ڕەشماڵ ئەو ڕەشماڵیش پیرەمێردو پیرێژنێکی لێ بوو کە یەك منداڵیان هەبوو، ئەو منداڵەش کوڕ بوو کوڕەکەش تەمەنی بچوك بوو دایك و باوکی کوڕەکە واتە پیرەمێردو پیرەژنەکە داوا لە کچەکە دەکەن، کە ڕۆژێ دەرسی قورئان بە کوڕەکە بڵێ، کە کچەکە دەرسی قورئانی دەزانی بۆیە کچەکەش ڕازی دەبێ کە قورئان بە کوڕەکە بڵێت و لە ماڵیان بمێنێتەوە ئەوانیش پێیان خۆش بوو، بەڵام ئەم ماڵەش عەبدێکیان دەبێ دیسان ئەو عەبدەش داوای کاری خراپ لە کچەکە دەکات بەڵام کچەش ڕازی نابێت بۆیە

عەبدەکەش هەڵدەستێ دەچێ سەری کوڕەکە بە چەقۆیەك دەبڕێ و چەقۆیە بە خوێنەکە لەباڕکی کچەکە دادەنێ، کاتێ سبەینە دێ و لە خەو هەڵدەستن دەبینن کوڕە سەربڕاوە عەبدەکەش دەڵێ: بگەڕێن بزانن ئەو چەقۆیەی کە سەری کوڕەکەی پێ بڕاوە لەباڕکی کێیە کاتێك دەگەڕێن چەقۆکەی لە باڕکی یان گیرفانی کچەکە دەردەهێنن. بۆیە پیرەمێرد و پیرێژن دەڵێنە کچەکەی نات کوژین. بەڵام لەبەرچاومان بڕۆ بۆیە کچەکەش دەڕوات و دەگاتە دەشتێك لەو کاتەشدا کوڕە پادشایەك بۆ ڕاو شکاری هاتۆتە ئەو دەشت و جێگایە کە ئەو پادشایە تاژی و تولەو شتی تریشی پێیە بۆ ڕاو کردن لەو کاتەدا ئەو تاژی و تولانە بۆنی کچەکە دەکەن و دەگەنە لای کچەکە پادشاکەش بەدوای وان دا دەچی و دەبینێ کچێکی لیباس دڕاویە لەم دەشتەو لێی دەپرسێ ئەوە لێرە چی دەکەی؟ ئەمیش دەڵێ من بنیادەمم و ڕێم بەم شوێنە کەوتووە بەڵام شمەکم زۆر خراپ و دڕایە داوا لە کوڕە پادشا دەکا کە عەبایەکی سەر شانی بداتێ و بیباتەوە ماڵی خۆیان. ئەویش دەیباتەوە ماڵێ و دەیباتە لای دایکی و دەڵێ: با ئەم کچە لەماڵی ئێمە بمێنێتەوە خزمەت بکات و هەندێ جل و بەرگی پێ بدە ئەمیش واتە دایکی هەندێ جل و بەرگی پێ دەدات .

کەلەو کاتەشدا کوڕە پادشا بڕیاری داوە ژن بهێنێ بۆیە باوکی کوڕە پادشا واتا پاشا خۆی داوا لە خەڵك دەکات هەرچی کچی جوانی هەیە بیڕازێنێتەوە و بیهێنێتە شایی بۆیە بۆ ڕۆژی دواتر خەڵك هەموو کچی خۆیان دەڕازێننەوە و دەیهێننە شایی بۆ ئەوەی کوڕە پاشا هەڵیان بژێرێ لەو کاتەدا کچەکەش کە لەماڵی کوڕە پاشایە ئەمیش خۆی بەدزیەوە دەڕازێنێتەوە و دێتە شایی کاتێك کوڕە پادشا چاوی پێ دەکەوێت شێت دەبێت و دەڵێ: من هەر ئەو کچەم دەوێ. کاتێك شایی تێك دەچێ کچەکەش دەچێتەوە ماڵی کوڕە پادشاکەو لەلای خزمەتکارەکان خۆی وەکو جاران ناشیرین دەکاتەوە وە شمەکی دڕاو و کۆنەکە لەبەر دەکات کاتێك بۆ کوڕە پادشا ئەو شارە دەگەڕێن کچەکە نادۆزنەوە و نازانن لەماڵی کوڕە پادشایە بۆ ڕۆژی دواتر جارێکی تر ئاهەنگ گەرم دەکەنەوە بۆ ئەوەی کچەکە بدۆزنەوە دیسانەوە کچەکە خۆی جوان دەکاتەوە و لەگەڵ کچانی شار دەچێتەوە شایی لەم کاتەدا کوڕە پادشا

جارێکی تر دەیبینێتەوە. بەڵام دوای تێك چوونی ئاهەنکەکە کچەکە جارێکی تر خۆی دەگۆڕێتەوە دەچێتەوە ژووری خزمەتکارەکان و پاسەوان و دەست و پێوەندەکانی شاش بەدوای دا دەگەڕێن بۆ ئەوەی بیدۆزنەوە دیسان لەشار نایدۆزنەوە بۆیە بڕیار دەدەن ماڵی کوڕە پادشاش هەمووی بگەڕێن کەلەو کاتەدا کچەکە لەوێ دەدۆزنەوە و کوڕە پادشا دەکەوێتە بەر دڵی و دەیگوازێتەوە کە ئەم کچە سێ کوڕی لەم کوڕە پاشایە دەبێت، ڕۆژێك کچەکە بەم کوڕە پاشایە دەڵێ: غەریبی ماڵی باوکم دەکەم و دەمەوێ بچمەوە سەردانیان. بۆیە ماڵی کوڕە پادشاش بڕیار دەدا کەژاوەی بۆ بڕازێننەوە پاسەوان و خزمەتکاری لەگەڵ دا بنێردرێت و عەبدێکی لەگەڵ دەنێردرێت کاتێك بەڕێ دەکەون و دەگەنە شوێنێکی چۆڵ عەبدەکە داوای کاری خراپ لەگەڵ کچەکە دەکات. بەڵام کچەکە ڕازی نابێت بۆیە شەوی یەکەم کچە ڕازی نابێت عەبدەکە کوڕی یەکەمی دەکوژێ. بۆ شەوی دووەم دیسان ڕازی نابێت عەبدەکە کوڕی دووەمی دەکوژێت، بۆ شەوی سێیەمیش ڕازی نابێت کوڕی سێیەمی دەکوژێت. بۆ شەوی چوارەم داوای لێ دەکات شووی پێ بکات ئەگینا ئەو دەکوژێت. ئەویش واتە کچەکە فێڵی لێ دەکات و دەڵێ هەندێ مووم بەدەستەوەیە دەچم لەپشت ئەو گردە لێی دەکەمەوە عەبدەکەش ڕازی دەبێت کچەکەش یەکسەر هەڵدێ و دەڕوات کاتێك عەبدەکە چاوەڕێ دەکات نایەتەوە دەگەڕێتەوە لای پادشا بەخۆی و پاسەوان و خزمەتکارەکانی و بەپاشا ڕادەگەیەنێ کە کچەکە کچێکی خراپ بووە و هەڵاتووە کچەکەش دەڕوات و خۆی دەکاتە پیاو خۆی دەکاتە حەکیم و لوقمان کە لەوکاتەی لە دەشتەکەدا دەڕوات دەگاتە خدری زیندە و هەندێ خۆڵی دەداتێ دەڵێ: هەرکەسێ نەخۆش بێ ئەم خۆڵەی لەسەر نەخۆش و برینەکە ڕوو بکرێ چاك دەبێتەوە کچەکەش خۆی دەکاتە حەکیم و لوقمان بەشارێك دا دەڕوات کە پاشای ئەم شارە گڕوو بووە بۆیە داوای لێ دەکەن ئەگەر پێی چاك دەبێت با بێتن ئەمیش بڕیار دەدات چای بکاتەوە بۆیە خۆڵەکە بە هەموو گیانی پادشا دەپڕژێنێ پادشا چاك دەبێتەوە و بڕیار دەدات لەجێگای خۆی دایبنێ ئینجا خۆی ئاشکرا دەکات کە کچە لەم کاتەشدا هەرسێ عەبدی کە بوختانیان پێ

کردووه چاویان کۆره بووه واته عەبدی ماڵی باوکی و عەبدی پیرەمێرد و پیرێژن و عەبدی ماڵی کوڕە پادشا ئەو ماڵانەش کاتێك ناو بانگی ئەو حەکیم و لوقمانە دەزانن هەریەکە عەبدەکانیان دەهێنن بۆ ئەوەی چاکیان بکەنەوە کچەکەش هەر کە عەبدەکان دەبینێ دەیان ناسێتەوە و بەڵام داوایان لێ دەکات لە هەریەکەیان لە پێش چاوی ئەوانەی واتە باوکی و پیرەمێرد و پیرێژن و مێردی کە کوڕە پادشا بوو هەر یەکە چی کردووە بیگێڕێتەوە و ئەنجا چاکی دەکاتەوە ئەوانیش هەریەکە واتە عەبدەکان چ کارێکیان لەگەڵ کچە پادشا کردبوو بەو بوختانانەی کە پێیان دا کردبوو گێڕایانەوە ئینجا کچەکە بە تەواوی خۆی ئاشکرا کردوو بە باوکی و پیرەمێرد و پیرێژن و کوڕە پادشای مێردی ڕاگەیاند کە ئەوانە چیان لەگەڵ دا کردووە بۆیە باوکی و کچە بەیەك شاد بوونەوە وەلەگەڵ پیرەمێرد و پیرێژن و کوڕە پادشای مێردی بەیەکتر شادبوونەوە تێگەیشتن کە کچێکی چەند بە کەرامەت و باش بووە منیش کراشم دڕا و هیچم پێ نەبڕا .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە:خدری زیندەو خۆڵی دەرمانە ، کەنەخۆش و برینان چاك دەکاتەوە .**

# فاتمە

**کۆکردنەوە: دیمەن ناسیح مەحەمەد**

**گێڕانەوەی حیکایەتی یەکەم و دووەم: سەڤین مەحەمەد عەزیز**

هەبوو نەبوو، کچێکی جوان هەبوو، ناوی(فاتمە)بوو. باوکی ناوی ئەحمەد بوو. دایکی فاتمە ئەمرێت و فاتمە لەگەڵ باوکی لەماڵەوە ئەبێ هەتا دوو مانگ سێ مانگ بەیەکەوە لەماڵن هەر لەو شارە پاشایەك ئەبێ کوڕەکەی ژن دێنێ کچەکە ئەچێتە شایی بەرگەکەی دایکی ئەکاتە بەری بازنگەکەی دایکی کە ئاڵتونە ئەیکاتە دەستی کە جلەکە و ئاڵتونەکەی دایکی پڕ بە بەرو دەستێتی و دایکی پێش ئەوەی بمرێ وەسیەتی کرد بۆ باوکی فاتمە کە جلەکانی بەبەر هەریەکێك کرد دەبێ ئەو کەسە بێنێ کە ئێوارە دێنەوە لەشایی باوکی شەیتان ئەچێتە کەلەی وئەڵێت باقسەی دایکی نەشکێنم پەلاماری کچەکەی خۆی ئەدا کچەکە باوکی دێ بۆ لای ئەڵێت باوە من کچی تۆم من جەرگی تۆم باوە چۆن ئەتوانی تۆ پەلامارم بدەی. باوکی ئەڵێت:من وەسیەتەکەی دایکت ناشکێنم بازنگەکە پڕ بە دەستە و جلەکەش پڕ بە بەرتە کچەکە ئەڵێت باوە هەتا دەرەوە ئەچم باوکی ئەڵێت: دوایی بزر نەبی و ڕاکەی لە دەستم کچەکەش ئەڵێ: باوە تۆ شریتێ بخە دەستم سەرێکی با بەدەستی تۆوە بێ سەرێکیشی عەیب نەبێ با بەدەست من بێ هەر بەو جلەی دایکی ئەچێتە دەرەوە . کچەکە بە هێواشی پەتەکە لەدەست خۆی ئەکاتەوە و ڕائەکا باوکی پەتەکە ڕائەکێشێ ئەبینێ کچەکە نەماوە شەوە ئینجا کچەکە ئەڕوا ها لێرە ها لەوێ ئەچێتە شارێکەوە هەڵ ئەستێ ئەچێتە لای نەجاڕێ ئەڵێ : نەجاڕەکە نەجاڕەکە ئەڵێ ها ئەڵێ دارێکم کە کچەکە ئەڵێ تەنگ بۆ تاشە وەك کراسەکەم تەنگ ئەیکەمە بەرم کراسەکەی بۆ ئەکاو لەبان کراس و ئاڵتونەکەوە ئەیکاتە بەری ئینجا ئەچێ بۆ لای قەسابەکە ئەڵێ : قەساب یەك گەدگێك لەو گەدکانەم بدەیە قەسابەکەش ئەیداتێ و کچەکە ئەیتوانەوە و وەك کڵاو ئەیکاتە سەری (کچەکە خۆی زۆر جوان ئەڵێ وە زۆر لایت ئەڵێ)کچەکە ئەڕوا بەناو بازاڕدا ئەڵێ کێ خزمەتکاری ئەوێ تا تکێ نان بۆ خۆم پەیا کەم پیاوێك ئەڵێ:

کچە تۆ پیاوی یا ژن ئەویش وتی: نە ژنم و نەپیاوم و من کچم عازەبم دەوێتم بچمە ماڵێ گەورە خزمەتکاری بکەم ئینجا پیاوەکە ئەیبا بۆ ماڵی پاشایەکی تر کە پاشان ئەڵێ ئەم کچەم هاوردوە ئەڵێ: من کەسم نیە برام نیە لێم قەوماوە ماڵ ئەم پاشایە ئەگەر بە خزمەتکاری ئەوترێ تیکەیە نان ئەخۆم و خزمەتکاری ئەکەم و خزمەت ئەو ماڵە ئەکەم ئەگەر بمگرن بە خزمەتکاری پیاوەکەش وا کچەی هێنا تا بێتە خزمەتکاری هەر پیاوی پاشایە جا خزمەت چییە قاوەچی بە نازانم ژن پادشا دێتە دەرەوە ئینجا کچەکە ئەبەنە ماڵیان و بە ئەدەب و سەلار ئیش ئەکا و سێ مانگ لەوێ ئەبێ کچەکە بەس هەشت پەنجەکەی دیارە بەڵام واستەی ئەکەن وەك ئەم کاغەزە سپی ئەبێ کچەکە هەمو ڕۆژێ نان بۆ کوڕی پاشا ئەبا کە نان ئەبا کوڕەکە سەیر پەنجەکانی ئەکا ئەڵێ ناسکە هەرمێیە بە دایکی ئەڵێ: دایە دایکی ئەڵێ: ها کوڕەکە ئەڵێ دایە وەرە بە فێڵ ئەم کچە خزمەتکارەی خۆمان بەرە باخۆی بشوا ژنە پاشا بە کچە خزمەتکارەکە ئەڵێ من ئەچمە سەر کانی لەبن دارێکە دارەکە گەڵێ گەورەیە کانی لێیە ئیتر کوڕەکە ئەڵێ وایە ئێوە خۆتان بشۆن من لەبان دارەکە وە دائەنیشم سەیرتان ئەکەم تۆش کچەکە بەرە با خۆی بشوا کوڕەکە لەپێش دایکی و خزمەتکارەکە ئەچێتە بان دارەکە ئەمانیش شت ئەبەن و ئەچنە بنی دارەکە کچەکە ژن پاشا ئەشوا ئاغا ژن پاك پاك ئەشوا ژنە ئاغا یان ژن پاشا ئەڵێ فاتمە کە کچە خزمەتکارەکەیە نۆرەی توە تو خۆت بشۆ کچەکە ئەڵێ: ناوەڵڵا من پیس نیم خۆم ناشۆم ئەویش ئەڵێ: بەخوا ئەبێ خۆت بشۆی ئاخیرەکەی ژن پاشا ئیخفالی ئەکا ئینجا کچەکە خۆی ڕووت ئەکاتەوە کوڕەکە لە بانەوە سەیر ئەکا بازن و کەل مەل ئاوریشم لەبەری کراسە دارەکە و گەوکەکە لەبان سەری ئەکاتەوە پرچی زۆر درێژە وە کوڕەکە ئەوها حوببی ئەچیتە سەری کوڕەکە ئەبوورێتەوەو بەرەبێتەوە ناو کانی ئاوەکە کچەکە نازانێ لەبەر ئەو وای لێ هاتووە . ئینجا کچەکە لە تاوا نەخۆیەشوا گەدکەکە ئەکاتەوە سەری و دارەکە ئەکاتەوە بەری کچەکە ئەزانێ لەبەر ئەم وای لێ هاتوە بەڵام بەسەر خۆی ناهێنێ ئینجا خزمەتکارەکان کوڕەکە ئەبەنەوە های کوڕە بۆ وای لێ هات کچەکە و ژنەکەش (ژنە پاشا)ئەچنەوە و کچەکە وەك

جاران بۆ خۆی ئیش ئەكات و بەسەر خۆی ناهێنێ كە كوڕەكە عەشقی بووە كوڕەكە چاك ئەبێتەوە ئەڵێ : ئیللا من ئەم كچە خزمەتكارەی خۆمانم ئەوێ بە باوكی ئەڵێ باوكیشی ئەڵێ من كچە وەزیرت بۆ دێنم ئەمە خزمەتكارە بەیانی دەرێكەم كوڕەكە ئەڵێ باوە ئیلا من هەر ئەمەم ئەوێ دایكی كوڕەكە بە باوكی كوڕەكەی (پاشا)ئەڵێ هەر ئەو كوڕەمان هەیەو با دڵی نەشكێنین دەڵێ هەر ئەمەم ئەوێ پیاوەكەش (پاشا)ئەڵێ عەیبە ئێمە پاشاین چۆن خزمەتكار بێنین كوڕە وتبووی عەیب بێ و عەیب نەبێ هەر ئەمەوێ خۆمن بۆ خۆم ئەیهێنم كچەكەش ئاگای لێ نیە كەوا باسی ئەو ئەكەن نازانێ كوڕە لە سەینی ئەم وای لێ هاتوە مشاوەرە ئەكەن لە ماڵی خۆیان ئیتر ژنە پاشا ئەكەوێتە بن دەست و پای و ئەڵێ كچەكە تۆ كچی یا ژنی كچەكە ئەڵێ ناوەڵڵا من كچم و ژن نیم و لێم قەوماوە و ڕام كردوەو گەیشتمە ماڵ ئێوە  ئەڵێ بۆ نایەی شو بكەیتە كوڕەكەم كچەكەش ئەڵێ ئاغا ژن من فەقیرم و كەس نامناسێ خزمەتكارم من كوڕ ئاغایان نەوتوە شو بكەم پێی ئاغاژن ئەڵێ: كچەكەم ئێمە دڵمان تۆی گرتووە و سێ چوار مانگە لەلامانی كوڕەكەم ئەڵێ ئیلا من ئەم كچەم ئەوێ كچەكەش ئەڵێ من شوی پێ كەم بەس نابێ ئەم بڵێ من كوڕە پاشام و تۆ خزمەتكاری خواستوتمە ئینجا كچەكە گفت ئەدا شوی پێ بكا كوڕەكە مەلا دێنی و خەڵك خڕ ئەكاتەوە خزمەتكار مارە ئەكا هەڵەسن ئەیبەن بۆ حەمام بەرگێ جوان و قۆز لەبەری ئەكەن بازنەكەش هەر لە دەستی ئەبێ ئوەندە جوانە هەتا پاشاش خۆی عەشقی ئەبێ ئیتر حەوت شەو و حەوت ڕۆژ ئاهەنگ ئەگێڕن كچەكە بۆ كوڕەكە دێنن و دەوڵ و زوڕنای بۆ كوتن و كوڕە و كچە بەیەك شاد ئەبن ئینجا كچەكە ئەبێتە بووك پاشا ئینجا دواین عەیب نەبێ بووكە حەملی ئەڵێ كوڕ و كچێكی بەزگێك ئەبێ دوای مانگێك كوڕە و كچەكە سەروقنگ ئەیانخەوێنن لەناو هێل بێشك ئێوارانێ فەقیرێ دێتە قاپیەكە كچەكە سەیر ئەكا باوكیەتی وا لەدوای ئەگەڕێ كچەكە ئەڵێ دەری كەن باوكی ئەناسێ ئاغاژن ئەڵێ دەری مەكەن قەیچێكە دۆم با لێرە بێ ئەڵێن ئیشەكە وەهارێك كەوتوە پیرە پیرەژنەكە ئەم سواڵكەرەی هاوردە ماڵەوە كچەكەش لەدڵ خۆیا ئەڵێ : ئەم باوكمە ئەم شەو كەتنێكم پێ ئەكا پیرەژن (دایكی كوڕە/ژنە

پاشا) ئەیهێنیتەماڵەوە و حەوشەیە گەورەو گرانە شەوی بەسەرادیٚ کچەکە لەتەك مناڵەکانی ئەخەویٚ باوك کچەکە شەو بە دزە دیٚ بۆ سەر هەردوو مناڵەکە قەڵەم بڕی پێیە دێنیٚ مناڵەکانی پیٚ سەر ئەبڕیٚ و چەقۆکە یان قەڵەم بڕەکە ئەکاتە بن سەری مناڵەکان هەتا خەڵك و ماڵی پاشا بڵێن دایکی مناڵەکان مناڵەکانی سەربڕیوە بەیانی هەڵەسن نان ئەخۆن سواڵکەر(باوکی کچەکە)ڕۆیوە کچەکەش (ژنی پاشا)ئەڵیٚ ئەلحەملا ڕۆیوە و باوکم هیچی نەکرد مناڵ هەر هەلناسیٚ کاتیٚ بان سەریان ئەکاتەوە ئەبێنیٚ هەردوکیان سەر بڕاون هاوار ئەبەن بۆ پاشا و کوڕ پاشا ئەڵێن پاشا خواو ڕاستان کاشەو هەردو مناڵەکە سەر بڕاون ماڵی پاشاش پێی ئەڵێن: تۆ سەرت بڕیون و هەردوو مناڵەکە ئەوەنە چل شانی ژنی کوڕپاشا و دەری ئەکەن بەڵاّم مناڵەکان سەریان بەقەدیەوە ماوە ژنەکە ئەڕوا هەر ئەگیریٚ هەر ئەڕوا ئەگاتە چیایەك دارتویەك لەبانیەتی واتە لەبان ئەشکەوتەوە ژنەکە ئەچێتە ئەشکەوتەکەوە بە مناڵەکانەوە وە بە عەمری خودا هەردوکیان زیندو ئەبنەوە دایکەکە بە مەمکێکی شیر ئەداتە کوڕەکە و بەوەی دیکە ئەیداتە کچەکە هەتا ئەو مناڵاّنە گانگۆڵە ئەکەن هەر لەویٚ ئەمێنێتەوە مناڵەکان پا ئەگرن و ڕوتن و دایکیان ڕوتە ڕۆژێك قافڵە دێن نان ئەخۆن لەویٚ قافڵەکان دایکەکەیان نەدیوە بەڵاّم مناڵەکانیان دیوە ئەم قافلاّنە لاقەی مناڵەکان ناکەن خواردن بەجیٚ دێڵن بۆیان و مناڵەکان ئەیبەنەوە ناو ئەشکەوتەکە بۆ دایکیان هەتا ساڵێك و سیٚ چوار مانگ ئەم دایکە لەگەڵ ئەم دو مناڵە ئەمێنیتەوە بە ئیرادەی خوا باوك دو مناڵەکە (کوڕ پاشا)دڵی ئەسوتیٚ بۆیان و دێتە لای ئەو چیایە و ئەو قافلاّنە دێن لەگەڵ سیٚ سوارا تانجی و تولە دێنن و ڕاو بکەن کوڕەکە (کوڕ پاشا)دا ئەنیشیٚ شت بخۆن و ئەیبەنە ژورەوە و بەردەمیان ئاوە ئەو سوارانە و باو مناڵەکان ئەو دو مناڵە ئەبینن کوڕەکە ئەمەندە دڵی ئەسوتیٚ هەڵ ئەستیٚ و دیٚ بۆ ئەشکەوتەکە سەیر ئەکا ئەم دو مناڵە دێنە دەرەوە چنگ لە گیایەکە ئەدەن و ئەچنە ژورەوە ئەم جارە باوکیان یەکێکیان ئەگریٚ و مناڵەکە ئەزیرێنی دایکی لە ماڵەوە ئەوریقێنیٚ ئەڵیٚ چیان لیٚ هات وەرنە ژورەوە پیاوەکە سەیر ئەکا ژنەکە ڕووت و قوتە و پرچی لەبان گیانیەتی و هەردو مناڵەکە ڕووتن

ئینجا باوکی دێتە قاپییەکە ژنەکە ئەڵێ باوکەکەم من ساڵێك و سێ مانگە لێرەم چیت لێمان ئەوێ کوڕە پاشا ئەڵێ (کە دیارە نایناسێ)من پرسیارێك ئەکەم منالّەکانت دێنە بن باخەڵی دایکیان و پرچی دای پۆشن. ژنەکە ئەڵێ: چیت ئەوێ. کوڕە پاشا ئەڵێ: توخوا قسەکی دڵی خۆتم بۆ بکە تو چی ئەکەی بەم دو منالّە ژنەکە نای ناسێتەوە ژنەکەش ئەڵێ باوکم وازمان لێ بێنە کوڕەکەش ئەڵێ: من واز ناهێنم تا بۆم نەگێڕیتەوە. ژنەکەش ئەڵێ: من شوم کرد بە کوڕێك دوو منالّم هەبوو سوالّکەرێك هات باوکم، بوو، لەدەست باوکم ڕام کردو هەردوو منالّەکەم باوکم سەری بڕی و ڕۆیشت منالّەکەیان دایە چك شانما و دەرمیان کرد لە شارەکە منیش بە هەردوو منالّەکەم هاتمە ئەم ئەشکەوتە ئێستاش وا لێرە لەگەڵ ئەم دوو منالّەیا ئەژیم باوکەکە کوڕە پاشا یەکسەر پەلامار هەردوو منالّە و ژنەکەی داو چاکەت یان عەباکەی دایە بان ژنەکەیاو سوارەکانی بانگ کرد ماینەکەم بۆ بێنن بردیانیەوە بۆ شارەکە و حەوت شەو و حەوت ڕۆژ دەوڵ و زوڕنایان بۆ کوتا .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: تەنیا زیندووبوونەوەی کچ و کوڕە سەربڕاوەکەیە.**

# ئەو بوكەی بوو بە گورگ

**پاشایەك كوڕێكی ئەبێ ناوی (مەحەمەد)ئەبێ ژن بۆ كوڕەكەی دێنێ (نەجیم ڕوان) (تێ ڕوان) پێی ئەڵێ: پاشا ژن بۆ محمد بێنی ئەوەل شەو گورگ ئەیخوا پاشا گوێی نەدایە هەستا ژنی بۆی هێنا وتی (نەجیم ڕوان) درۆكا و لەنەعبێن دوو بەحر خانویەك بۆ كوڕەكەی دروست ئەكا شایی و زەماوەند بۆ كوڕەكەی ئەكا لەگەڵ لەشكر و پاشا زادە شایی بكا بۆ كوڕەكەی وتی بووكی كردە باخل كوڕی و چواردەورەی قەسرەكەی گرت بە لەشكر خۆی بووكە و مەحەمەدیشی (خەجیج و مەحەمەدیشی)كردە ماڵەوە پاشا خۆی لەبان نەختێك دانیشتبوو سەیری قەسرەكەی كوڕەكەی ئەكرد بزانێ قسەكەی نەجیم ڕوان ڕاستە یان درۆیە هەر چاوەڕێی كرد هەر چاوەڕێی كرد كوڕ نەهاتە دەرەوە لە پێش قاپی خەڵك ڕاوەستاوە كوڕ بێتە دەرەوە بۆ ئەوەی قسەی نەجیم ڕوان بزانن ڕاستە یان درۆیە كاتێ چون قاپیان كردەوە بووكەكە بووبووە گورگ و كوڕەكەی خواردوە پاشا هات وتی: كوا كوڕەكەم بە بووكەكەی وت بووكەكەش وتی: بۆ ڕاوستاون كا بوومە گورگ و كوڕەكەتم خوارد ئینجا پاشا دایە سەر خۆیا وتی ئەم قسەیە ڕاستە .**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆكە: ژنە دەبێتە گورگ و زاوا دەخوات.**

# سوڵتان مەحمود

شەوێك سوڵتان مەحمود لە بازاڕ لەگەڵ خزمەتكاری خۆی لە پیاوی خراپ دەگەڕا، دیتی ژنەك لەو بەر ئاوی دەهات و جوەكیش لەم بەر ئاوی دەهات ژنەكە هەرچی لە جوەكە ئەكرد ژنەكە بە جوەكەی وت وەرە بپەڕەوە جوەكەش گۆتی: سەر پیاوەكەت ببڕەوە ئینجا دێم ژنەكە چو سەر پیاوەكەی بڕی و جوەكەش نەپەڕایەوە گۆتی: سەری پیاوەكەت لۆ من بڕی داخوا سەری منیش لۆ كێ سەردەبڕی؟ نەپەڕیەوە سوڵتان مەحمود خزمەتكارەكەی لە دو ژنە ناردو گۆتی: هەڕو دەركەكەم لۆ شین كە لۆ سبەی بیناسین خزمەتكارەكە كە (كوڕی حەسەن مەمەندیە)دەركەی شین كرد و ڕۆیشت ژنەكە هاتە دەرێ بەس دەركەی وی شین كرابوو چو حەفت دەركە لەو لاو حەفت دەركەی لەم لا شین كرد هەتاماڵیان نەناسنەوە ئیتر ژنە نەدۆزرایەوە سوڵتان كە ئەمەی بینی گوتی : كوڕی حەسەن مەمەندی گۆتی: هەتا دێمەوە دەبێ قەتلو عامی ژنان بێ كەهاتەوە ژنەكان نەكوژرابوون سوڵتان مەحمود بە خزمەتكارەكە (كوڕی حەسەن مەمەندی)گوت عیدامت دەكەم باوكە خزمەتكارەكە زۆر پیر بوو لەبەر پیری كرابووە ناو قەفەس بە خزمەتكارەكەی گوت باعیدامت نەكا لەبەر ئەوەی تۆ ژنت عیدام نەكرد گۆتی: قەفەسەكە هەڵگرەو بمبە لۆكن سوڵتان مەحمودی خزمەتكارەكەش باوكی برد لۆ لای سوڵتان مەحمود و باوكی خزمەتكارەكە بە سوڵتان مەحمودی گۆت : سوڵتانم خۆش بی سەر هەرقەنە پەیا ببوو لەشاری گۆتی: هەستام لەگەڵ ژنەكە چوم گۆتی: ئەو ئەسپەم لۆ بگرە ژنەكە چوە خەرابەكی كلك و گوێی حەوت دێوانی بڕی و ئینجا گۆتی: من كچم و مارەیم لەتۆ هاتوە ژنەكەی لەخۆی مارەكرد ئینجا سوڵتانم خۆش بی ژن هەیە و ژنۆكەش هەیە چۆن دەبێ ژن عیدام بكرێ دوایە زەلام لە چ پەیا دەبی كوڕەكەش لەو ژنەیە وە سوڵتان مەحمود ئیتر كوڕە خزمەتكارەكەی عیدام نەكرد .

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆكە: كچێك كلك و گوێی حەوت دێو دەبڕی، ئەم حەكایەتەش یەكێكە لە حەكایەتەكانی هەیاسی دوڕناس، بەڵام، بە كورتی گێردراوەتەوە.

# (حەلوا فرۆش)

**کۆکردنەوە: ڕزگار عەبدولقادر سەعید**
**گێڕانەوە : ســـــابیر کـــەریم**

هەبوو نەبوو، کەس لەخوا گەورە تر نەبوو، کەس لە عەبدی زاڵم تر نەبو، ئەگێڕنۆ دەرێن جارەکێ مەلیکێ ئەبێ ، ئەم مەلیکە تەمەنی لە هەشتا ساڵ تێپەڕ دەکا ، لەم تەمەنەی چار ژنانیش دێنێ بەرام خوا لە تاقە کچێ زێتر چی تری ناداتێ. مەلیك ڕۆژەکێ تەماشای نەینۆکێ دەکا ، لەسەر ڕیش و سمێڵێ خۆ داو داوە نەبێ داوی ڕەشی لەسەر نادۆزیتۆ ، دری زۆر توند دەبێ ئاخێك هەرەکێشێ دەرێ: (بەخوای ئەمنیش ڕۆیشتم هیچ کوڕیشم نیە لەپاش خۆم جێم بگرێتۆ، وا چاکە کەسێکی باش بدۆزمەوە لەپاشەخۆ لەجێی خۆ داینیشێنم)وەلآ مەلیك هەر لەو بیرانە دادەبێ دوایی بڕیار دەدا دەرێ دەبێ بچم لەشارێ (بازێرێ)بگەڕێم تا یەکێکی پەسند بدۆزمۆ و دەستنیشانی کەم تا لەپاشا من جێگای مەلیکی بگرێ . وەلآ مەلیك دەچێتە بازێرێ هەر دەگەڕێ دەگەڕێ بەرام کەسی وا نادۆزیتۆ شایەنی مەلیکایەتی بێت ، لۆیێ بە درساردی دەگەڕێتۆ لەڕێگا چاوی بە حەلوا فرۆشێکی بە ساڵآ چو دەکەوێ مەلیك کەینوارێتێ ئەبینێ لەو چەقەی گەرمایە حەلوا فرۆش چەند بە عیشقەوە خەریکی کاسبی خۆیتی چەند بە جوانی حەلواکەی دەناو سینیەکی گەورە لەسەر یەك خڕ کردیتۆ لێنا گەڕێ یەك مێش توخنی سینیەکە کەون، وا بە زەوقەوەش دە دیار حەلواکەی ڕۆنیشتوە هەروەکو برێی هەتا هەتایێ گوریسی دەبەر دونیایێ ڕاخستبێ لەکنی نەبا بوو نە باران.
مەلیکیش ئەوها در تەنگ و غەمبار .

ئەم دیمەنەی حەلوا فرۆش مەلیك سەرنج کێش دەکاو دەمەرەقی دێخێ مەلیکیش زۆر حەز دەکا پێی شاد بێ و بۆ ساتێك بیدوێنێ و لە نزیکەوە هەریسەنگێنێ مەلیکیش نادریان ناکاو ئەچێتە لای و سەلامی لێ دەکات و حاڵ و ئەحواڵی ئەپرسێ و ئەی دوێنێ ، پرسیار ... پرسیار تا دەگاتە پرسیار کردن دەربارەی کاسبیەکەی ، ئەو حەلوا فرۆشیەی کەیکرد ، دەم

بارەیەوە ، وەیدوێنیٚ دەبینیٚ بە ورد و درشتی کارەکەیەوە شارەزایەو زۆر شارەزایانە وەرامی هەموو پرسیارەکانی مەلیکە داتەوە .

بەس ئەو جارە یەچێتە سەر باسی دین و دیانەت کابرا چی لیٚ نازانیٚ ، هەر چەند دەبارەیەوە دەیدوێنیٚ چی پیٚ نیە مەلیك بەم کارە زۆر تورە دەبی و بەسەری دەنەڕێنی: (کوڕە کابرا تخوا تۆش بەشەری یەك حەرف دەربارەی دین و دیانەت نزانی، شەرت بیٚ لە سێدارەت دەم). وەلاٚ مەلیك گار دەدات ، دوو خورام حازرەبیٚ دەرێن : (بەریٚ قوربان فەرماندە) مەلیك پێیانەریٚ: (بڕۆن هەر ئێستا ئەم شەیتانە بەند کەن هەتا ڕۆژی لە سێدارە دانی) دوو خورامەکە هەر یەکەی پیلێکی کابرای حەلوا فرۆش دەگرن و بەرەو بەندیخانە ڕاپێچی دەکەن، بۆ سبیانیٚ ئەم خەبەرە دەدەمی دوو خورامەکەکان ، قسە بە قسە ، زار بەزار دەڕوات ، تا بە هەموو لایەکی بلاٚو دەبێتۆو .

کابرای حەلوا فرۆشیش کوڕەکیەبیٚ ، دەبەر خوێندنی دینی دادەنێت ، ئەم کوڕە زۆر زیرەك کەبیٚ ، لەو ڕۆژگارەی حەلوا فرۆشی بابی بەند دەکریٚ ، کوڕە هێندەی نامێنیٚ خوێندن تەواوکاو، ببیٚ بە مەلا (مامۆستای دینی) دەودەمەی خەبەری بەندکردنی حەلوافرۆشی بابی لەلایەن مەلیکەوە وەگاتە کوڕەی کوڕە زۆر پەریشان دەبیٚ بەرام چەندی بیر دەینیٚ و دەبات ، هیچ چارەك نادۆزیتۆ ، لەبەرەوە دەبەرخوا دەپاڕێتۆ ، دەنوزێتۆ، دەریٚ:(خوایە ئەوە من بەتۆم بەخشی و لێشت دەپاڕێمۆ بە کەرەمی خۆ ڕێگا چارەیەکم بۆ بدۆزۆ ، بابم لە دەستی ئەو زالمە نەجات دەی) . بەم شێوە کوڕە بە تەمای خوا کراوی لێخوارەکا ، هەر بیریشی لی ناکا تۆو ، ڕۆژێکیان کوڕە دەخوێندنگە دێتۆو ، لە گەڕانەوە بە کۆرانێك تیٚ دەپەڕیٚ ، لەسەری کۆرانیٚ ئەبینی (جوەك)خانی دروستەکا خانیەکەشی زێتر لە خانیەکانی تەنیشتی هێناتە پێش ، وەلاٚ کوڕەش دەریٚ : (ئەریٚ ئەو خانییە ئیچێیە، جوەش دەریٚ: خانی خانی منە، دەی بزانم چیتەویٚ) کوڕەش دەریٚ :(وەلا ، هیچم ناویٚ ، بەس هاتم پێت برێم ، خوا قبور ناکا، تۆ ئەم خانیەت ئەوها دە سنوری خۆی زیاتر پەراندیەو ئەم کۆرانەت تەسك کردیەو ، ئێستا ئەگەر عەرەبانەکی گەورە بیەویٚ بەم کۆرانە داتیٚ پەڕیٚ دەبەر تەسکیان تێوەناچیٚ ، ویژدانت هەبیٚ سنور مەبەزێنە). وەلاٚ کابرای

جوەش زۆر بەبێ منەتی گاڵتەجارانە بەسەر لموز جواب دەداتەوە و ، دەرێ : (برۆ بابە برۆ لێمانگەڕێ، کەنگینێش بویە مەلیك وەرە خانیەکەمان بروخێنە)بەم شێوە کوڕەی تەریق دەکاتەوە، کوڕەش بەم وەرامە زۆر توڕە دەبێ، لە عەژمەتان ڕەنگی سور دادەگەڕێ و عیددەت دەیگرێت، بەرام هیچ دەستەراتی پێناشکێ، لەبەر خۆی دەرێ: (کورە چت لەدەست دێ، دەمی خۆت بگرە خۆ نە مەلیکی و نەکوڕە مەلیك، بەخۆت خوێندەوارێکی دەست و پێ سپی، بابت پیاوێکی کاسبی بێ دەستەرات ئێستاش وا لە کۆشکی مەلیك بەندە ، دانبەخۆت داگرە، ئەتەوێ شان دەشانی جوێکی دەورەمەندی قورچۆك و دڵڕەق بدەی، بەخوای زۆر سەهوی ئێستا هەزاری وەکی تۆو مەلیکەکەت بە پارە ئەکێشێ، هەر بە پارە جێگایەکی دەتەنیشت باوکە داماوەکەت بۆ دەکرێ) . وەڵا کوڕە کە دڵنیا بوو چاری نیە ، بە ناچاری دەڕوا، بەرام لە دری هەر دەمێنێ ڕۆژان هات و ڕۆیی، جا حەفتەیەك، یان دوو حەفتە، یان زیاتر.....

ڕۆژێکیان مەلیك خەونەبینێ ، زۆرەترسێ، هەزاران خەیاڵ دایەگرێ ، زۆر پەرێشانەبێ، هەرچەندی ئەینێ و ئەبا مانای خەونەکەی بۆ لێك نادرێتۆ، تا ڕۆژێکیان قاسد دەنێرێ بەدوای مامۆستاو پێیەرێ : (برۆ لای مامۆستاو پێی برێ مەلیك خەونی دیتیە، بابێ بۆ لێك بداتۆ، بەرامبەر بەمەش چی بوێ لەماڵی دونیایێ پێیە بەخشم ، ئەگەر بۆشی لێك نەدرایۆ خەڵاتی مەرگی پێیەبەخشم). کە ئەم خەبەرەی بە مامۆستا ڕائەگەیەنن مامۆستا بە زەردەخەنەیەکەوە دەرێ: (ئەوجا لە لێکدانەوەی خەون ئاسانتر هەیە ، پێم حەیفە بەخۆم بێم ، برۆنە لای قوتابیەکەم) مەبەستی لە کوڕەی حەلوا فرۆشی بەندکراوە با ئەو لۆتانی لێك بداتۆوە . وەڵا قاسیدیش بەرەو لای قوتابی (فەقێ)(کوڕی حەلوا فرۆشی بەند کراو)دەچێ و ، حار و مەسەلەکەی بۆ دەگێڕنۆوە ، داوای لێ یەکەن بەرام کوڕە تۆزێ بیر دەکاتۆوە و لەبەر خۆی دەرێ : (کوڕەی بەد بەخت ئەو دەرفەتە زێڕینە لەدەست خۆ نەدەی دوایی هەتا بابت ڕادەگا خۆشت لەدەست دەدەی ....) .

هەر لەبەر خۆیدا دەیگۆ بیریشی دە ڕێگا چارەیەك ئەكردۆوە . دوایی ڕووی دە قاسیدیٚ كردو پێی گۆ : (بڕۆ بە مەلیك بریٚ هەتا تانج و نەجمەی خۆی بۆم نەنێریٚ ئەگەر دەسەریش دەن نایێم) ئەوجە سەرت نێشێنم ، قاسید گەڕاوە و چیان پێوە گۆ ئیوهای لۆ مەلیكیٚ گۆ مەلیكیش بەخۆی دەسەر ئاو و ئاگران بوو دری هەر هەنكی هێلكۆكەكی مابوو هەر ئەوەتە شەقی نابرد بەناچاری تانج و نەجمەی پڕدایی و لەسەر سەرو شانی خۆی كردۆوە و دایە دەست قاسید و پێی گۆ : (هەر ئەلعانەكیٚ بۆی ببە) قاسیدیش هەر بەغار گەیاندیە دەستی كوڕەو كوڕەش تاجەكەی وەسەرناو نەجمەكانیشی لەسەرشان بەست و عەرەبانەیەكی گەورەشی داواكردو بەسواری عەرەبانە بەرەو كۆشكی مەلیك بەڕیٚ كەوت، لەڕێگادا بای دایەوە سەر ئەو كۆرانەی خانی (جوە)ی دەسەر بوو، لەسەر كۆرانیٚ وەسوڕاوە و نەیتانی بەكۆرانەكە تێپەڕی لەبەر تەجاوزی خانی (جوە)عەرەبانە گەورەكەی دەكۆرانیٚ وەناچو كوڕە گاری داو فەرمانی كرد هەرزو خانی (جوە)ی وەڕوخێنن پیاوانی مەلیكیش ناچار بون داواكاریەكەی بەجیٚ گەیەنن نەیانەتوانی دە ئەمرو فەرمانی دەرچن، لەبەر ئەوەی مەلیك بەتانج و نەجمەی خۆی ڕێزی لیٚ نابوو، هەر ئەوەندەت زانی چەند پاڵەوانیٚ پێوەربون بە قەڵەم و چەكوشان كەتنە سەر خانی (جوە)ی هەتا دەگەر خانیەكانی تەنیشتی ڕاست نەبو لێیان نەگەڕا، وەلاٚ دەودەمەدا (جو)دەهاتەوە ماریٚ چ ببینیٚ؟ ئەوەی ڕۆژیٚ دەڕۆژان بەخەیاری ناهات ئەوڕۆ كەوتە پێش چاوانی ، دەبینیٚ وا خانی دەڕوخێنریٚ و كوڕەی حەلوا فرۆشیش دەبەرگیٚ مەلیكان دایەو لەسەر كەرو عەربانیٚ دەڕوانێتیٚ، جوە واقی وڕما لەبەر خۆ ئەیگۆ :(باشە ئەوە خەونە یان خەیار كوڕەی حەلوا فرۆش مەلیكایەتی چ جار مەرحەبا)هەر دەو دەمەدا كوڕە ڕووی تێكردو پێی گۆ: (ئەوڕۆ بومەتە مەلیك وا لەسەر قسەی خۆت خانیەكەم تێكدای ).

كوڕە تەجاوزەی جوەی نەهێشت بە فەڕاحەتی دری دەناو كۆرانیٚ وەچو بەرەو كۆشتی مەلیكی وەریٚ كەوت كوڕە بەم كارە ئاوەكی هاتەوە قەلبی مرازەكی گەورەی حاسڵ بو دەبەر خۆش هەر ئەیگۆ: (ماشەڵڵا دەقودرەتیٚ جەباری ئەوەی كە لە عەقری بەشەر دوورە). دەو دەمەی كوڕە گەیشتە

کۆشکی مەلیکی دەکەوانان بە گەرمی پێشوازیان لێ کرد کە گەیشتە بەردەمی مەلیکی کوڕە بەکاوەخۆ لە عەرەبانەکەی دابەزی و چو لەبەر دەم مەلیك ڕاوەستاو پێی گۆ: (سەلام لە گەورەمان) مەلیکیش بەخۆ لەسەر ئاو و ئاگران بە شپرزەیی پێی گۆتۆ: (سەلام لەنگۆ) کوڕە پێی گۆ: (گەورەم خەونەکەتان چییە؟) مەلیکیش دەسپێکا تا سەرو بنی خەونەکەیان لۆ دەگێڕێتۆ کوڕەش زۆر بەجوانی خەونەکەی بۆ لێکەداتۆوە مەلیکیش قەناعەتی دری دێ دەپاشاندا مەلیك کوڕە دەدوێنێ پرسیاری زۆری لێکا کوڕەش وەرام دەداتۆ مەلیك بە وەرامە جوان و لەجێکانی کوڕە زۆر سەرسام دەبێ و ئافەرینی لێکا پێیەرێ: (بەڕاستی زۆر زیرەکی ئەی ڕەحمەت دەو بابەی ئەتووی لێ بەپاش کەوتوە)پاشان پێیەرێ: (مامۆستای بەڕێز (مەبەستی کوڕەیە) ئەتۆ هەر شتەکیەتوێ لەمارێ دونیایێ داواکە)کوڕەش ئەمە بە فورسەت زانی و دەرێ: (گەورەم پایەدار بێ ماوەکی دەمەو پێش کابرایەکی حەلوا فرۆش لەلای جەنابتان دە سجنێ کرا دەمەوێ بزانم لۆ دە سجنێ کرا؟!) مەلیکیش لە وەرامدا پێیەرێ: (ئەتو ئەو شەیتانەی دەرێی ئەو لەبەر ئەوە دەسجنێ کراوە چونکی هیچی دەربارەی دین و دیانەتێ خۆ نەزانی ، دەرباری کارێ خۆشی دەیگۆ بلبلە بڕیاریشم داوە لەسەر ئەم کارەی دە سەری دەم) کوڕەش زۆر ژیرانە پێیەرێ: (دەباشە گەورەم ئەمن ئێستا وەخوێنم ئەگەر بابێ من مەسرەفێ من نەکێشی و بەمن نەرێ خوێندنێ خۆ تەواو کە ئەمن نەتوانم خوێندنێ خۆ تەواو کەم)وەلاّ مەلیکیش پاش تێفکرین وەرامەداتۆ: (کوڕە ناوەڵلاّ ناتوانی دوو حەرفێتر زێتر بخوێنی)کوڕەش دەرێ: (زارێ گەورەمان خۆش باشە گەورەم ئەگەر بابی من لە مندارییەوە ئەمنی دەبەر خوێندنێ دانەنابا ئێستا دەگەیمە ئەمڕۆ)مەلیکیش دەرێ (کوڕە ناوەلاّ) کوڕەش دەرێ: (کەواتە گەورەم خۆش بی بابی من ئەمنی دەبەر خوێندنییێ داناو منیش بوومە ئەم خوێندەوارە دەربارەی دینێ خۆ هەموو ئەزانم بەرام ئەم کابرا حەلوا فرۆشە بابی وی بەس دەبەر حەلوا فرۆشتنێ کردوە و دەبەر خوێندنییێ نەکردوە ، لەبەر ئەوە بەس دەربارەی کارێ خۆ دەزانێ ، دەربارەی دینێ خۆ چ نەزانی ئەگەر بابێ ویش دەبەر خوێندنییێ دانابایە ئەلعان ئەویش وەکی من

دەربارەی دینیْ خۆی زۆر شتی دەزانی)مەلیكیش پێی گۆ (تەكبیر) كوڕەش گۆ: (خوا گەورەیە زوڵمە ئەم حەلوا فرۆشە لەپەت بدریْ پێویستە ئازاد كریْ لەبەر ئەوەی گوناحی ئەو نیە گوناحی بابیْ ویە) مەلیكیش گۆ: (باشە چ دەرێی گوناحی وی نیە)كوڕەش ژیرانە پێی گۆ: (باشە ئەگەر ئەم كابرایە بەم هەژاری و بیْ نانییەی خۆی كوڕی خۆی دەبەر خوێندنی نابی ئەو كاتە چ دەرێی قەناعەتتان دیْ ئەو بیْ گوناحە)مەلیكیش چ بریْ قسەی نەما بە ناچاری وەرامی داوۆو وەگۆ : (بەریْ ئەگەر وابیْ بۆم بسەلمێنی كوڕیْ وی دەبەر خوێندنێیە ئەوا هیچ قسەم نامێنیْ)كوڕەش دەریْ: (گەورەم من كوڕی ویم)وەلاْ مەلیكیش زۆر كەیفی پیْ خۆش دەبیْ و دەریْ : (ئەشەندە بیلا حەق نییە لە سێدارە بدریْ گوناحی بابیتی)مەلیك گاری دا سەردار و دەستەیی و هەرزو بەزو كابرای حەلوا فرۆشیان هێناو ، حەلوا فرۆش بە كوڕەی شاد بۆوە و خۆی لەباوەشی كوڕەی لور داو نێوچەوانی ماچ كرد پێی گۆ : (كوڕم هەی خوا بۆ بابیْ تەمەن درێژت كا) وەلاْ لەو ڕۆژەوە خوا دەركەی بەختەوەری بەڕووی حەلوا فرۆشی هەژار خستە سەر پشت مەلیكیش ئەو كەسەی دە ئاسمانان لێیەگەڕا لەسەر عەردیْ كەوتە دەستی بڕیاریدا كوڕەی حەلوا فرۆش دەجێی خۆی لەپاش خۆی بكاتە مەلیك و تاقە كچەكەشی پێشكەش كرد ، بەم شێوە لە كۆشی مەلیك حەوت شەو و حەوت ڕۆژان خۆشی و شادی نەبڕایەوە ، پاش ئەوەی مەلیك مرد كوڕە لەجێی مەلیك دانیشت حەلوا فرۆشیش ئەوجارەیان پیشەی لە حەلوا فرۆشی بوە حەلوا خواردن ئەمنیش زۆرم بیست و زۆرم دیت و زۆرم گۆ ، بەرام لە كەوش دڕان زیاتر هیچم پیْ نەبڕا .

***حەكایەتێكی پەند ئامێزە و ڕەگەزی ئەفسانەی تێدا نییە .**

# کەوری چل تەعام

**کۆکردنەوە : ڕوخسار عەولاّ حەمەدەمین**
**گێڕانـەوە : بـابـەکـــر ڕەســــــولّ**

**پاشایەك هەبوو، سیّ کوڕی هەبوو، (حەمەد . مەحمود . ئەحمەد) ئەحمەد بە تەنیا لە دایکێك بوو، بەلاّم حەمەد و مەحمود لە دایکێك بوون، کوڕەکانیان بازرگانیان دەکرد، کە سودی زۆری هەبوو، ئەحمەد وتی: بابە دوو سەد لیرەم بدەریّ کاری پیّ دەکەم. ڕۆیی جەڵەبێکی مەڕ کڕی. هاتەوە تووشی بێشەیەك بوو دێوێك دانیشتبوو وتی: یاخوا بەخێر بێیەوە. ئەحمەد وتی: لە مێژە چاوەڕوانت دەکەم دیار نی ئەو شەو میوانی دایکی خۆت بە. ئەحمەد وتی: من کار دەکەم لا نادەم. بەلاّم پیرەژن مەڕی پیّ لا داو میوانی پیرەژن بوو خواردنی باشی دایە و لە ناو (کورسی و قەنەفەی) دانا وتی: خەمی حەیوانەکانت نەبیّ. سبەینیّ کە ئەحمەد لە خەو هەڵسابوو مەڕەکانی نەمابوون، پیرەژن لە جیاتی مەڕان کەوڵێکی دایە، ئەحمەد شەقی لەو کەوڵە هەڵدا و وتی: کەوڵی وا زۆرە لەسەر سەرانگۆلکان. پیرەژن کەوڵەکەی هەڵگرت و لە پێشی دانا و (چل) تەهامی لەسەر حازر بوو. ئەحمەد کەوڵەکەی هێنا و کاتیّ لەسەر کانی لای دابوو کەوڵەکەی داناو (چل) تەعامی لەسەر حازر بوو پاشای ولاّت کچێکی هەبوو لە دووری ولاّت داینابوو کارەکەری هەبوون وتیان ئاغا ژن شێتێك لەسەر کانیە کەوڵێکی پێیە کە داینا (چل)تەعامی لەسەر حازر دەبیّ، کچی پاشا بانگی کرد وتی: ئەو کەوڵەی بە چەند دەفرۆشی؟ وتی: ئەو کەوڵە فرۆشتنی بۆ نیە، بەلاّم وتی: خۆت هەڵکە تا چۆکت ئینجا ئەم کەوڵەت ئەدەمیّ.ز کچی پاشا هەتا چۆکی خۆی هەڵکرد و بە ئەحمەدی پیشاندا، ئینجا ئەحمەد کەوڵی دایە ئاغا ژن و بە دەست بەتاڵی گەڕایەوە بۆ مالّ ئینجا وتی:**

---

[5] کورسی و قەنەفە ناوی نوێین، هاتوونەتە ناو حەکایەت .

بابه دوو سەد لیرەم بدەریّ . دوو سەد لیرەی تری دایە کوڕەکەی ئەوجا هات و مێگەڵێ بزنی پێ کڕی . گەیشتەوە بێشە و پیرەژن وتی: لادە. وتی: لا نادەم هەر دەڕۆم. پیرەژن جامێکی دایە. وتی: من جامی وام ناوێ جامی وا زۆرە، پیرەژن جامەکەی هەڵگرت و پڕی کرد لە ئاو ئینجا بوو بە زێڕ، ئینجا جامەکەی ڕشت و دوای پڕی کردەوە لە ئاو پڕ بوو لە زیو ئینجا وتی: ئەحمەد من ئەوەت ئەدەمێ. ئەحمەد جامەکەی هێنا و گەیشتەوە سەر کانی، جارێکی لە ئاو هەڵێنا پڕ بوو لە زێڕ دوای لە ئاوی هەڵێنا و پڕ بوو لە زیو، دوو بارە ئاغا ژن بەمەی زانی و چوو بۆ لای وتی: ئەم جامە بە چەندی دەفرۆشی؟ ئەمیش وتی: ئەم جامە لە فرۆشتن نایە. وتی: خۆت هەتا ناوکت هەڵکە ئەم جامەت ئەدەمێ، ئینجا کارەکەرەکە وتی: ئەم قسەت غەڵەتە ئاغا ژن وتی: قەیناکا، ئینجا جامەکەی دایە ئاغاژن و بەدەست بەتاڵی گەڕایەوە بۆ لای باوکی ، ئینجا ئەحمەد وتی: بابە دوو سەد لیری ترم بدەریّ ئاشم داناوە ئینجا ئەحمەد چوو جەلەبێکی گامێش کڕی و گەیشتەوە لای پیرەژن و وتی: کوڕم خەمت نەبێ با گامێشەکانت لێرە بن تا سبەینێ بەخێر چی. بەیانی ئەحمەد وتی: کوا گامێشەکانم پیرەژن وتی: ئەم چەترەت ئەدەمێ لە جیاتی گامێشەکانت ، ئەحمەد وتی: ئەم چەترە شکاوەم بۆ چییە؟ پیرەژن هەڵی داو (چل)دێوی لێ هاتە دەرێ. وتی: ئەحمەد ئەوەت ئەدەمێ. دێوەکان بوو بە هەرایان وتیان: ئەم کوڕە دەکوژین، ئەحمەد چەترەکەی هەڵگرت و چو بۆ سەر کانی چەترەکەی هەڵدا (چل)دێوی لێ هاتە دەرێ. ئاغا ژن بەمەی زانی و وتی: ئەحمەد ئەم چەترە بە چەند دەفرۆشی؟ وتی: ئەگەر مێردم پێ بکەی ئەم چەترەت ئەدەمێ کارەکەرەکان وتیان: قسەی نامەرد مەکە! دوای کارەکەرەکان وتیان: ئاغا ژن مێردی پێ بکە ئەم دێوانە بۆ ئێمە باشن ، ئینجا دوای مێردی پێ کرد ، بابی کچە هەموو چوار مانگ جارێ قافڵەی بۆ دەنارد لە هەموو شتێ ژنەکە سکی پەیدابوو، قافلەچییەکان گەڕانەوە وتیان. ژنەکە حامیلەیە ئەویش لەشکری خڕ کردەوە هات. ئاغا ژن وتی: ئەم چەترەی هەڵدە ئەم پیاوەی پێشەوە خەزوورمە ئەو پیاوە بگرن و ئەوانی تر بکوژن زۆریان کوشتن. بەڵام بابی کچەیان هێناو لە تەنیشت ئەحمەدیان دانا ئینجا ئەحمەد پاشا دەستی

ماچ کرد و چەند ساڵ ئەم کچەی لە چۆڵگە بەخێو کرد دوای ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵی بابی کوڕە لەویٚ خانوویەکی کرد هەر خشتەك لە زێڕی یەك لە زیوی ، ئینجا لەویٚ دانیشتن بەباب و کوڕایەتی، ئینجا کوڕەکە وتی: ئەگەر ڕێم بدەی دەچمەوە بۆ لای بابم وتی: دەچی بەخێرچی، هەستا چەتری لە دەست گرت و لەگەڵ ژنەکەی ڕۆیشت چۆڵگەیەکی لیٚ بوو کە چەتری هەڵدا قولە ڕەش هاتنە دەریٚ خانوویەکیان دروست کرد کە هەر خشتێکی لە زێڕ و یەکێکی لە زیو ، ئینجا دوو کەڵەبابی زێرینیان دانا کە دەستیان کرد بە خوێندن ، مەلا هەستا بچیٚ بۆ مزگەوت مەلا ڕانی شکا، ئەحمەد وتی: پاشا یان دو دەعوەتمان بکات یان بێت بۆ لامان. ئینجا بابی چوو بۆ لای کوڕەکەی میوان بوو، وەختی نیوەڕۆ بوو کەوڵیان داخست و بابی وەسەر کەوتوو وتی: ئەگەر بابم هات بچۆ سە مێزی دابنیشە بابی هات کچەکە چوو لەسەر مێزی دانیشت پاشا شەقێکی لێدا وتی: چۆن کچی خەڵکی لەسەر کورسی من دادەنیشیٚ. ئەحمەدی نەناسیەوە ئەحمەد دەستی ماچ کرد و وتی: بابە ئەمە نام ناسی ئەمن ئەحمەدم ئەوەش خێزانی منە ، لەباتی ماچی کەی شەقی لیٚ دەدەی ئینجا پادشا چوو بۆ لای کچەکە و تەختی ناو چەوانی ماچ کرد وتی: ئەحمەد دەبیٚ عەفوم بکەی چونکە من هەڵە بوم ئینجا ئەحمەد کەوڵی داخست و (چل)تەعامی لەسەر حازر بوو بابی سەری سوڕما! وتی: ئەحمەد ئەمە چییە خوایە ئینجا لەویٚ بە یەکتری شاد بوونەوە .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە:دێوو کەوڵی چل تەعام و جامی ئاوزێڕ و چەتری چل دێوو، خانووی خشتەك لە زێڕی و یەك لە زیوییە .**

# كراس ڕەقازی بلبل هەوازی

**کۆکردنەوە: ڕۆشنا علی نجم**

هەبوو نەبوو، پادشایەك هەبوو ئەو پادشایە شەوانە دەرئەچو شارو دەگەڕا و چاودێری ڕوداوەکانی شاری دەکرد. ڕۆژێك بڕیاری دا کەکەس نابێ ئاگر بکاتەوە و چرا دابگیرسێنێ. پاشا و وەزیرەکە شەوێك هەردووکیان بە یەکەوە دەر ئەچن و دەبینن چرایەك داگیرساوە، پاشا بە وەزیرەکە دەڵێ :. من بڕیارم نەدا کە هیچ کەس چرا نەسوتێنێ ، دێنە نزیك چراکە و پادشا گوێی لە چەند قسەیەك دەبێ لە نێوان سێ خوشکدا کە خانویەکە و تەنها ئەم سێ خوشکەی تێدا دەژی یەکێکیان دەڵێ کە خوشکی گەورەیە ((ئەگەر پادشا من بخوازێ هەموو ڕۆژێك خواردنی لە ناو ئەنگوستیلەی دورماندا بۆ دروست دەکەم و هەموو شارەکەشی بیخۆن و لێشی بمێنێتەوە )) دوایی خوشکی ناوەندی دەڵێ ((گەر من بخوازێ ئەوا ڕایەخێکی بۆ ئەدورم هەر لێرە تا ماڵی پادشا بێت و نیوەشی بمێنێتەوە)) دوایی کچی بچوك دەڵێ ((گەر پادشا من بهێنێ ئەوا سکم ئەبێ و دو منداڵم ئەبێ بەسکێ یەکێك کچ و ئەوی دی کوڕ کچەکە پرچی ئاڵتون و کوڕەکە دانی مرواری بێت )) .

پادشا کە گوێی لەم گفت و گۆیە دەبێت دەڕواتەوە کۆشکەکەی خۆی و بۆ بەیانی دەنێرێتە داوای کچە گەورە و دەیخوازێ دوایی لە کۆشکی پادشادا دەڵێ: کوانێ ئەو ئەنگوستیلەی خواردن تیا دروست دەکرد کە میلەتی من بیخوا و بشمێنێتەوە؟ کچە دەڵێ بۆ ئەوە وام وت بمخوازی دوایی پادشا کچە ناوەندی دەخوازێ دەیباتە ناو کۆشکی شاهانە دەڵێ کوا ئەو ڕایەخەی کە تاکو کۆشکی من بگات و لێشی بمێنێتەوە؟ دەڵێ:(بۆ ئەوەی بمخوازی وام وتوە)پادشا بۆ جاری سییەم کچە بچوك دەخوازێ و دەیهێنێتە کۆشکی شاهانە و پێی دەڵێ کوا ئەو دوو منداڵەی بە سکێك دەت بوو؟ کچەکە وەڵام دەداتەوە دەڵێ(کەس بە شەوێ منداڵی بووە)پاش ماوەیەکی زۆری پێ دەچێت ژنی بچوك سکی دەبێت و دوو خوشکەکەی تری پشت گوێ دەخات دوای نۆ مانگ کاتی لەدایك بوونی منداڵەکانی دێتە پێشەوە دوو ژنەکەی تری پاشا

واتە خوشکی ژنی بچوك دەڵێن ئێمە دەبینە مامانی چونکە خوشکی خۆمانە و ئێمە زیاتر ئاگاداری دەبین. پادشاش ڕازی دەبێت و دەڵێت : بەڵام لەگەڵ منداڵەکەی بوو ئاگادارم بکەنەوە .

پاش ئەوەی ژنی بچوك منداڵی دەبێت منداڵەکەی کچ و کوڕێکە. کوڕەکە دانی مرواریيەو کچەکەش پرچی زێڕە! ئەم ڕوداوە سەرنجی پورەکانیان ڕادەکێشێ و بەخێرایی دەیان خەنە ناو سندوقێکەوە و سەری سندوقەکە دەبەستن و چوار دەورەکەی قیڕ ڕێژ دەکەن و دەیدەن بە دەم ئاوەوە و دوو بەچکە سەگ دەهێنن و دەیخەنە بەردەمی پادشا و دەڵێن ئەمە منداڵەکانتە پاشا ئەمەی زۆر پێ ناخۆش دەبێت یەکسەر بڕیار دەردەکات کە ژنەکە واتە ژنی بچوك لەناو پێستی گا بدورن بیخەنە ناو سندوقێك و بیکەنە پرد خەڵك لێی بپەڕێتەوە خواردنیشی نانی ڕەق و ئاوی گەرم بێت .

پاش ماوەیەکی زۆر ماڵێك ئاشی ئاویان هەیە لە نزیك ڕوبارێك لە پڕدا ئاشەکە دەوەستێ و کار ناکات، کە پیاوەکە دەچێت سەیر دەکات سندوقێکە لەبەردەم کونی ئاوەی گرتووە ئەویش وا دەزانێ تەختەیە هەڵی دەگرێتەوە دەیخاتە سەر ئاگر خۆی پێ گەرم بکاتەوە کاتێك قیڕەکەی دەوری دەتوێتەوە دوو منداڵەکە دەبینێ زۆری پێ خۆش دەبێت و خۆشیان ژن و پیاوێکن و منداڵیان نابێت یەکسەر منداڵەکان دەردەهێنن و دەیان شۆن بەڵام بیریان نابێت ئاوی شۆردنی منداڵەکان بڕێژن بۆ بەیانی سەیر دەکەن سەری تەشتەکە ئاڵتون گرتویەتی! ژن و پیاوەکە پێیان سەیرە و ئەم نهێنی ئاوە دەپارێزن ساڵان دێت و دەڕوا منداڵەکان گەورە دەبن ڕۆژێك کوڕەکە لەگەڵ منداڵی دەرەوە یاری دەکات یەکێك لە منداڵەکان پێی دەڵێت (خۆ تۆ کوڕی ئەو ماڵە نیت و خوشکەکەشت کچی ئەو ماڵە نیە)کوڕەکە کە گوێی لەم قسەیە دەبێ زۆر کاری تێ دەکات و بۆ باوکی دەگێڕێتەوە و زۆری لێ دەکات ئەویش بە ناچاری ڕاستی ڕوداوەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە پاش ماوەیەکی تر منداڵەکان گەورە دەبن بڕیار دەدەن کە ئەو ژن و پیاوە بەجێ بهێڵن هەر چەندە پیاوەکە زۆر لێیان دەپاڕێتەوە بەڵام بێ سود دەبێت تا ئەو کاتەش منداڵەکان نهێنی خۆ شۆردنی خۆیان نازانن بۆیە لە دوا ماڵئاوایی ڕۆیشتن دا کوڕەکە کە

لەباوکی دەکات باوکی نهێنی ئەوەی پێ دەڵێت کە ئێوە ئاوی خۆ شوشتنەکەتان مەڕێژن سودی لێ وەربگرن و ژیانی خۆتانی لەسەر بنیاد بنێن .

کچ و کوڕەکە دەڕۆن و دەگەنە شاری پادشای باوکیان بەڕێکەوت لە نزیك کۆشکی باوکیان کۆشکێك بۆ خۆیان دروست دەکەن کە دەگاتە ئەوەی باوکی لەجوانی شێوەی کۆشکەکەدا ڕۆژێك کوڕ و کچەکە هەردووکیان لەسەربان دەبن دوو پورەکەیان دەیان بینن لەبەر خۆرەکە کە ئەیدا لەسەری کچەکە پرچی دەبینن کە ئاڵتونە و کوڕەکەش دەبینن کە ددانی مرواریە .

بەم شێوەیە دو ژنەکە دەکەونە مەترسیەوە و لەوەی ئەم نهێنیە کەشف ببێت لەبەر ئەوە دەکەونە پیلان دانان و بۆ ئەمەش پیرێژنێك دەدۆزنەوە کە پیرێژنەکە زۆر جانانە دەبێت و ڕازی دەبێت بەوە دەچێتە بەردەمی کۆشکەکە داوا لە کچەکە دەکات دەرگای بۆ بکاتەوە و داڵدەی بدات و دەڵێت لە حەجاجەکان بەجێ ماوم بەڵام کچەکە ڕازی نابێت پیرێژنەکە ناچار دەبێت پەنا بەرێتە بەر براکەی و لەسەرە ڕێی براکەی دەوەستێ کە دێتەوە لێی دەپاڕێتەوە و پێی دەڵێ: کەداڵدەم بدە ئەم شەو کوڕەکەش بەزەیی پێدا دێتەوە و دەیباتەوە بە خوشکەکەی دەڵێ ئەمە زۆر باشە تۆش بە تەنها نابیت کاتێ من لەماڵ نەبم ئاگاداریت دەکات و ئاگاداری کۆشکەکەش دەکات بەڵام پیرێژنەکە کە شەو دەچێتە ناو جێگاوە بیر لەوە دەکاتەوە کە پیلانێك بگێڕێت و داواکاری ژنانی پادشا بهێنێتە دی بۆ ئەوەش بەیانی بە کچەکە دەڵێ: تۆ زۆر هیلاك دەبیت کە بەدەست ئەم شتانە دەکوتیت بە براکەت بڵێ (دەسك و هاوەنێك)هەیە بەسەر شانی ئەژدیهایەکەوە کەبچێ بۆتی بهێنێ تۆ لەم ئیشە قورسە ڕزگارت ئەبێ کچەکەش قسەی پیرێژنەکە دەچێ بەگوێی دا کاتێ کە براکەی دێتەوە پێی دەڵێ دەبێ تۆ بچیت ئەو دەسك و هاوەنم بۆ بهێنی براکەی پێی دەڵێ(باشە دڵت ناشکێنم)کوڕەکە دەڕوا لەڕێگا چاوی بە پیاوێك دەکەوێ ناوی (خدری زیندەیە)خدر پێی دەڵێ بۆ کوێ دەچی ؟ دەڵێ بۆ ئەو دەسك و هاوەنە .

خدر دەڵێ:(بەڵام ئاگات لەخۆت بێت ئەو دەسك و هاوەنە بەشانی ئەژدیهایەکەوەیە ئەگەر چویت چاوی نوقاندبوو ئەوە بەخەبەرە ئەگەر چاوی

**کراوه بوو ئەوه نوستووه بەڵام بە مەرجێ ئەمەت پێ دەڵێم ڕۆیشتیتەوه پیرێژنەکە بکوژیت ئەویش دەڵێ باشه) بەڵام ناڵێ ئینشالاَ کاتێ کوڕەکە دەڕوا ئەژدیهاکە دەبینێ چاوی کراوەتەوه کەهەناسە دەدات کوڕەکە بۆ لای خۆی کێش دەکات و دار و درەختەکان هەموی دەلەرێنەوه کورەکە شمشێرەکەی دەخاتە نێوانی هەردو دەمیەوه واتە هەردولای دەمی و بەسەری دا زالّ دەبێت و دەیکوژێت و دەسك و هاوەنەکە لەشانی دەکاتەوه و دەیباتەوه بۆ خوشکەکەی ئەم کارە پیرێژنەکە سەرسام دەکات و ناچارە بۆ پیلانی دوەم بگەڕێ .**

**پلانی دووەمی بە کچەکە دەڵێ تەشتێك هەیە کەخۆی جل دەشوات تۆ ئەگەر دانا بیت ئەو تەشتە بە دەست بهێنی دەتوانی کارەکان بۆ ئاسان ببێت و ئەوەش بە براکەت بڵێ بەڵکو بۆتی بکات. دیسان کچەکە ئەم داوایەش لە براکەی دەکات براکەی ڕازی دەبێت بەوەو بڕیار دەدات بڕوا لە ڕێگا (خدر)دەبینێ و خدر پێی دەڵێ بۆ کوێ دەچی ؟**

**ئەویش وەڵام دەداتەوه دەڵێ بۆ فلاّنە تەشت دەچم دەڵێ ئەوەی تۆ بۆی دەچی لای ژنێکە لەشێوەی دێو دایە مەمکێکی ڕاخستوه یەکێکی داوە بە شانیا گەر توانیت بەسەری دا سەر کەوی ئەوا داواکاری خوشکەکەت جێ بەجێ دەکەی بەڵام کە ڕۆیشتیتەوه پیرێژنەکەی ماڵتان بکوژە . کوڕەکە هەر دەڵێ (باشە)**

**کوڕەکە دەگاتە لای پیرێژنەکە کە لەشێوەی دێو دایە و سەیری دەکات چەند گەورەیە کوڕەکە یەکسەر خەنجەرێك لە سکی دەدات و شمشێرەکەی لە سنگی توند دەکات و دەیکوژێت تەشتەکە دەبات و دەڕواتەوه پیرێژنەکە جارێکی تر سەرسام دەبێت و دەڵێ ((ئەم پیلانەش سەری نەگرت)) .**

**دوایی ژنەکانی پادشا دەڵێن کارێ بکە کوڕەکە نەیەتەوه ئێمەش لێرە کچەکە دەکوژین، پیرێژنەکە بیر لە پلانێکی کاریگەر تر دەکاتەوه بۆیە بە خوشکەکەی دەڵێ براکەت داواکاریەکانی تۆی بەجێ هێنا تۆش داوای لێ بکە کە ژن بهێنێ کچەکەش دەڵێ: بەڵام کێ بهێنێ پیرێژنەکە دەڵێ کچێك هەیە کە زۆر جوانە و کچی پادشای چینە و پێی بڵی با ئەو بخوازێ کچەکە قایل**

دەبێت کە براکەی دێتەوە خۆی عاجز دەکات. براکەی پێی دەڵێ(خوشکم بۆ عاجزی؟)ئەویش دەڵێ: دەبێ تۆ ژن بهێنی چونکە تۆ داواکاریەکانی منت هەموی قبوڵ کردووە کوڕە دیسان بەمەش ڕازی دەبێ دەڵێ: بەڵام کێ بهێنم؟ دەڵێ! کچێك هەیە ناوی (کراس ڕەقازی بلبل هەوازی)یە زۆر جوانە و کچی پادشای چینە کوڕە دەڕوات دیسان(خدری زیندە)ی توش دەبێ و بەڵام پێش ڕۆیشتن ئەنگوستیلەیەك دەداتە خوشکەکەی دەڵێ: ئەگەر ڕەش بوو ئەوە ئەمن مردووم ئەگەر سپی بو ئەوا زیندوم (خدر پێی دەڵێ ها ئەحمەد ئەمجارە بۆ کوێ ؟) ئەویش وەڵام دەداتەوە دەڵێ: ئەگەر بزانی ناوم ئەحمەدە دەشزانی بۆ کوێ دەچم؟ دەڵێ: بەڵام ئاگات لەخۆت بێ چونکە ئەو کچە لەسەر کۆشکێك لەسەر شێوەی بولبولێکە نیشتووە چەندین کوڕە پادشا چونەتە داوای بەڵام ئەو مەرجی هەیە خاڵێك بەلای ملیەوەیە ئەگەر سێ بەرد هەڵبدەیت و یەکەم و دوەم و سێیەمی پێوە نەلکا بەخاڵەکەیەوە ئەوا دەبێتە بەرد. ئەگەر پێوەی لکا کچەکە دەبێتە هی تۆ، بەڵام ئاگادار بە ئەمجارە ڕۆیشتیەوە ئەو پیرێژنە بکوژە ئەحمەد ئەم جارە دەڵێ ئیشاڵاّ و دەڕوا .

کوڕە دەگاتە بەردەمی کۆشکێك دەبینێ کۆشکێکی سپی هەیە هەموی پڕە لە نەخش و نیگاری جوان بەسەر بانەکەیەوە کۆترێکی جوان هەڵنیشتووەو خاڵێك بەلای ملیەوەیە بەردەمی کۆشکەکە کە پڕە لە خەڵك بەخۆیان و ئەسپەکانیانەوە بوونەتە بەرد. ئەحمەد بەرد هەڵئەگرێ یەکەمیانی بەر ناکەوێ تا ئەژنۆی دەبێتە بەرد دوەمی بەرناکەوێ تا ناوقەدی دەبێتە بەرد سێیەمیشی بەرناکەوێ هەموو لەشی دەبێتە بەرد دوایی لەماڵەوە کچەکە دەستی لە کەفاو دا دەبێت ئەمستیلەکەی دەستی ڕەش دەبێت یەکسەر هەڵدەستێ پیرێژنەکە دەکوژێ و دەڵێ خەتای تۆ بووە براکەم نەماوە و دەست بە شیوەن و گریان دەکات و دەڕوا بەدوای براکەی دا بگەڕێ لە ڕێگا خدری زیندە دەبینێ دەڵێ هۆ فاتمە بۆ کوێ دەچی؟ ئەویش وەڵام دەداتەوە دەڵێ: ئەگەر بزانی ناوم فاتمەیە: دەزانی بۆ کوێ دەچم؟ خدر پێی دەڵێ:(براکەت بە بەرد بووە تۆ برۆ کۆشکێك هەیە لە وڵاتی چین گەر براکەت دۆزیەوە شورەیەك بە دەوری دا بگێڕە و شوێنەکەی پاك بکەرەوە و تا دەتوانی بەسەری دا بگری بەڵکو کچی

پادشای چین دڵی  نەرم بێت و بەزەیی بەتۆ دا بێتەوە  براکەت بۆ چاك بكاتەوە) .

فاتمە دەڕوا دەڕوا تا دەگاتە ئەو شوێنەی براکەی لێیە دەگری بەدەم گریانەوە شورەیەك بۆ براکەی دروست دەکات و پاکی دەكاتەوە دەیكاتە شیوەن و هاوارو گریانێك چەند ڕۆژێك بەردەوام دەبێت کچە پادشاش زۆر بەزەیی پیێ دادێتەوە و لە دڵی خۆیدا دەڵێ: خوایە بانگم بکات بۆ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە .

کچەکەش دێتە فکری کە بانگی بکات هاوار دەکات(کراس رەقازی)یەکسەر ئەویش وەڵام دەداتەوە، دەڵێ: گیان. لەم وەڵامەدا تا نیوەی براکەی چاك دەبێتەوە بۆ جاری دووەم  و سێ هەمیش بانگی دەكاتەوە و چاك دەبێتەوە هەمو گیانی براکەی هەموو بەبەرد بوەکانی دەور و بەر چاك دەبنەوە کچە پادشا دەڵێ: خوا هەمووتان بە قوربانی فاتمە بکات ئەگینا هەتا هەتایە بەرد دەبون هەمو کوڕە پادشاکانی تریش چاك دەبنەوە کە هاتبون بۆ ئەوەی کراسی ڕەقازی بخوازن کچە و کوڕە دەچنە بەردەمی کچی پادشای چین و دەیهێنن. کوڕەکە کە چاوی پیێ دەکەوێ یەکسەر لەهۆش خۆی دەچێ لەجوانی کچە پادشا! پاش ئەمە دەبنە ژن و مێرد و دەچنەوە بۆ شاری کچە و کوڕە کراس ڕەقازی سحر باز دەبێت و بڕیار دەدات ماڵی پادشا واتە باوکی یەکەمی ئەحمەد دەعوەت بکات بۆ ماڵی ئەحمەد چونکە ئەو نهێنی ئەحمەد و فاتمە دەزانێ هەمو ماڵی پادشا دەعوەت دەکات و دوای نان خواردن تەنها پادشا ماوە نان بخوات ژنی ئەحمەد هەموو ئێسکەکانی سەر سفرەکە کۆ دەکاتەوە و دەیباتە بەر دەمی پادشا .

پادشا توڕە دەبێت و دەڵێ: (خۆ من سەگ نیم ئێسك بخۆم)کراس ڕەقازی وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: گەر سەگ نیت چۆن سەگت بوو؟ پادشا توڕە دەبێت و بانگیان دەکات فاتمە و ژنی ئەحمەد سەریان دادەپۆشن و دەچنە لای پادشا لەگەڵ ئەحمەد(کراس ڕەقازی سحر باز) هەموو نهێنیەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە پادشا فرمان دەدات کە جارێ یەکسەر داکیان بهێنن بزانن ماوە کە داکیان

دەهێنن سەیر دەکەن ماوە و بەڵام زۆر هیلاکە یەکسەر دەیخەنە ناو شیرەوە و بۆ ئەوەی گیانی نەرم بێتەوە .

پادشا بڕیار دەدات دوو ژنەکەش بهێنن هەر یەکەیان سواری ئەسپێك بکەن یەك لە ئەسپەکان برسی بێت و بەرامبەری نان دابنێن ئەوی تریان تینو بەرامبەریان ئاو دابنرێ هەتا ئەمرن بەسەر پەرشتی ئەو ئەسپانەوە بن پاش ماوەیەك هەردووکیان دەمرن و دایکی منداڵەکانیش چاك دەبێتەوە بە منداڵەکانی شاد دەبێتەوە .

(چاکە بۆ چاکە کار بێت )

(خراپەش بۆ خراپە کار بێت)

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: خواردن دروستکردن لەناو ئەنگوستیلە و بەشی هەموو میللەت دەکات، کچ و کوڕی پرچ ئاڵتونی و مرواری، تەشتی ئاو دەبێتە ئاڵتون. تەشتێك هەیە خۆی جل دەشوات. بوونە بەرد کەسەکان و بانگ کردنوو چاك بوونەوەی .**

# ئاسکە

**کۆکردنەوە: ساکار ڕەسول ڕەشید**

**دەگێڕنەوە: کە ژن و مێردێك هەبوون، ئەم ژن و مێردە یەکتریان زۆر خۆش ئەویست . بەلاَم ئەوەی کە ژیانی زۆر لێیان ناخۆش کردبوو، ئەوە بوو کە منالَیان نەدەبوو نزیکەی (10)سالَیش بەسەر ژن و مێردایەتیان تێ پەڕیبوو . ڕۆژێکیان ژنەکە لە حەوشەی مالَەوە بەغەمباری دانیشتبوو لەپڕ گوێی لە دەنگێك بوو کە لەدەرەوە هات و هاواری دەکرد (فالَ ئەگرینەوە … فالَ ئەگرینەوە …)ژنەکە بە پەلە ڕای کردە دەرەوە بانگی فالَ گرەوەکەی کرد و پێی ووت: کە فالَیان بۆ بگرێتەوە، بزانێ منالَیان دەبێ یا هەر بەم جۆرە ئەمێننەوە .**

**کە فالَ گرەوەکە سەیری کرد و بەختەکەی بۆ گرتەوە پێی وت: (ئێوە تا ماوەیەکی زۆر دوور و درێژ مندالَتان نابێ، بەلاَم من ئێستا دەرمانێکت ئەدەمێ ئەم دەرمانە کەمێك شیری لەسەر دانێ و لەسەربان لەژێر جریوەی ئەستێرەکان دایبنێ و بەیانیش بەر لەخۆر هەلاَتن بەر لەوەی تیشکی خۆری بەرکەوێ ئەم دەرمانە بخۆرەوە) ئینجا ژنەکە ڕۆیی چی فالَچییەکە پێی وتبوو تەواو جێ بەجێی کرد .**

**ئەو شەوە مێردەکەی درەنگ لە ئیش دەگەڕێتەوە کە دێتەوە زۆر هیلاك و برسیەتی کە چاوی بەم دەرمانە ئەکەوێ ڕێك ئەیخواتەوە وا ئەزانێ شیرە ئینجا خەوی لێ ئەکەوێ بەیانی زوو ژنەکە هەلَدەستێ بۆ ئەوەی بچێ دەرمانەکە بخواتەوە سەیر ئەکا جامەکە بەتالَەو دەرمانی تیا نەماوە سەری سوڕ دەمێنێ !**

**بۆیە ئەچێ مێردەکەی بەخەبەر دێنێ و لێی ئەپرسێ ئەلَێ : (ئەم دەرمانە چی لێهات ؟)**

ـ مێردەکەی: (کە شەو گەڕامەوە زۆر برسیم بوو هیچ نەبوو بیخۆم بۆیە ئەم شیرەم خواردەوە)

ـ ژنەکەی: (ئەمە دەرمانی منالْ بوونی تیا بوو !)

کەواتە ئێستا تۆ زگت پڕ دەبیْ و مندالْت دەبیْ ! پیاوەکە کە گوێی لەم قسەیە بوو زۆر پەشۆکاو بیری لە داهاتووی خۆی کردەوە کە چی ڕوو ئەدا ئەگەر پیاو منالْی بیْ! ڕۆژ بەڕۆژ پیاوەکە ڕانی قاچی ڕاستەی وردە وردە هەڵئەستاو گەورە ئەبوو . بۆیە پیاوەکە بڕیاری دا کە لەماڵەوە نەچێتە دەرەوە. بۆیە ژنەکە لەجیاتی ئەو هەموو کارەکانی ئەنجام ئەدا . پیاوەکە لەسەر ئەم بارە مایەوە تا نزیکەی (9)مانگ. بۆیە کە ماوەی مندالْ بوون نزیك بوەوە . بەژنەکەی وت: (ژنەکە ئێسترەك و چەقۆیەك  شقارتەیەکم بۆ ئامادە بکە، بۆ ئەوەی بچم لە دەرەوەی شار ئەم بەلآیە لەکۆڵْ بکەمەوە) کەشەو داهات پیاوەکە سواری ئێسترەکەی بوو بۆ ئەوەی بڕوا ژنەکەی پێی ووت:(پیاوەکە تکات لیْ دەکەم منالْەکە لەگەڵْ خۆت بێنەوە تا بەخێوی بکەین) .

پیاوەکە (من منالْەکە بەجیْ دەهێڵم ئەگەر خوا بیەویْ بژی ئەوا بۆ خۆی دەیژیەنیْ)ئینجا بەڕیْ کەوت ڕۆیشت تا گەیشتە دۆڵێك کە پڕ بوو لە دار و درەخت گیان لەبەر و جۆرەها گولْ، لەتەنیشت ڕوبارێکەوە دانیشت بۆ ئەوەی ماندوی بحەسێتەوە لەپڕ قاچی دەستی بەژان کرد بۆیە ئاگرێکی کردەوە چەقۆکەی لەناو ئاگرەکە داخ کرد و گۆشتی ڕانی دەستی بە شەق بوون کرد منالێکی کچی جوانی لیْ هاتە دەرەوە پیاوەکە برینەکەی قاچی داخ کرد و منالْەکەی لە پارچە قوماشێك پێچایەوە لەکەناری ڕووبارەکە بەجێی هێشت و خۆشی گەڕایەوە بۆ ماڵەوە .

پاش کەمێك کۆمەڵیْ ئاسك (مامز)هاتن بۆ سەر ڕووبارەکە بۆ ئاو خواردنەوە یەکێك لەئاسکەکان چاوی بە منالْەکە کەوت لێی نزیك بوەوە بە زمانی منالْەکەی لێستەوە و گوانەکانی بردە پێشەوە بۆ ئەوەی شیر بدات بە منالْەکە ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەم منالْە لەگەڵْ ئاسکەکان پەروەردە بوو تا گەورە بوو بوە کچێکی زۆر جوانی قەشەنگ .

ڕۆژێك شازادەیەك لەگەڵ كۆمەڵێك لە دارو دەستەكەی و هاوڕێكانی هاتبوونە ئەم ناوە بۆ ڕاو و شكار، لەپڕ چاویان بە ئاسكەكان دەكەوێ كە شتێكی زۆر سەیر لەگەڵیان ڕا ئەكا بۆیە لە هاوڕێكانی پرسی ئەم شتە چییە؟ ئەوانیش نەیانزانی كە شازادە گەڕایەوەماڵەوە هەر بیری لێ ئەكردەوە !
بۆیە بڕیاری دا بچێ ڕاوی بكات .

بەیانی سینیەك ئامادە ئەكا و پڕی دەكا لە ئارد و هەنگوین و دۆشاو لەگەڵ خۆیدا ئەیبا بۆ كەناری ڕووبارەكە دای ئەنێ كاتێك ئاسكەكان دەگەنە سەر ڕووبارەكە بۆ ئاو خواردنەوە كچەكە چاوی بەم خواردنە ئەكەوێ زۆری لێ ئەخوات چونكە خواردنەكە زۆر شیرین بوو بۆیە ئاوێكی زۆریشی خواردەوە بەمە سكی زۆر گەورە دەبێ و لەشی قورس دەبێ .

شازادە لە دوورەوە چاودێری ئەكرد و سواری ئەسپەكەی بوو بەدوای ئاسكەكان كەوت كە كچەكەشیان لەگەڵ بوو كچە دەستی كرد بە ڕا كردن بەڵام نەیدەتوانی خێرا ڕا بكات چونكە ئاوو خواردنی زۆر خواردبوو . ئیتر كچە بەر ئەبێتەوە شازادە ئەگاتە سەری سەیر دەكا كچێكی زۆر جوانە ! لەگەڵیان دەژی جل و بەرگی لەبەر نەبوو لێی پرسی (ناوت چییە ؟)بەڵام كچە نەی ئەزانی قسە بكاو چەند دەنگێكی لێوە هات وەكو دەنگی ئاسك وابوو. ئیتر لەگەڵ خۆی سواری ئەسپەكەی ئەكاو ئەگەڕێنەوە بۆ كۆشكی شاهانە . ئیتر وورده وورده شازادە كچەكە فێری جل لەبەر كردن و نان خواردن و قسە كردن ئەكاو ناویشتی لێ ئەنێ (ئاسكە) .

ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر ئەم دوانە یەكتریان خۆش ئەویست ڕۆژێك شازادە بە ئاسكە دەڵێ (من هەموو كەس و كارو هاوڕێكانم كۆ ئەكەمەوە و دێین بۆ خوازبێنی) ئاسكە بەم قسەیە دڵی زۆر خۆش بوو. بۆیە هەموو ڕۆژێك لە پەنجەرە چاوەڕێی ئەكرد كە شازادەكەی دێت بۆ لای . ڕۆژێكیان لە پەنجەرەوە سەیر ئەكا كە ژنێكی ڕەشی ناشیرن منداڵێكی بە دەستەوە بوو لە ڕووبارەكەی نزیك كۆشكی ئاسكە منداڵەكەی ئەشوشت كە ژنەكە سەیری ڕووبارەكەی ئەكرد وێنەی ئاسكەی بینی كە زۆر جوان بوو وای زانی وێنەی خۆیەتی! بۆیە منداڵەكەی فڕێ دایە ئاوەكەوە و وتی: (من ئەوەندە جوانم و خزمەتی منداڵی

گەوەکەشم بکەم) ئیتر مناڵەکە ئەخنکێنیٚ . کە ئاسکە گوێی لیٚ دەبیٚ ئەمە دەبینیٚ ئەڵیٚ (ژنەکە ئەمە وێنەی منە لە ئاوەکە نەکو وێنەی تۆ)کە ژنەکە ئاسکە دەبینیٚ لەجوانی ئاسکە سەری دەسوڕمیٚ و ئەڵیٚ (تکات لیٚ دەکەم ئێستا کەس و کاری ئەم مناڵە بێن دوور نییە بمکوژن تکایە ڕزگارم بکە)
ئاسکەش پەتێکی بۆ هەڵئەداتە خوارەوە ژنەکە بەم پەتە سەر ئەکەوێتە سەرەوە و سوپاسی دەکا ئینجا بە ئاسکە دەڵیٚ: ئەم جلانەت زۆر جوانە ئەمدەیتیٚ ؟

ـ ئاسکە : بەڵیٚ با بۆ تۆ بیٚ جلەکانی ئەداتیٚ .

ـ ژنەکە : ئەم زێڕانە زۆر جوانە ئەمدەیتیٚ ؟

ـ ئاسکە : بەڵیٚ فەرموو زێڕەکانی ئەداتیٚ .

سەرباری ئەم هەموو چاکەیە ژنەکە شوژنێك دەرئەهێنیٚ و لە گیانی ئاسکە ڕا ئەکا بۆیە ئاسکە لەبەر چاو ون دەبیٚ .

پاش ماوەیەك شازادە کەس و کارو هاوڕێکانی کۆ ئەکاتەوە بۆ ئەوەی بێنیٚ بۆ خوازبێنی (ئاسکە) بە هاوڕێکانی ئەڵیٚ: (من بە تەنیا ئەچم خۆشەویستەکەم دەهێنم)کە دەگاتە نزیك کۆشکی ئاسکە هاوار ئەکا : (ئاسکە ... ئاسکە)بەلاٚم کەس جوابم ناداتەوە ئیتر شازادە سەر ئەکەوێتە ژوورەکەی ئاسکە سەیر ئەکا ژنێکی ڕەشی ناشیرن لەویٚ درێژ بووە! لێی ئەپرسیٚ شازادە: تۆ کێیت ؟

ـ ژنە: من ئاسکەم

ـ شازادە: دەم و چاوت بۆ وا ڕەش بووە .

ـ ژنە: چونکە لەبەر هەتاو زۆر چاوەڕێم کردی .

ـ شازادە: پرچت بۆ وا ئاڵۆزە .

ـ ژنە: لە دووری تۆ هەر ئەم بری .

ـ شازادە: چاوەکانت بۆ وا ناشیرینە .

ـ ژنە: لە دووری تۆ زۆر گریاوم

ئینجا شازادە ئەگەڕێتەوە لای هاوڕێکانی ئەڵیٚ : (کچەکە ڕای کردووە بۆیە ئەڵیٚ بەدوای دا بگەڕێین تا ئەی دۆزینەوە) .

دوای نزیکەی دوو هەفتە گەڕان بەڵام هیچ سودێکی نەبوو . شازادە بەیانیەك کە لەخەو هەڵئەستێ سەیر ئەکا درەخێك لە نزیك پەنجەرەی ژوورەکەیەوە ڕواوە بۆیە زۆر سەری دەسوڕمێ لە ڕووانی ئەم درەختە !

کاتێك یەکێك لە خزمەتکارەکان دێت بۆ خاوێن کردنەوەی ئەم ناوە لەپڕ خاکەناسەکەی بەردەکەوێ دارەکە دەست دەکا بە جوولە لەگەڵ جوولەکە دەنگێکی لێوە دەهات و هاواری دەکرد (شازادە ڕزگارم بکە ...)شازادە گوێی لەم قسە بوو زۆر تێك چوو . لەگەڵ هەر جوولەیەکی ئەم درەختە ئەم دەنگەی لێوە دەهات بۆیە زۆر بێزار بوو . بۆیە فەرمانی بە دارتاش کرد کە ئەم دارە ببڕێ بۆ ڕۆژی دواتر دارتاش دەستی کرد بە بڕینی ئەم درەختە لەگەڵ بڕینی درەختەکە ئەویش هەر هاواری دەکرد . کەدارتاش لە بڕینی دارەکە تەواو دەبێ دەگەڕێتەوە ماڵەوە کە ژنەکە ئەچێتە لای مێردەکەی سەیر ئەکا پەلە دارێ بەمێردەکەیەوە نوساوە . بۆیە لێی ئەکاتەوە بەڵام ئەم پەلە دارەی بەلاوە زۆر جوان ئەبێ بۆیە لە قوژبنێك دای ئەنێ کەشەو داهات پەلە دارەکە دەبێتەوە ئاسکە شەو هەموو کارەکانی ماڵی دارتاش تەواو ئەکاو نانی بەیانیان بۆ ئامادە دەکا . بۆ بەیانی کە دارتاش و ژنەکەی خەبەریان ئەبێتەوە زۆر سەیریان بەم ڕووداو دێت کە کێ ئەم کارەی ئەنجام داوە . بەڵام ئەمجارە زۆر گوێ نادەنێ بەڵام ئەمە چەند جارێك دووبارە دەبێتەوە . بۆیە دارتاش دەڵێ (دەبێ ئەم شەو بزانم کێیە ئەم کارە ئەنجام ئەدات؟).

بۆیە کە شەو داهات پەنجەیەکی خۆی کەمێ بریندار ئەکاو کەمێك خێی لەسەر دا ئەنێ بۆ ئەوەی خەوی لێ نەکەوێ . خۆشی لە پەنای تەنورەکەوە چاودێی ئەکا . لە نیوەشەودا کچێکی زۆر جوان دێتە دەرەوە خەریکی هەویر شێلان دەبێ کاتێ لە شێلانی هەویرەکە تەواو دەبێ لە تەنورەکە نزیك ئەبێتەوە بۆ ئەوەی کە ناو دروست بکات لەناکاو دارتاشەکە پەلاماری ئەداو ئەیگرێ و لێی ئەپرسێ:(تۆ کێیت مرۆڤی یا جنۆکە چۆن هاتی بۆ ئێرە ؟)ئاسکەش ڕووداوەکەی بە جوانی بۆ ئەگێڕێتەوە بەڵام داوای لێ ئەکا کەلای کەس باسی نەکاو ئەم نهێنیە نەدرکێنێ . دارتاشەکەش بەڵێنی ئەداتێ و ئەیباتە لای ژنەکەی و پێی دەڵێ: (با ئەم کچە هەموو شەوێك بێت بۆ ماڵی

ئێمەو خواردنمان بۆ ئامادە بکاو ماڵمان بۆ پاك بکاتەوە بەیانیش بەر لەخۆر هەلأتن بڕوات)ژنەکە ڕازی دەبێ بەلأم نهێنی ئەم پەلە دارە نازانێ شەوێکیان شازادە زۆر بێ تاقەت ئەبێ و دەست دەکا بە گەڕان بەناو شاردا دواتر دەگاتە بەردەمی ماڵی دارتاشی لەپڕ لەسەربان چاوی بە (ئاسکە)دەکەوێ ئاسکەش سەیری دەکا . دواتر ئاسکە ڕائەکا بەلأم شازادە باوەڕناکاو ئەڵێ ڕەنگە وڕێنە و خەیاڵم کردبێ بەلأم کە دەگەڕێتەوە ماڵەوە ئەڵێ دەبێ ئەمە ئاسکە بێ لەو ماڵە بێ . بۆیە بەدایکی ئەڵێ (دایکە بڕۆ بۆ ماڵی دارتاش و ئەو کچەی لەماڵی وانە بۆمی بهێنە) .

دایکەکە ئەڵێ (کوڕم ماڵی دارتاش مناڵیان نییە !)بەلأم شازادە هەر سوڕ دەبێ لەسەر قسەی خۆی . بۆیە دایکی ئەچێ بۆ ماڵی دارتاش و لە دەرگا ئەدا. ژنی دارتاش دەرگا ئەکاتەوە کە ژنی شا ئەبینێ زۆر سەیری پێ دێت و ئەڵێ (فەرموو خانم ئەمر کە)

ـ شاژن ئەڵێ (کوڕەکەم داوای کچی ئێوەی کردووە)

ـ ژنەکە (بەلأم ئێمە کچمان نییە لەدونیا هیچمان نییە جگە لەو پەلە دارەی مێردە دارتاشەکەم کە زۆر بەلایەوە خۆشەویستە)دایکەکە ئەم ڕووداوە بۆ کوڕەکەی ئەگێڕێتەوە . شازادە ئەڵێ : (دایکە بڕۆ ئەم پەلە دارەم بۆ بێنە) دایکی پەلە دارەکەی ماڵی دارتاشی بۆ دەهێنێ . کەدارتاش دەگەڕێتەوە ژنەکەی بۆی ئەگێڕێتەوە ئینجا دارتاش ئەڵێ : (ئافرەت ئەم پەلە دارە ئاسکە بوو) ئیتر شازادە بچووبایە هەر شوێنێك ئەم پەلە دارەی لەگەڵ خۆیدا ئەبرد تەنانەت لەکاتی نوستنیشی ئەیبردە ژوورەکەیەوە . هەموو شەوێك ئاسکە دەردەکەوێتەوە و لە ژوورەکەی شازادە ئەسووڕێتەوە . شەوێکیان شازادە چاوی ئەکاتەوە شازادە دەبینێ سەیری پێ دێ و وا ئەزانێ خەو دەبینێ . هەڵئەستێ و لێی ئەچێتە پێشەوە و سەیر ئەکا ئاسکەیە ئینجا ئەیخاتە باوەشی و ئاسکەش ڕووداوەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە . بە شازادە ئەڵێ (ئەبێ بچین بۆ لای ژنەکە داوای لێ بکەین ئەم شوژنە دەربێنێ تاکو چاك دەبمەوە و ئەبێ هەر ئەمشەو بچین بەر لەخۆر هەلأت)دەچن بۆ ژووری ژنە جادوکەرەکە شازادە ئەیگرێ و فەرمانی پێ ئەکا دەری بێنێ و ئاسکە چاك بکاتەوە ئینجا ژنەکە

دەری دەهێنێ و شازادەش ژنەکە لە پەنجەرەوە ئەخاتە خوارەوە ژنە جادوکەرەکە ئەمرێ .
شازادە و ئاسکەش بەیەك دەگەن و ئاهەنگێکی خۆش دەگێڕن حەوت شەو و حەوت ڕۆژ بەردەوام دەبێ و دارتاش و خێزانەکەشی کەوتنە ژیانێکی زۆر خۆشەوە .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: دەرمان خواردنی پیاوەکەیە، دەبێتەهۆی سك بوونی و لەدواییدا کچێکی دەبێ، ژنە جادووکەر سوژن لە یەخەی کچە دەدات و بزری دەکات، دوای بە شێوەی دارێك لەبەر پەنجەرەی کوڕە شین دەبێ و دارتاش دارەکە دەبڕێتەوە، پاش ئەوەی دارەکە دەنگی لێوەدێ و دەجولێ، پارچە دارێك بەلەشی دارتاشەکەوە گیر دەبێ و شەو لە ماڵیان دەبێتەوە بە ئاسکە، دواجار سوژن لە ئاسکە دەکەنەوەو دەبێتەوە کچی جاران. ئەوەی لێرە سەیرە پیاو منداڵی دەبێ و سوژنیش کە لە حەکایەتی ئەفسانەیی لە یەخەی شەوە دەدرێ، لێرە لە یەخەی کچە ـ ئاسکە ـ دراوە لێرە بە ڕوونی باوەڕی کراس گۆڕین دیارە لە جێگۆڕکێی گیان لە نێوان کچە و داری سەوز و وشك و جارێکی تر کچەی جاران .**

# ئەو دوو کوڕەی گورگ و ئاو بردنی

**کۆکردنەوە: سەمیرە خورشید مەولود**

**گێڕانەوە : نامیق کـەریم ڕەشید**

دەگێڕنەوە دەڵێن: کابرایەك لە گوندێکی نزیك شارێك دەژیا لەگەڵ ژنەکەی و دوو منداڵەکەی (هەردوو منداڵەکە کوڕ بوون) کوڕی گەورەی یەك ساڵان دەبێ و بەڵام کوڕە بچوکەکەی سێ مانگان دەبێ، ماڵی باوکی ئەو پیاوەش لەشاری دەژیان . کابرای بەژن و ماڵەکەش بەخێزانەکەی دەڵێ با بڕۆین بۆ ماڵی باوکم واتە لە گوندیەوە بۆ شار، بەڵام پردێك لە نێوان گوند و شارەکە دەبێت. لە ڕێگادا شەویان بەسەر دادێت ، بەڵام چ شەوێ شەوێکی چەندی بڵێی تاریك و ترسناك، جگە لەوەی کە بارانیش دەبارێ کاتێ ئەو خێزانە دەگەنە نزیك پردەکە کوڕە یەك ساڵیەکە لە دەستی باوکی دەکەوێتە ناو ئاوی ژێر پردەکەوە . باوکی کوڕەکە بەدوای منداڵەکەدا دەگەڕێت ، بەڵام بێ سودە و نایبینێتەوە ! .

دواتر ژنی پیاوەکە بە ڕۆخی ئاوەکەدا بەدوای پیاوەکەی و منداڵەکەی دادەڕوات، منداڵە سێ مانگیەکە کە مەلۆتکەیە لە شوێنێکی نزیك پردەکە دادەنێت، پاش ماوەیەك گورگێك تووشی منداڵە سێ مانگیەکە دەبێت و دەیبات، دواتر ژنەکە دەگەڕێتەوە بۆ لای منداڵە مەلۆتکەکەی کاتێ سەیر دەکات، منداڵەکە لەشوێنی خۆی نەماوە، ئا لەو کاتەدا دوو دزیش دەچن بۆ ئەو گوندە (ئەو دوو دزە لەشارەوە هاتبون بۆ گوندەکە)یەکێ لەو دزانە ژن و ماڵی هەبوو بەڵام، دزەکەی تریان گەنجەو ژنی نەهێناوە. لەو شەوەی کە ئەو ڕوداوە بەسەر ژنەکەو پیاوەکەو دوو منداڵەکە داهات دزەکان هیچیان دەست نەکەوت. چونکە ئەو شەوە بارانێکی زۆر باری بوو، یەکێ لە دزەکان ژنی کابراکە بەدوای مێردەکەی و منداڵەکەیدا دەگەڕا دزی، کاتێ مێردی ژنەکە بە نائومێدی دەگەڕێتەوە، وا دەزانێ ژنەکەی منداڵەکەی ماوە گەڕاونەتەوە ماڵەوە. بەڵام، کاتێ کابرا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆیان کە لەگوندیە سەیر دەکات ژنەکە لەوێ نییە، کابرا ناچار دەبێ بچێتە ماڵی باوکی تا بزانی

ژنەکەی لەوێیە، بەڵام کە دەچێتە ماڵی باوکی سەیر دەکات ژنەکەی نەچۆتە وێش، کابرا ناچار دەبێ بە چیا بکەوێ بۆ گەڕان بەدوای ژنەکەی و دوو منداڵەکەی. دواتر ئەو منداڵەی کە ئاو بردبوی ئاشەوانێك دەیگرێتەوە کوڕە بچوکەکەش کە گورگ بردبوی، مەڕدارێك هەڵی دەگرێتەوە ، ئەو کوڕەی کە ئاو بردبوی (20)ساڵ لەماڵی ئاشەوانەکەدا مایەوە وە کوڕە بچوکەکە کە مەڕدارەکە هەڵی گرتبوو بۆ ماوەی (20)ساڵ لەوێ مایەوە، دواتر لە مەڕداری و شوان کاری بێزار دەبێ و ڕوو دەکاتە شار بۆ کاسبی و نان پەیدا کردن، بە هەمان شێوەش کوڕە ئاشەوانەکە بێزار دەبێ لە ئاشەوانی ڕوو دەکاتە شار بەڕێکەوت ئەو دوو کوڕە یەکتری دەناسن و خەریکی کاسبی دەبن و وەکو برا دەژین. بەڵام، ئەوان (دوو کوڕە براکە) نازانن کە بەڕاستی برای یەکترن. باوکیشیان هەر لەچیادا لەناو ئەشکەوت دەنوست و ژیانی دەبردە سەر ئەو دوو کوڕەش شەوانە لە فندقێك دەنوستن. بەڵام، دایکیان هەر دەست بەسەرە لەلای کابرا دزەکە ! .

ڕۆژێکیان پاشای ئەو شارە دەیەوێ باز هەڵبدات و یەکێکی تر ببێت بە پادشای ئەو شارە. ئەو ڕۆژەش باوکی کوڕەکان هاتبوە شار کە سەرو پرچێکی زۆر ڕیشێکی سپی زۆر هاتبوو، کاتێ پاشا بازی هەڵدا بەڕێکەوت بازەکە چوە سەر شانی باوکی هەردو کوڕەکە. بەڵام، خەڵکەکە ڕازی نەبون کە ئەو ببێتە پاشایان. بۆیە پاشا ناچار بو کەلەسەر داواکاری زۆری خەڵکەکە دیسان باز هەڵدەنەوە. کاتێ بازەکە دوو بارە هەڵدرایەوە دیسان لەسەر شانی باوکی کوڕەکان هەڵنیشت و ئینجا ئەو کرا بە پادشای ئەو شارە!!

پاشان بە پاشای تازە گوترا کە دەبێت (10)کەس بۆ پارێزگاری (حمایە)کردن لەخۆتی هەڵبژێرێ ئەویش (10)کەسی هەڵبژارد و کردی بە پاسەوانی خۆی و ماڵەکەی هەردوو کوڕەکەی خۆی و ئەو کابرایەی کە ژنەکەی دزی بوو لەو (10) کەسە بوون کە کرابونە پاسەوانی پاشای تازەی شار . ڕۆژێکیان ئەم دە پاسەوانە بەیەکەوە دەگەڕان کابرای دزەکە (ئەوەی کە دایکی دوو کوڕەکەی دزی بوو)داوای لەیەکێ لە پاسەوانەکان کرد کە شەوێ بچن لەماڵی دزەکە بخەوێ (داوای لەو پاسەوانە کرد کە ئەو کوڕە سێ

مانگیەی کە گورگ بردبوی چونکە کابرا دزەکە ئەو کوڕەی زۆر خۆش دەویست) کوڕەکە زۆری هەوڵدا کە نەچێ بۆماڵی کابرا دزەکە! بەڵام، کابرا دزەکە گوتی: هەر دەبێ بچی. ناچار کوڕەکە چو بۆ ماڵی کابرا دزەکە کە دایکی ئەو کوڕە لەو ماڵەیە کەکاتی خۆی کابرا دزی بووی . پاشان کوڕەکە دەچێتە وێ و ژنەکە بەخێر هاتنی دەکات و کە دەکاتە دایکی کوڕەکە . ژنەکە لێی دەپرسێ ناوت چییە ؟ وە خەڵکی کوێی؟

کوڕەکە دەڵێ: نازانم خەڵکی کوێم! ژنەکە لێی دەپرسێت چۆن نازانی ؟ کوڕەکە دەڵی: نازانم چونکە کاتی خۆی گورگ منی بردوە و کابرایەکی شوان منی لەدەم گورگ ساندۆتەوە پاشان دەڵێ: ژیانت لەگەڵ کێدا بردۆتە سەر ؟ کوڕەکە دەڵێ: ماوەیەکی زۆر لەماڵی شوانەکە مامەوە دواتر بێزار بوم ڕووم کردە شار لەگەڵ کوڕێك دادەژیام کە کاتی خۆی ئاو بردبووی ئاشەوانێك گرتبویەوە ، دواتر ژنەکە بە کوڕە میوانەکەی گوت: دەتوانی بەیانی کوڕەکەی ترم بۆ بانگ بکەی ! کوڕەکەش گوتی: باشە کە بەیانی ڕۆژ بۆوە هەردوو کوڕەکە هاتنەوە ماڵی کابری دز ئینجا ژنەکە پرسیاری لە کوڕەکە کرد (ئەو کوڕەی کە کاتی خۆی ئاو بردبووی)باسی ژیانی و بەسەرهاتی خۆی بۆ بکات.

پاش گێڕانەوەی ژیان و بەسەر هاتیان دەرکەوت کە ئەو دوو کوڕە برانەو کوڕی ژنەکەن، پاشان ژنەکە گوتی: باشە با پیاوەکەم نەزانێ! دەچینە لای پاشای تازەی شار شکایەتی لێ دەکەم ، کە بەیانی ڕۆژ بۆوە چوونە لای پاشا بە دزی پیاوەکەی (کابرا دزەکە)شکایەتیان لێ کرد ، پاش گێڕانەوەی بەسەر هاتی هەرسێکیان هەردوو کوڕەکەو ژنەکە دەرکەوت کە ئەوانە کوڕی پاشان و ژنەکەش ژنی پاشا بووە .

پاش (22)ساڵ بەسەر ئەم بەسەرهات و لێك دابڕانەی ئەو خێزانە بەیەکتر شاد بونەوە کابرای دزەش بە سزای خۆی گەیشت . منیش پێڵاوم دڕاو هیچم پێ نەبڕا .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: کوڕەی گورك بردوو هەڵدانی بازە بۆ هەڵبژاردنی پاشا .**

# کولك و کەڕۆ

**کۆکردنەوە: شلێر حوسێن حەســەن**
**گێڕانەوەی:حوسێن حەسەن عەبدولاّ**

چار برای خوشکەك دەبن ساراغاو حەمەد ئاغاو عومەر ئاغا و عەلی ئاغاو خەجێی خوشکیان. دوو سێ کەس دێن لۆ ژن بە ژنێ کردن لەگەریان بەدوو ژنیش بە پارەش لەگەریان نەدەکردن. دەیانگۆت: بەچار ژنان دەدەین خوشکەکەمان .

ئەو جارە سرێمان ئاغا ساحێبی عێل و عەشیرەتەکی دیکە بوو، داوای خوشکەکەی لێ کردن نەیاندایێ، ئەوجا لەدوایی حەزیان لەیەك کردوو هەستا سرێمان ئاغا خوشکەکەیانی بردوو هەموو عێل و عەشیرەتی و مار و مرکی بەجێ هێشت .

برایەکانی خەجێ هەریان کوتا سەر عێل و عەشیرەتی سرێمان ئاغای هەموویان داگیر کردوو گۆتیان: ئەوەی بەسایەیی (ساراغاو حەمەد ئاغا)ی دادەنیشی با دانیشی دەنا با بڕوا . پاشان (هەشت نۆ ساری پێ چوو)سرێمان ئاغاو خەجێ دوو کوڕیان بوو، ناویان لێ نابوون (کولك و کەڕۆ) هەتا کولك و کەڕۆش جاعێر دەبن ئەوجا داك و بابیان دەمری کولك و کەڕۆ بەس ئامۆزایەکی کچیان لەکن دەمینێ لە عەشیرەتەکەیان .

مەلای گوندی بە تەمای ئەو کچەی ئامۆزایتیان، بەرام کچەکە مێردی پێ نەدەکردو کولك و کەڕۆش نەیان دەدایێ .

ـ کەڕۆ:. ڕاوکەر بوو ، دەچووە ڕاوو شکاری لەگەلْ جاعێران .

ـ کولك:. لەمارێ لەدیوەخانێ دادەنیشت وەکی گۆتم کە مەلای گوندی بە تەمای ئامۆزایەکەیتی ئەوجا هەر جارێ دا وەکی دەهێناوە لۆ (کولك)ی .

گۆتی: کەڕۆ لۆ (کولك)نەبیتە سەرە شوان بزانین پێی دەکرێ .

لە کولکی پرسی کەڕۆ کولك گۆتی: باشە دەبمە سەرە شوان و پێم دەکرێ .

**کولك لە دەشتێ بوو دیتی یەکەك لە شوانەکان دەگریێ، کولك گۆتی: ئەوە دەگرییێی کێ غەدری لێ کردی؟ گۆتی: وەللاٰ کەس غەدری لێ نەکردیمە بەرام ئەوە (ساراغاو حەمەد ئاغا)خەرجی دەستینن لە گوندی دەگەڕێن ئەوانە (خارتن)دەتکوژن .**

**گۆتی: ئەمن دەکوژن ... ڕاوەستا .... ڕا**

**چووە سەر ڕێیان جەرەوی ماینی ساراغاو حەمەد ئاغا دەگری و دەرێ ئەنگۆ خەرجەی چەند سارەی بابی من دەبەن خەرجی ئەوەندە سارەم دەوێ ئەوجا ساراغا دەرێ وەرنە خوارێ تێرکەکانیان لۆ ڕووکەن .**

**پاشان کولك (سەرە شوان بوو)هەموو پارەکانی دابەشی سەر شوانەکان کرد. شوانەکان چوونەوە دەستیان کرد بە دۆر و زوڕنا و شایی و هەراو بەزمەکی. ئەوجارە مەلا داوەکی کەی هێناوە گۆتی: مادام کولك ئەوەندە ئازایە لۆ ناچی لۆ (ماینی بێ جانە)هەتا ئێستا کەس نەشی دیتیە ئەو جارەش (کەڕۆ)ڕازی دەبی و قەراری لەسەر دەدا کە (کولك)بنێرێ .**

**کولك دەدرێتە ئامۆزایەکەی چمان هەیە لە مارێ لۆم دەربینە دەرێ؟ وەڵلا هەر(ئەسپی سەگراویمان) لە مارییە (ئەسپی سەگراوی) کولك لۆی دەچی چەنگە بازدەبی ئەوجا کولك مستەکی لەنیو چەوانی دەداو ئەوجا (ئەسپی سەگراوی) دەباو (مەحۆش) پیاوەکی دیوانەخانی خۆیتیان بەگەر کولکی دەکەوی. (کەڕۆ)ش هەر لەڕاو شاکارییە لەگەر جاعێران بەلام ئامۆزایەکەیان قەت ڕازی نەدەبوو کە (مەلا)بیهێنێ یان بیبا .**

**کولك لەگەر مەحۆی دەگاتە گوندی خارەکانی کە (ساراغا و حەمەد ئاغایە) کە کچەکەی ساراغایی دەداتە (قولە)ی کە پیاوەکی خۆیتیان .**

**کولك دەبینی وا شایی و دۆر و زوڕنا دەگەڕێ لەوێ لە شوانەکی دەپرسی دەرێ ئەو شایی و هەرایە چییە دەرێ وەللا ئەوا کچی (ساراغایی)لۆ (قولە)ی دەگوازنەوە شەوێ کولك دەگاتە ناو شایی بووك لە دووڕا دەبینی دەچیتە دەستی دەرێ ئەتۆ کێی ئەتو خەرکی ئێرە نی ئەتو غەریبەی پێی نارێ دەرێ هەبی و نەبی ئەتو (کولکی)دەرێ نەئا ئەمن کولك نیمە دەرێ هەنوکە پێم برێ دەنا ئاشکرات دەکەم بەهەر حارەکی بی پێی دەرێ ئا ئەمن کولکم چونکە بابی**

کچەکە (ساراغا)باسی کولکی لۆ کردبوو کە کوڕەکی هەتا دەست هەردەینی کەرەگەت و جوان بەشان و شەوکەت بوو . ئەوجا کچەکە لێی دەپرسی دەرێ لۆچ هاتی؟ ئەویش دەرێ وەللا لۆ (ماینێ بێ جانە)هاتیمە دەرێ کوڕە ئەتوو کوو (ماینێ بێ جانە)ت پێ دەچێ! هێشتا کەس نەیدیتیە . (ماینێ بێ جانە)بە حەفت زنجیران بەسترایەو حەرەسیاتی هەیە بەو شەرتەی پێشت دەچی (ماینێ بێ جانە)قولە بەرەبەیانیان (ماینێ بێ جانە)ئاو دەدات دەیهێنێتە سەر کانی ئەگەر ئەودەمەی زەفەری پێ ببەی دەنا پێت ناچی .

کولك شەوێ دەچی قۆرتەکی لێ دەداو لەسەر ئاوەکەی خۆی مات دەکات قولە بەیانی دا (ماینێ بێ جانە)ی هێنا ئاوی بدات . کولك پشتی تێدابوو (کوتەکەکی قیڕینی)لە تەختی نێوچەوانی داو دەواو دەو کەوتە ناو ئاوەکەو کوشتی (ماینێ بێ جانە)ی هێناو هاتەوە کن (مەحوێ)بەسەر گردی کەتەوە .
مەحۆ دەرێ کوڕە کوڕی چاك بە پیاوی چاك بە با بڕۆین کولك دەرێ وەللا ئەمن بەو عارە بی ناڕۆم کە پێم برێت (ماینێ بێ جانەی)دزیە .
خەبەر دەچی لۆیان دەرێن وەللا (قولە)ی کوشتیەو (ماینێ بێ جانە)ی بردیەو وا لەسەر گردیش دای کوتایە ئەوانیش خەبەری لۆ دەنێرن دەرێن ئەمە شەڕی لەگەر دەکەین .

کولك:دەرێ باشە ئەمن ئامادەم. کولك دەچێتە شەڕێ بەلاّم (مەحوێ)لەسەر گردی بەجێ دێڵێو ئاگاداری دەکاتەوە دەرێتە (مەحۆ)ی (ئەسپی سەگراوی) و (ماینێ بێ جانە)ئاوی (کانی گەنیاو)نەخۆنەوە لێیان خافر نەبی دەرێ باشە وەللا (مەحۆ)خەوی لێ دەکەوی و (ئەسپی سەگراوی)ئاوی (کانی گەنیاو) دەخواتەوە و پەکی دەکەوێ . لەوێ (کولك)بریندار دەبی و دەچێتەوە سەر گردی و دەرێتە (مەحۆی)نەمگۆت: نێڵی (ئاوی کانی گەنیاو)بخواتەوە وەللا ئەو جارە مەحۆ دەچی هەتا کولك خۆی دەپێچێتەوە و ئەوجارە (مەحۆ)دەکوژرێ و دەچیتە خوارێ کولك مەیتی مەحۆی دەینیتەوە سەر گردەکەی بەهەر نەوعەکی بی دەیشاریتەوە .
ئەوجارە (کەڕۆ)خەنی دەبینی شەوێ (دەبینی وا گورگەك بریندارە بەلاّم وا بەناو مەڕان کەتییە دەیانکوژی)بەخەبەر دێ دەرێ هەبی و نەبی ئەوا (کولکە).

(کەڕۆ)خۆی پێ ڕاناگیرێ لە ڕاو شکاریە دەرێ ئەنگۆ ڕاو و شکاری خۆتان تێك مەدەن ئەمن دەچمەوە مارێ دەرێتە ئامۆزایەکەی چ هەیە لە مارێ لۆم بینە دەرێ ئەویش دەرێ وەللا ئەسپەکی وەها هەیە بەڵام کەس نایوێرتێ . کەڕۆ سواری دەبی و دەگاتە سەر گردی دەبینێ وا (مەحۆ)کوژرایەو (کولك) لەناو شەڕییە و بریندارە ئەویش تەمەشا دەکا وا (کەڕۆ)ی برای هات دەچێتەوە سەر گردی و دەست لە ملی یەکتر دەکەن و یەکتر ماچ دەکەن دەرێ ئەگەر دێتە ناو شەڕێ ئەتو بەهیچ نەوعەکی تخونی من نەکەوی هەردوکیان چوونە ناو شەڕێ و لە هەردوو سەرداو وورد و یەخسیریان کردن ئەوجا خارەکانیان هیچیان پێ نەما بە پێخواسی و سەرکۆتی هاتن بەرەو پیلیان و کچەکەی خۆی (ساراغا)دایە کولکی و (ماینێ بێ جانە)و (کچەی ساراغا)و (مەیتی مەحۆیان)هێنایەوە و کە کولك بەو حارو مەسەلەی مەلای زانی بەرام (مەلا) کەهاتە سەر ڕێیان بە پێ خواس و سەر کۆتی بەرام کولك کە تەماشای خۆیان و مەیتی مەحۆی کرد هیچ خۆی پێ نەگیرا و مەلای کوشت و کچەکەی مامی ئامۆزایەکەی لە (کەڕۆ)ی مارە کردو هێنای کراشەکەم دڕاو هیچم پێ نەبڕا .

* لە شەڕی نێوان عەشیرەتان دەچێ .

# باوك و سێ كچەكەی

**كۆكردنەوە: شەهلە سەعید حەمەدئەمین**

**گێڕانەوەی: حـەســــەن حـەمــــەد**

باوكێك لەدوای ئەوەی ژنەكەی دەمرێ، ژنێكی تر دەهێنێتەوە بۆیە سێ كچەكەی هەتیو دەبن، بە قسەی زڕ دایكەكە هەر سێ كچەكەی دەر دەكات و بە بڕیاری ئەو دەبێت سەریان ببڕێ و بۆیە باوكەكە لەبەر ئەوەی دڵی نایەت بۆیە كەروێشكێك لەگەڵ خۆی دەبات و جلی ئەوان بەخوێنی كەروێشكەكە دەكات و كە دەڕواتەوە جلە خوێناویەكە بە ژنی دوەمی نیشان دەدات. ئەم سێ كچەش لەم گرد و سامانە دەمێننەوە تا چەند ڕۆژێك پاشان كچە بچوكەكە دادەنیشێ بە غەمگینی لەبەر دەمیەوە هەندەك خۆڵ لا دەبات تەماشای دەكات خورمای تێدایە دەیخۆن دوایی دیسان خۆڵ لا ئەبەن لەسەر زەویەكە ئەم جارە دەبینێ بەرەبەرە خانویەكی خۆش بەدەر دەكەوێت هەر سێ كچەكە دەچنە ئەوێ و ژیانیان زۆر خۆش ئەبێ چونكە بە هاوكاری و بە ڕێكی بەیەكەوە دەژین و ئیشەكان بە یەكسانی دابەش دەكات.

ڕۆژێكیان پیاوێك ئەگەڕا كۆڵان بە كۆڵان ماڵ بەماڵ ئەگەڕێ بۆ سواڵ كردن كە دەگاتە ماڵی سێ كچەكە دەیبەنە ژورێ و دەزانن باوكیانە باوكەكە هەموو شتێك بۆ سێ كچەكەی دەگێڕێتەوە كەكاتی خۆی چی لەسێ كچەكەی خۆی كردووە لەبەر ژنەكەی ئێستاش ژنەكەی لەگەڵی خراپە و سواڵی پێ دەكات و هەر لێی دەدات، سێ كچەكە باوكە دەشۆن و جل و بەرگی خاوێنی لەبەر دەكەن بە پیاوە دەڵێن: ئەو فەردەیەت دەدەینێ ببە بۆ ژنەكەت بەلاَم نەی كەیەوە با خۆی بیكاتەوە دەرگای لێ پێوەدە لەدوای ئەوە تۆ بگەڕێوە ئێرە پیاوە دەچێتەوە فەردە فەردە دەداتە ژنەكەی دەبینێ عەزیایەك دەردێ لە فەردەكە ژنەكە دەخوات باوكە ئۆخەی دەكات و دەگەڕێتەوە لای سێ كچەكەی دەڵێ:

ئەو چاکەیەی ئێوەم لەبیر ناچێ ئەو ژنەتان لەکۆڵ من کردەوە سێ کچەکەش دەڵێن سوپاسی ناوێ چونکە تۆ باوکمانی و ئاشکرای دەکەن و باوکە لای خۆیان دەهێڵنەوە .

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: دەرکەوتنی خانوو لە ژێر دەست و پەنجەکەو بووونی عزیا .

# ڕێوی و کیسەڵ

ڕێوی و کیسەك تەکبیریان کرد کەوا بەیەکەوە گەنم بچێنن زەویەکیان چاند، زەویەکە شاخێکی سێبەری تێدابوو، ئەوسێبەرە لەناوەندی گەنمەکەی بوو وەکو گەنمەکەیان چاند هەموو ڕۆژێ ڕێوی کرێکارێکی بە کیسەڵ دەگرت پارەکەی بەو دەدا وەکە گەنم گەورە بوو دەستیان بە درونەی گەنم کرد دیسان سەر لەنوێ پارەی لە کیسەڵ ساند بۆ درونەکەی گەنمەکەی کە کرێکار کردبووی. دەیگوت: هەر کەمن لەبن ئەو شاخە بێمە دەرێ شاخەکە دەڕوخێ. ئەمن و کیسەڵ و کرێکارەکان و گەنمەکە هەمووی بە بنەوە دەبەین. دوایی پارەی کیسەڵەکەی پێ نادرێت. گەنمەکەیان چا کرد سۆریان کرد ڕویان کرد لە عاردی کیسەڵ ئەو داخانەی هەر لە دڵ بوو کەوا ڕێوی ئەو فێرەی لێ کردوە هەر لەوێ بوو چوو لە وەختی گەنم بەش کردنێ بەش بکەن بە نیوەیی، کیسەڵ لە داخی ئەو زەویە چو حەوت کیسەڵی هێنا لە دەوری گەنمەکەی شاردەوە لە بن گەنمی نا ڕێویش گۆتی: دەبێ هەردووکمان غار بدەین کامەمان زووتر گەیشتینە سەر کۆمەڵە گەنمەکەی ئەوا گەنمەکە هەمووی بۆ وییە ڕێوی و کیسەڵ دەستان بە غاردانە کرد، هەتا کیسەڵ شەقاوەکی هاویشت ڕێوی گەیشتە سەر کۆمەڵە گەنمەکە. کیسەڵێ ناهێنێ هەتا دەگاتێ بە خشە خش هەتا دەگاتێ زۆری پێ دەچێ ئەو گۆتی 16-15-10 هەتا ڕێوی گەیشتێ هاتتە دەرێ ڕێوی ساقیت بوو ڕێوی گوتی: توخوا دوڕبە گەنمم بدەنێ کیسەڵ گۆتی: وەڵا قلەکت نادەمێ لەچاوت کەی ئەگەر چاوت کۆرە بی قلەکت نادەمێ چاوتی پێ چا کەیەوە، ڕێوی گوتی: دێڵن هەمبانەیەکی کوزرەکەی داگرم ئەوجا هەمبانە گوزەرەکەی هەڵگرت و دەرکی بەستا ئەوجا ڕێوی بە توڕەیییەوە هەمبانە کوزرەکەی بە کۆڵی خۆی دادا ڕوی کردە چۆڵی ڕۆیی ڕۆیی هەمبانەکەی بە ملی خۆی دادا چووە ماڵەکی ئێوارێ مێوان بوو و چوە ماڵەکەی ئێوارە بووو نێریەکی لێ بووو بەستا بوویانەوە ڕێوی ڕێوی وتی: نێریەکەتان ئەمشەو هەمبانەکەی نەدڕێنێت ئەوانیش گوتیان: نانا نێری مە بەستراوەیە دەرێ شەوێ عالەمەکە نوستن ڕێوی چو

هەمبانەکەی دڕاندو چوو هەمبانەکەی بەسەری نێریەکەوە قەیم کرد و کوزرەکەی لەبەر پێی نێریەکە ڕوو کرد، هەتا بەیانی بڵێ ئەوا نێریەکەتان کوزرەکەی خواردیە سبەینێ گۆتی ئا نەمگۆ نێریەکە هەمبانەکەم دەدڕێنێ ئێستا دەبێ نێریەکەم بدەنێ دەنا شکایەتتان لێ دەکەم، نێری لێسەندن و نێری کە ڕێوی دەڕەویەوە سەگەڵ دەوریان لێ دا ڕێوی نێری پەتك کرد و بردی بە نێریەوە ئێوارەی دواتر چوە ماڵەکی دیکە مارەکە کچەکی زۆر جوانیان هەبووڕێوی گوتی: کچەکەتان شەوێ گونی نێریەکەم نەبڕێ چونکە لەو سەردەمەدا گونی نێریان دەکردە هەمبانە کل و کلدانیان لێ دروست دەکرد ئەوانیش گوتیان دەلاکەو کیژ چ ئیشی بە گونی نێریە. ڕێوی بە شەو هەستا گونی نێری بڕی چوو خستیە باخەڵی کیژەکەی، سبەینێ ڕێوی هەستا لە بەرینگانی و وراغانی کەر و خۆڵی بەسەری خۆی دا دەکرد کاتێ کابان هەڵدەستێ نانی بەیانی حازر بکات شوان و پیاوەکان بەڕێ بکات هەتا هەر یەك بچێتە سەر ئیشی خۆی یەك بڕوا بۆ بەر مەڕان یەکێك بچێتە ناو بیستان کاتێك دەبینێ ڕێوی لەبەندگای و ڕانمان خۆڵی بەسەر خۆی دادەکرد، لێی پرسی ئەوا بۆ وا دەکەی؟ گوتی: ئەوا گونی نێریم بڕایە ، کچی مام خدری گونی نێری بڕیمە، ڕێوی گۆتی: داکم بمری بابم بمری کچەکەم هەر دەوێ ئەوانیش کچەکەیان دایێ هەمبانەیەکی پەیدا کرد کچەکەی بە کۆری خۆی دادا، ڕۆیی چوو تەماشایکرد شوانەك لەسەر شاخی مەڕی دەلەوەڕاند شوانەکە تولەیەکی ڕەشی لەکن بوو شوان چاوی بەڕێوی کەوت هەمبانەی بە ملەوە بوو شوانەکە تولە ڕەشەکەی تێبەردا ڕێوی هەمبانەکەی لە کۆری بەربۆوە تولە بە دوو ڕێوی کەوت، ڕێوی ئاگای لەخۆی نەما تولە ڕەش ڕێوەیەکەی هەڵبڕی شوانەکە کچەکەی بردەوە ماڵەوە کچەی خستە ناو کەپەنکی شاردییەوە، تولەکە ڕێوەیەکەی لێ بزر بوو گەڕایەوە شوانەکە تولەی خستە ناو هەمبانە دەرکی توند بەست چوو لەجێی هەمبانەکە دانا کە ڕێوی لێی کەوتبوو، ڕێوی گەڕایەوە کن هەمبانەکەی لەبەر ئەوەی زۆر ماندوو بووو بووو گوێی لە نوسکە نوسکی تولەکە نەبوو، لەناو هەمبانەکە هەمبانەکەی بەکۆری خۆی دادا لەسەر ئاوەکی وەی زانی کچەکەی تێدایە دایگرت، ئاوی

بداتێ لە کانییەکی تولە دەرپەڕی نەی زانی تولەیە تولەکە کەوتە دووی ڕێوی سەد تکا و رجای کرد، بەڵام تولە ڕەش هەر بەدوی کەوت تاکو لەسەر شاخی کەوتە خوارەوە هەپرون بە هەپرون بوو شوانەکە کچەکەی لەخۆی مارە کرد و تولەکەش گەڕایەوە بۆ خۆیان ژیانێکی پڕ خۆشی و شادیان ڕابووارد .

*ئەمەش حەکایەتی گیاندارانە، تەنیا ڕەگەزی ئەفسانەیی قسەکردنی گیانلەبەرانە، ئەم قسەکردنەش ڕەگەزێکی لاوازە .

# گوڵ و یاسەمین

**کۆکردنەوە: شـیـاو ڕەشـید ئەبو بەکر**
**گێڕانەوە : گوڵئەندام عەبدوڵڵا مام یەحیا**

هەبوو نەبوو، کەس لەخوای گەورەتر نەبوو، کەس لە بەندەی ڕوو ڕەشتر نەبوو. سێ برا هەبوون، لە شارێك دەژیان، ناویان:(ئەحمەد و مستەفا و عوسمان) بوو ئەم سێ برایە بەخۆشی و شادی دەژیان، تا ساڵێك لە ساڵان باری شارەکەیان ناخۆش بوو ئەم سێ برایەش تووشی دوژمنداری و خەم و ناخۆشی بوون وایان لێ هات شارەکە بەجێ بهێڵن .

هەر سێ براکە شت و متی خۆیان خڕ کردەوە و هەر یەکەیان ماڵئاوایی لە ئەوی تریان کردو هەر یەکەیان بۆ لایەك چوون ، ئەحمەدیش ملی ڕێگای گرت و ڕۆیشت ، زۆر ڕۆیشت چەند ڕۆژان بە ڕێگاوە بوو تا گەیشتە نزیك شارێك وردە وردە کە لەشارەکە نزیك بۆوە بینی قەڵاتێکی بەرز بەرز هەیەو لەژێر قەڵاکەوەش منارەیەك هەیە کە نزیك بۆوە دیقەتی دایە دەبینی قەڵاکە بەلەشی ئینسانی مردوو دروست کرابوو، هەروەها منارەکەش هەمووی سەری ئینسانان بوون لەسەر یەك دانرابوو، ئەحمەد زۆر سەری سوڕماو سەیری بەم دیمەنە هات و چوو بۆ ناو شارەکەو لە پیاوێکی پرسی و گۆتی :

ـ ئەرێ مامە ئەم قەڵاو منارەیە بۆ وایە ؟

کابراکەش گۆتی: ئای کوڕی خۆم ئەم قەڵاو منارەیەی کە دەیبینی ئەوا هەموو گەنجی ئەو شارەن و وایان لێ هاتییە .

ـ باشە لۆ وایان لێ‌هاتییە ؟

ـ چیت بۆ بگێڕمەوە کوڕەکەم . وەرە دانیشە گوێ بگرە:

پاشایەکمان هەیە لەو شارەی هەموو ڕۆژێك ژمارەیەك لە گەنج و لاوان بانگ دەکاتە قەسرەکەی خۆی و پرسیاریان لێ دەکات ، ئەو کەسەی کە پرسیارەکە بزانێ ئەوا خەڵاتی دەکات و بەرەڵای دەکات ، بەڵام ئەوەی کە وەڵامی

پرسیارەکە نەداتەوە ئەوا جەلادەکەی لەسەری دەدات و سەرەکەی لەسەر ئەو منارەیە دادەنێت و لەشەکەشی دەخەنە سەر ئەو قەلأیە ، ئینجا تا ئێستاکە ئەو کەسەی کە چوو بێ بۆ قەسر گەڕانەوەی بۆ نەبووە .

ـ دەبێ ئێستا بمبەیە قەسری پاشاکەتان .

ـ کابرا: کوڕی خۆم ئەوە دەڵێی چی ، چەندان حەکیم و زاناو دونیا دیتەی ئەم مەملەکەتە چوونە نەیانتوانیوە وەلأمی پاشا بدەنەوەو سەریان پەڕاوە .

ـ ئەحمەد: دەبێ هەر بمبەیە ئەو جێیە .

ـ کابراکە بە ناچاری ئەحمەدی بردە قەسری پاشاکەو لەبەر دەرگاکە بەجێ هێشت ، ئەحمەدیش بۆ ماوەیەك داماو ئینجا بە پاسەوانەکانی بەر دەرگای قەسرەکەی گۆت:

ـ دەمەوێ بچمە لای پاشا .

ـ ئەوانیش ڕێگایان پێ داو چووە ژوورەوە هەر لەدەرگای دیوەخانی پاشا گووتی:

ـ تۆ خەلأتی یان جەلادی .

ـ ئەحمەد: ئەمن خەلأتم .

ـ پاشا: دابنیشەو چاك گوێ بگرە ، پرسیارێکت لێ دەکەم ئەگەر هاتوو وەلأمت دامەوە بەڕاستی ئەوا هەرچی زێڕ و زیو و گەنجینەم هەیە دەیدەم بەتۆ کچەکەی خۆشمت لێ مارە دەکەم ، بەلأم ئەگەر هاتوو نەتزانی ئەوا بە جەلاد دەڵێم سەرت بپەڕێنێ .

ـ ئەحمەد : فەرموو پرسیارەکەت بکە .

ـ پاشا: ئایا دەزانی گوڵ و یاسەمین چیان بەسەر داهات ؟

ـ ئەحمەد: قوربان ، ئەو پرسیارەی تۆ دەیکەی وەلأمەکەی ئاسان نیەو ، پێویستی بە کاتێکی زۆر هەیە تا وەلأمت بدەمەوە .

ـ پاشا لە دڵی خۆیدا گۆتی ئەم کوڕە ، دیارە زۆر زیرەکە ئینجا پاشا بە ئەحمەدی گۆت:

ـ ئەوە من چل ڕۆژت مۆلەت دەدەم ، تا ئەو چل ڕۆژە وەلأمم بۆ نەینی ئەوە لەسەرت دەدەم .

ـ ئەحمەد: باشە .

ئەحمەد خۆی پێچاوە و بەسواری ئەسپ ئەم شارو ئەو شاری کردو لە زۆر لادێ و گوندان بۆ سۆراغی گوڵ و یاسەمین دەگەڕا ، تا بە سۆراغ گەیشتە ئەو شارەی کە یاسەمینی تیادا دەژیا .

لەناو شارەکە گەڕاو سوڕا بە پرسیار گەیشتە ماڵی یاسەمینی لە دەرگای ماڵەوەیانی داو پێی گۆتن:. ئەمن ڕێبوارم لە شوینێکی دورەوە هاتووم و زۆر ماندوم ، ڕێگام بدەن چەند ڕۆژێك لە ماڵتان دەمێنمەوە و دوایی بەە دوای ئیشی خۆم دەکەوم . ماڵەکەش ڕێگایان دا ، لەو شارەش عادەتیان بوو ئەگەر هەر کەسێك میوانی هاتبایە ئەوا تا سێ ڕۆژ شوێنی خۆش و خواردنی باشیان دەدایەو هیچیان لێ نەدەپرسی ، پاشان دوای سێ ڕۆژەکە لێی دەپرسن لەکوێوە هاتووە ؟ دەچی بۆ کوێ ؟ چ کارێکی هەیە ؟

ئەحمەدیش سێ ڕۆژان لەسەر یەك لە ماڵەکە مایەوە و هەر چاوەڕوانی کرد تا ڕۆژی سێیەم خاوەن ماڵ (یاسەمین)بانگی کردە دیوەخانی خۆی و پێی گووت: ئەوە سێ ڕۆژە لە ماڵی من میوانی و هیچمان لێ نەپرسی ، ئێستاش دەکرێ لێت بپرسم چ کارەی و بەدوای چی دادەگەڕێی ؟

ئەحمەدیش کە عەیامێکی زۆرە چاوەڕوانی ئەو پرسیارە دەکات خێرا بەبێ وەستان گۆتی:

هاتوومە سەر بردەی خۆت و گوڵم بۆ بگێڕیتەوە ؟

ـ یاسەمین:. دەمزانی ئەو هەموو ڕێگەیەت بڕیە لۆ ئەو پرسیارەی .

ئینجا تەماشای ئەحمەدی کرد و گۆتی:.

هەر کەسێك بیەوێ ئەو سەر بردەیە بزانێ ، دەبێ دوای ئەوەی کە بۆم گێڕایەوە لەسەری بدەم .

ـ ئەحمەد:. سەربردەکەم بۆ بگێڕەوە و دوایی لەسەرم بدە .

ـ یاسەمین دەستی بە گێڕانەوەی سەر بوردەکەی کردو گۆتی :.

ئەمن مندار بووم ئامۆزایەکم هەبوو زۆر جوان بوو ناوی (گوڵ)بوو ، هەر لە منداریەوە پێکەوە بەخێو کراین یەکترمان زۆر خۆشدەویست ، کە گەورەش بووین بابم ئەمنی لە جێگەی خۆی داناو کردمیە پاشاو ئەو ئامۆزایەشی لێ

ماره كردم ، ئەمنیش زۆر زۆرم خۆشدەویست لە خۆشەویستیان هەموو شەوێك دەبوایە دەستی گوڵم بە زنجیرەكی زێڕ لە دەستی خۆم ببەستمەوە .
شەوێك لە شەوان وەخەبەر هاتم دەستم بۆ زنجیرەكە برد دەبینم گوڵ لەوێ نەمایەو ڕۆیشتیە ، ئەمنیش ئەو شەوە تا بەرەبەیان خەوم نەكەوتە چاوی لۆ بەری بەیان گوڵ هاتەوە ، ئەمنیش پێم گۆت :.
گوڵێ گیان ئەوە لەكوێ بووی؟
ئەویش زۆر بە توڕەیی جوابی دامەوە و گۆتی:.
ئەتو حەقت بەسەر منەوە نییە .
بە قامچیەكەی دەستی قامچیەكی لێدام كردمیە سەگ و بەجێی هێشتم، زۆر گریام و هاوارم كرد و لەبەری پاڕامەوە سوودی نەبوو .
تا ڕۆژێك خۆشكی گوڵ بە دزی هاتە لام و پێی گۆتم گوڵ زۆر دڵرەقانە لەگەڵت دەجوڵێتەوە و كو دڵی هات ئاوات لێ بكا ، ئەمنیش داوام لێ كرد كە یارمەتیم بدا ، پێی گۆتم:. دەتوانم بتكەمەوە ئینسان بەلاًم دەبێ تەحەمولی بیست قامچی بكەی تا بەتەواوی دەبیەوە ئینسان .
منیش پێم گۆت :. تەحەمول دەكەم .
ئەویش ئەو قامچیەی هێنا كە پێی لێم درابوو ، هەر قامچیەكی لێی دەدام شوێنێكم دەبووەوە ئینسان تا وای لێ هات هەژدە قامچی لێدام لەو كاتەدا تەحەمولم نەماو لەخۆم چوم ، دەست و لاق و سەرم هەمووی وەك خۆی لێهاتەوە و تەنیا كلكی سەگم هەر مایەوە ، ئینجا بڕیارم دا ئەوێ خۆم مات بكەم تاوەكو گوڵێ دەچێتە دەرێ منیش لەدوای ئەو بەدوای دەكەوم .
ئەو داهات و گوڵ دەرچوو ئەمنیش هەر دوور و نزیك بەدوای دەكەوتم هەر ڕۆیشت ، ڕۆیشت ، ڕۆیشت ڕێگایەكی زۆری بڕی تا گەیشتە بەردەم ئەشكەوتێك و لەوێدا ڕاوەستاو چوو ژورێ ئەمنیش نزیك بومەوە و لەپەنایەك خۆم حەشاردا كە دەبینم ئەو ەئامۆزا خۆشەویستەكەم لەگەڵ كۆمەڵێك لە پیاوان دانیشتینە ڕادەبوێرن و دەخۆن و دەخۆنەوە و قسان دەكەن و پێدەكەنن ، خۆم كڕ كرد تا گوڵ لە ئەشكەوتەكە دەرچوو ئینجا دوا لەدوای ئەو گوێ و كەپووی هەموو پیاوەكانم لێ كردەوە و بە كۆڵی خۆم داداو سواری

ئەسپ بووم و پێش گوڵ گەیشتمەوە ماڕێ ، چاوەڕوانم کرد تا ئەو هاتەوە ئینجا لێی چومە پێش و پێم گووت:.

ئەوە لەکوێ بوی گوڵێ گیان؟

کە تەماشای کردم زۆر سەری سوڕماو پێی گوتم : حەقت بەسەر منەوە نەبێ و پرسیارم لێ مەکە .

ئەمنیش هەموو گوێ و کەپووی پیاوەکانم لەبەر دەمی ڕوکردو پێم وت : .

ئەوە گوێ و کەپووی ئەو کەسانەیە کە لەگەڵیان ڕادەبوێری و ئینجا نۆرەی منە ئەمجارە قامچیەکەم دەست دایە و پێم گووت :.

ئەمن وەکو تۆ نیم و تۆشم خۆشدەوێ بۆیە ناتکەم بە سەگ بەڵکو دەتکەم بە باڵندە. ئینجا قامچیەکەم لێداو کردم بە باڵندەیەکی زۆر جوان کە نمونەی وەك ئەو لە هەموو جیهاندا چنگ ناکەوێ ، خستمە ناو قەفەزێکی زێڕ و ئەو زنجیرەی کە دەستمان پێی دەبەستەوە لە ملیم کرد .

ئینجا یاسەمین هەستا قەفەزەکەی هێناو بە ئەحمەدی نیشان داو کلکی خۆشی پێ نیشاندا، ئینجا پێی وت:. دەزانم ئەو کەسەی کە تۆی ناردوە کێیە فلأنکە پاشایە ، پاشای فلأنە شاریە .

ـ ئەحمەد:. باشە تۆ کوت زانی؟

ـ یاسەمین:. ئەو پاشایە بوو کە ژنەکەم لەگەڵی ڕایدەبوارد و لەبەر خاتری ئەو گوڵ منی بەجێ هێشت ، ئینجا ئێستا دەبێ ئەتو بکوژم چونکە ئەگەر خەبەرت بۆ ئەو پاشایە برد ئەوا هەموو خەڵقی بەسەر بوردەی من و گوڵ دەزانن لەنان ئەو مەملەکەتەش ئابڕوم دەچێ .

ـ ئەحمەد:. مادام هەر دەمکوژی بێڵە لە ژوری سەرێ دوو رکعات نوێژی بۆ خۆم بکەم ، هەندێك لەبەر خوا بپاڕێمەوە کە لە گوناحەکانم خۆش بێت .

ـ یاسەمین ئیزنی داو ئەحمەد چووە سەربانی و لەوێوە خۆی فڕێدایە خوارەوە و بەهەر حاڵ بوو هەرات و خۆی لەکەلاوەیەکی دوری شاری شاردەوە یاسەمینیش دوای دوو سەعات ئینتیزار کردنی ئەحمەدی ، دیتی هەر نەهاتەوە چووە سەربانی دەبینی ڕۆیشتیە و لەوێ نەمایە بە پاسەوانەکانی گۆت دەبێ ئەو پیاوەی لەژێر عەردیش بێ هەر بیبیننەوە .

**پاسەوانەکان زۆر گەڕان و سوڕان هیچ کوچ و کەلەبەرو کۆلآنەیەکی شاری نەما نەگەڕێن بەلآم نەیان دۆزیەوە ، پاسەمینیش لە عەژمەتان کە زانی نهێنیەکەی ئاشکرا بوو ، شمشێری هەڵکێشاو سەرەتا باڵندەکەی (گولێ)سەربڕی ئینجا خۆشی کوشت ، ئەحمەدیش کە بەمەی زانی چووەوە لای پاشاکەو حارو مەسەلەکەی بۆ گێڕاوە ئەویش خەلآتی کردو کچی خۆشی لێ مارە کردو حەفت شەو و حەفت ڕۆژان شایی یان بۆ کرد، لەدوای پاشا ئەحمەدی لەجێی خۆی داناو بۆ خۆشی سەری هەڵگرت و ڕۆیشت .**

**کراسم دڕاو هیچم پێ نەبڕا .**

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: قەلآت لەلاشەی مرۆڤ و منارە لە کەڵلەسەری مرۆڤ و زەلام بەقەمامچی کردنە سەگ و بە قامچی لێدان چاك کردنەوەو هەروەها ژن کردنە باڵندە .**

# خزمی بە بێگانەی مەدە

**کۆکردنەوە: شیلان ئەنوەر ڕەشید**

**گێڕانەوەی: نامق کەریم ڕەشید**

دەگێڕنەوە دەڵێن: لەسەردەمی سوڵتان مەحمود کابرایەك هەبوو لەشار سێ کۆمەڵە خۆڵی دانابوو بۆ فرۆشتن. بەڵام، ئەو سێ کۆمەڵە خۆڵە بچووك بوون. بەڵام قسە بوون: لەو کاتەدا سوڵتان مەحمود لەگەڵ هەیاسدا بەلای ئەو کابرایەی کە سێ کۆمەڵە خۆڵەکەی دانابوو تێ پەڕین لەلای ڕاوەستان بە کابرایەکیان گووت: ئەو کۆمەڵە خۆڵانە چین ئەویش گووتی: ئەو سێ کۆمەڵە خۆڵە (قسەیە) هەر یەك لەو قسانە بای سێ پەنجاییە واتە (سێ درهەم) سوڵتان مەحمود گووتی: یەکەم کۆمەڵ قسەکە چییە ها ئەوە پارەکەی؟ ئەویش گووتی: یەکەم دەڵێ (خزمی خۆت بەبێگانە مەدە) . سوڵتان مەحمود پێ دەکەنی، بەڵام هەیاسی وەکیلی قسەکەی وەرگرت و بەکاری هێنا: گووتی! دەکۆمەڵە خۆڵی دووەممان پێ بڵێ چییە؟ . گووتی: دووەمیان ئەوەیە کە دەڵێ (قسەی دڵی خۆت بۆ ژنی خۆت مەکە یان بۆ خێزانت مەکە) . دیسان سوڵتان مەحمود پێ کەنی، بەڵام هەیاسی وەکیلی بەکاری هێنا گووتی: دە سێیەم کۆمەڵەکەمان پێ بڵێ بزانین چییە؟ کابرایەکەش گووتی: سێیەم کۆمەڵە دەڵێ: (زاڵم بوو بە پرد بەسەریدا مەڕۆ) دیسان سوڵتان مەحمود پێ کەنی بەڵام هەیاسی وەکیلی بەکاری هێنا. لەو سەردەمەدا سوڵتان مەحمود بەرانێکی ڕەشی هەبوو کە بەشەو و بەڕۆژ چەندەها حەرەسی هەبوو. ئەو بەرانەش حوڕ کرابوو لە بازاڕ چی دەخوارد یان نەدەخوارد مەسموح کرابوو بۆیە لەو کاتەدا هەیاس سێ ژنی هەبوو یەکیان ئامۆزای بوو، ئەوی دووەمیان پورزای بوو، ئەوی سێیەمیان بێگانە بوو، هیچ خزمی نەبوو لەو کاتەدا هەیاسی وەکیلی سوڵتان مەحمود: چوو بەرانە ڕەشەکەی سوڵتان مەحمودی دزی لەبن ژێر زەمین دەست بەسەری کرد و چوو بەرانەکی لەو شێوەی ئەوەی هێنا لەپێش چاوی ژنەکانی سەری بڕی، پێی گۆتن: لەلای کەس باسی نەکەن دەنا دوایی سوڵتان مەحمود لەسەرم دەدات خەڵك دامەزراندن بەدەست

هەیاسی وەکیلی سوڵتان مەحمود بوو. بۆیە چوو بوو هەرچی خزم و کەسی خۆی هەبوو بەلای نابوو. بەڵام، هەرچی بێگانە بوو لە دام و دەزگاکان و دائیرەکاندا دایمەزراندبوون. بۆیە بۆی دەربکەوێ کە سوڵتان مەحمود تاقی بکاتەوە، بۆیە دەستی دایە شولێك جارێ لە ژنەکانی دا جارێ لە ژنی گەورەی دا کە ئامۆزای بوو، بەڵام هیچ قسەی نەکرد لە ژنەکەی دووەمی دا کە پورزای بوو بۆیە ئەویش هیچ قسەی نەکرد چونکە خزمی بوو، بەڵام لە ژنی سێیەمی دا کە بێگانە بوو بۆیە هاواری کرد هۆ خەڵکینە هۆ خەڵکینە کوڕە وەرن هەیاسی مێردم بەرانەکەی سوڵتانی مەحمودی دزیوە. بۆیە زۆر حیمایەکانی سوڵتان مەحمود چوون هەیاسیان دەست گیر کرد و بردیان بۆ لای سوڵتان مەحمود. کە سوڵتان مەحمود ئەمری ئیعدامی بۆ هەیاس دەرکردبوو لەو کاتەدا هەرچی بێگانە بوو دەستی بە سمێڵی دادەهێنا! بەڵام، هەرچی خزم و کەسی هەیاس بوو دەستی دابووە چەکوچ و داس و کوتەك و چەقۆ بەرامبەری ماڵی سوڵتان ڕاوەستابوون ناڕەزاییان دەردەبڕی .

بۆیە هەیاس بەس ئەو کۆمەڵە خۆڵەکانی کابرای فرۆشیاری تاقی دەکردەوە و بەس لەو کاتەشدا سوڵتان مەحمودیش بوو بەزاڵم کە کەسێك ببێ بە زاڵم ئەگەر ببێ بەپرد نابێ بەسەری دا بڕۆی، بۆیە هەیاسی وەکیلی بە سوڵتان مەحمودی گووت: بەیارمەتیت من با ئەو شتانەت بۆ شی بکەمەوە گۆتی جارێ ئەوەڵەن : بەرانەکەتم نەکوشتووە نەسەر بڕیوە بەڵکو بەس دەست بەسەرم کردوە و هیچی تر وەرە با نیشانت بدەم. دووەمیان: قسەی دڵی خۆمم لەلای ژنەکانم باس کرد سێیەم هەرچی خزم و کەسم و دۆستم بوو بەڵام نابوو چوو بووم بێ گانەم لەجێی سەر دائیرەکان دامەزراندبوون. بۆیە قسەی ئەو پیاوەی کە کۆمەڵە خۆڵەکانی دەفرۆشت بەسێ پەنجایی تاقی کردەوە، بەڵام ڕێك وا دەرچوو بەڵام ئەتۆ هەر پێ دەکەنیت و بەکارت نەدەهێنا کە سوڵتان مەحمود بۆی دەرکەوت وایە پەشیمان بۆوە بە هەیاسی گوت: ئەمن کردم ئەتۆ نەی کەی بەڵام هەیاس بە سوڵتان مەحمودی گوت: ئەتۆ بە شەرتێك ئەمن دەبینەوە ئەویش ئەوەیە کە 400 گیسکی 10 کیلۆی بدەی بە 400 ماڵ دوایی 40 ڕۆژ لێیان وەر بگرەوە هەر ماڵێکی ئەو 40 ڕۆژە جیسکەکەی کە

هەر وەك خۆی 10 كیلۆ دەرچوو بوو ئەوە من لەویٚ دەرم بۆ هەركە هەیاس ڕۆیی 400 جیسكەكەیان تەوزیعی مالاٚت كردو لەو كاتەدا هەیاس لەمالیٚ لە یەكێك لە ئاشە كۆن و كەلاٚوەكان بوو زەرعاتی دەكرد كە جیسكێكییان دایە هەیاس چوو گورگێكی بە چكەی بۆ گرت ددانی گورگەی كێشابوو ڕۆژیٚ ئەو جیسكەی تێر جۆ دەكرد، بەلاٚم سەعاتێكیش ئەو گورگە بیٚ ددانەی تیٚ بەردەدا بۆیە هیچ گۆشتی پیٚ نەئەگرت : بۆیە دوای 40 شەوەكە كە تەواو بوو هاتن جیسكەكانیان لیٚ وەرگرتنەوە لە ماڵەكان كە قەپانیان پیٚ بوو هەر جیسكێكیان دەكێشا یان 11 كیلۆ دەردەچوو یان 9 یان 11.5 یان 9.5 كیلۆ دەردەچوو بۆ بەس ئەو جیسكەی كە لەماڵی هەیاس بوو 10 كیلۆ دەرچوو بەلاٚم بەم شێوەیە هەیاسیان دیتەوە بەیەك شادبونەوە.

*ڕەگەزی ئەفسانەیی دیاری نەكراوە: ئەمەش حەكایەتی سولتان مەحمود و هەیاسە، بەلاٚم گێرانەوەكەی باش نییە.

# فاتمەو حەوت براکەی

دەگێڕنەوە دەڵێن لە زەمانێکدا (7) حەوت براو یەك خوشك دەبێ، کە ناوی خوشکەکەیان (فاتمە)دەبێت. ئەو حەوت برایە ڕاوچی دەبن لە مەنتیقەیەکی شاخاوی ناوچەیەکی پڕ لە ئەشکەوت و دارو دەوەن: بۆیە حەوت برایە ڕۆژانە دەچون بۆ ڕاو ڕاوشکار ئەو خوشکەیان بەجێ دەهێشت بۆ ئەوەی نان و خواردنیان بۆ حازر بکات، ڕۆژێك فاتمە ئاگری پێ نابێت کە ئاگری پێ بکاتەوە بۆ نان و چێشت حازر کردن بۆیە دەچێت بۆ یەکێك لە ئەشکەوتەکانی نزیك کەپر و ماڵەکەیان. بۆیە دێوەکەش ئاگر دەدات بە فاتمە بەلأم داوێکی خەڕ خەڕەی لە گیرفانی فاتمە دەهاوێ تاجێ و مەکانی و شوێنەکانی ماڵی فاتمە بزانێت بۆیە بۆ ڕۆژی دوایی دێوەکە بە شوێنی داوی خەڕ خەڕەکە دەکەوێت بۆیە کە دەگاتە ماڵی فاتمە دەبێنێت بەس فاتمە لێ دەبێت بە فاتمە دەڵێت فاتمە خان حەوت براکەت بکوژم یان پەنجەی توتت بمژم فاتمەش دەڵێ حەوت براکەم مەکوژە پەنجەی توتم بمژە، بۆیە پەنجەی توتەی فاتمە دەمژێت تا حەفت ڕۆژان بە بەردەوامی ئەو دێوە دێت بۆ بن کەپرەکەی ماڵی فاتمە، حەوت ڕۆژ بە بەردەوامی پەنجەی توتەی فاتمە دەمژێت تا فاتمە ڕەق و لەڕو لاواز دەبێت: براکانی فاتمە هەست بەوە دەکەن کە فاتمەی خوشکەکەیان زۆر لاواز بوە بۆیە برا گەورەکەی فاتمە لە فاتمە دەپرسێ ئەرێ خوشکم تۆ بۆچی وا لاواز بووی؟ فاتمەش دەست بە گریان دەکات و دەڵێ: بڵێم چی: برایەکەی دەڵێ پێمان بڵێ دەی خوشکم ئەویش دەڵێ وەلآ دێوێکی زۆر گەورە ڕۆژانە دێت بۆ ئێرە بە من دەڵێ حەوت براکەت بکوژم یان پەنجەی توتەت بمژم ئەمنیش زۆر ئێوەم خۆش دەوێت بۆیە بە دێوەکە دەڵێم حەوت براکەم مەکوژە پەنجەی توتەم بمژە بۆیە ئێستا وا لاواز بووم ئەوانیش دەڵێن: ئەی بۆ چی زوو وات نەدەگوت بۆیە هەر دەستن بە بیرێکی قوڵ هەڵ دەکەنن: خوڵەکەی لە دور دەشارنەوە و حەسیرەکەی لەسەر بیرەکەدا قوڵەکەدا بە پانی ڕادەخەن بە فاتمەی خوشکیان گوت: تۆ خەریکی نان کردن و هەویر شێلان بە بۆیە ئەگەر دێوەکە هات گوتی: فاتمەخان حەوت براکەت بکوژم یان پەنجەی

توتت بمژم. تۆ بڵێ جارێ بڕۆ بۆ سەر ئەم پارچە حەسیرە دانیشە دوایی پەنجەی توتەم بمژە ئەو ڕۆژەش براکانی نەچوبون بۆ ڕاو ڕاوشکار بۆیە کە دێوەکە دەچێتە سەر حەسیرەکە دەکەوێتە ناو بیرەکەت دا براکانی فاتمە ڕادەکەن دەچنە سەر دێوەکە بەبەر شیر و تیر و بەردی گەورەی پێ دادەدەن تا دەی کوژن بەڵام دوایی برا گەورەکەیان لەبیر چوو بوو بە فاتمە بڵێ کە ئاوی پێ دامەکە: بۆیە بۆ دوایی ڕۆژی کە دێوەکە کوژرابو بۆیە فاتمە نازانێت ئاو دەهاوێت بۆ سەر ئەو شوێنەی کە دێوەکەی لەناو کوژرابو بۆیە کە ئاوی بەسەر شوێنەکەی داکرد پیاز شین دەبو پیازێکی زۆر، بۆ چێشتی نیوەڕۆیە ساوەر لێ دەنێت فاتمە خان براکانی ئەو ڕۆژە براکانی فاتمە هەندە ماندوو شەقی دەبن برسیان زۆر دەبێت بۆیە بە فاتمەی خوشکیان دەڵێن: چمان هەیە حازرە بۆمان بهێنە ئەویش کە شیوی ساوەرەکەیان بۆ دەهێنێت کە دەیخۆن یەکسەر هەموویان دەبن بە مەڕ مەڕی ڕاستی بۆیە فاتمەی خوشکیان زۆری پێ ناخۆشە و بەردەوام شیر و نان و چێشت و شتیان هەر بۆ حازر دەکات و بە هەمان شێوەی جاران شەو و ڕۆژ بەلای براکانی دەگرێت و تا ڕۆژێك شێخێکی عارەب بەلای فاتمە و ئەو حەوت مەڕەدا تێ پەڕ دەبێت کە شێخەکە لەسەر ماینێ بوو حەیزەرانێکی قەهوەیی پێ بوو، بە فاتمەی گووت: ها بۆچی دەگریێ؟ فاتمەش بەشێخە عەرەبەکەی گووت: ئەوانە برام بوون، بونەتە مەڕ! ئەویش دەڵێ: چۆن. ئەویش وەزع و مەسەلەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، کابرا عەرەبەکە بە فاتمە دەڵێ: ئاسانە ئەتوو تەماشامان مەکە ئەگەر من بەو حەیزەرانە لە براکانتم دا تۆ تەماشامان مەکەو ئەگەر تەماشاشت کردین مەڵێ ئۆف، چونکە دوایی براکانت چاك نابنەوە ئەویش گوتی: باشە بەڵام عارەبەکە بە فاتمەی گوت: دەبێ تۆ لەدواییدا شووم پێ بکەی فاتمەش دەڵێ باشە بەسەر چاو بۆیە دەست دەکات بە شول لێدان لە براکانی فاتمە لەیەکەمەوە هەتا شەشەم چاك دەبنەوە، بەڵام کە لەبرایەکەی ئاخیری. دەدات واتە برا بچوکەکەی فاتمە لەو کاتەدا براکەی دێت و دەیبینێت فاتمە دەڵێ: ئۆف بۆیە براکەی چاك نابێتەوە نیوەی دەبێت بە بەشەر و نیوەی دەبێ بە مەڕ بۆیە هەتا هەتایە ئەو برایە گچکەیان چاك نابێتەوە و براکانیان ڕازی دەبن کە فاتمەی

خوشكيان بدەن بە شێخە عەرەبەكە يان شێخە عەرەبەكە بكەن بە زاواى خۆيان بۆيە دواى ئەوەى كە فاتمەى خوشكيان دا بەعەرەبەكەو گەڕانەوە بۆ شارو شارۆچكەكەى خۆيان لەناو ئەم شاخ و دارو دەوەنە دەگەڕێنەوە . بۆيە لێرەدا كۆتايى بەم چيرۆكە هات منيش هەر وەكو قەديمەكان دەڵێن : پێڵاوم دڕاو هيچم پێ نەبڕا.

*ڕەگەزى ئەفسانەيى ئەم چيرۆكە: ديوەكە و كوڕانيەتى كە دەبێ بە پياز و براكانى پيازەكە دەخۆن دەبن بە مەڕ و شێخى عەرەب بە لێدان مەڕەكان دەكاتەوە بە مرۆڤ، تەنيا بچووكەكەيان نەبێ، چونكە لەكاتى لێدانى، فاتيمە دەڵێ: ئۆف ئەمەيان هەتاهەتايێ بە مەڕى دەمينێتەوە كە ئەمە لەگەڵ دەقەكانى تر جيايە .

# مراد حاسل

**كۆكردنەوە: عوزەيفا لەتيف مەحەمەد**

**گێڕانەوە : ستی ڕەسول ئەحمەد**

هەبوو نەبوو، سەرێ حەکايەتێ بوو، کەس لەخودێ مەزنتر نەبوو:. حاکمێ باژێرێ موسڵ چەند ساڵ بوو چ بچووك نەبوون، دوايی خودێ تەعالا کوڕەك دايە . نەيزانی چ ناڤ لێ بنێ، پشتی هەنگی دەنگی دا باژێرا کێ دێ ناڤەکی لە کوڕێ من نێ. مرۆڤەکی گۆتێ: ناڤێ وی (مراد حاسڵ)بی .

حاکمی ئەو مرۆڤ خەلات کردو خوراما ئەڤ کوڕە مەزن کردبوو (14)ساڵ ڕۆژێ نەديت. ڕۆژەکی ترسکە ڕۆژێ چووە ژورێ گۆتێ: ديگرم. خوراما گۆتێ: وەرە دەرێ ببينە. ڕۆژەکی گۆتيە: بابێ خۆ کليلا بينە دا بچم دين کەمە ژورێ قەسرێ بابێ وی کليل دانە ڤێ و گۆتی: ڤێ کەکە، ڤێ نەکە. ئەو دەرگا بابێ وی گۆتێ فەنەکێ ، فەيکرد . ئەوا بابێ وی گۆتی فەکە فەينەکرد. چوە ژۆرێ ديتی کو مرۆڤ و ژن خڕيێ ب هەوايی ڤە کردە. وەکو هەسپا گۆشتێ ل بەدانايی شێرا گيايێ ل بەهەستا گيايی ل ب شێرا هەڵگرت برديە ب هەسپە گۆشتێ ل بەر هەسپی هەڵگرت دا شێرە .

هەسپە گۆتی: وەرە دوو موويا لە کلکا من دەربينە هەرگاڤەکێ داب نيە بن دوو بەردو سپيا ئەز دێ يێ حازر بم هەسپێ بەردا .

شێريش گۆتێ: دوو موويا ل سەری کلکا من دەربينە هەر گاڤا کو ستيرەك يا ل عەسمانا کو عەزيف بو ئەز دی زانم تۆيی نەبەکەتی دی هيم ، شێريش بەرەلاّ کرد .

ڕۆژەکی (مراد حاسڵ)چوو ميرگەکی دگەڵ خولاما بۆ ڕاڤێ ديتی غەزالەکا لە مێرگەکی . لە خولامای دەنگ دا ئەڤ غەزالە ت ڕەڤی کی ڕا بچيت دی سەری وی بڕم . غەزاليش کيژا وە شێريە . يی کۆ وەعدە دای کۆ چ بێ قەرار يا دگەڵ

(مراد حاسلێ) نەکە چ یا (مراد حاسلێ)ە گۆت: بۆ ڤ جه بێنت غەزالێ هاگا لێ بوو کو (مراد حاسلێ)ە گۆت: تسەر ملێ کێ ڕا بچێت دێ سەرێ و برم هەستا دسەر ملێ (مراد حاسلێ)ە ڕا چو (مراد حاسلێ)ە گۆت: خولاما ئەنگ هستێ هەرنەڤە ، ئەز دێ چم ل دورڤێ غەزالێ .

مراد حاسلێ ل دوو غەزالا چوو هەتا بەینەکی دیتی غەزال توو بوڤە مەغریبەکی (مراد حاسلێ)یش ل دو چوو. دیتی کو شێر یێ ل وێرێ یێ حازرە . شێرە گۆتی: من ئەهدەیێ دایێ نەخۆ ئێرە جهێ تۆ نیە .

شێرە گۆت : وەرە دێ سبیانێ کیژ (خۆ ، غەزالێ ل تۆ مارە کەم . مراد حاسلێ هەستا چو ڤە . بابێ خۆو خولامێ ئینان دا کیژ شێرە لەخۆ مارە بکەن) .

ڤ شەڤێ ڕا مالا بابێ غەزالێ بار کردبوو . غەزالێ ب دزی بابێ خۆ هەستا (کاغەزەکی نڤیسی) ت بن بەردی نابوو . (مراد حاسلێ)ە گۆتە بابێ خۆ ئەنگ هەرنەڤە ئەز دێ مینم ل شکەفەتێ دا گەڕیا کاغەزەکی ڤەدیت . خیندیەڤە کو تێدا نڤیسی بۆ (مراد حاسلێ دەستێ تۆ ناگاتە من هەکا دەستمالا تەجناڤ تۆ نەبی . وەرە فلانە جێ ، سێ نەفەریێ باشەر تێت لەسەر دەستمالا تەجنە تۆ بێنە دێ گەییە من)

مراد حاسلێ هەگەریا هەگەریا ئەو سێ نەفەرەی دیت نەڤە دیتی کو ئەو سێ نەفەریێ بشەر هاتە ئێکی گۆتێ کۆ لاڤ بۆ منە . ئێکی گۆتێ : گۆپالێ بۆ منە ئەو سێ بون دا ئێك خەمینی !

(مراد حاسلێ)ە گۆتێ: ئەڤە شەری ئەنگۆ لسەر چییە ؟

گۆتیان : لسەر کۆلاڤ و گۆپالێ تەجنایە .

(مراد حاسلێ)گۆتێ: وەرن دێ ئەز مشکیلا ئەنگۆ حەل کەم . ئەز دێ ڤی تیری هاڤێم کێ لەنگۆ هەر سێکا بەرایی گەشتە کۆلاڤا بۆ ویە .

(مراد حاسلێ)ە تیرە هاڤێت هەرسێك چون هەتا ڤەگەریان (مراد حاسلێ)ە کۆلاڤ لسەرا ناو گۆپالێ وەدەستەك گرت و بزر بو . پشتی هەنگی گەیشتە پیرەمێردەکی (80)سالی چو بو دارا کۆلاڤێ لسەرێ خۆ کرد . گۆتی: پیرە مام تۆ لیرە چ دکەی ؟ گۆتێ: ئەزیێ هاتیمە دارا .

[6] کاغەز نڤیسین: ئەمەش بۆ ئەفسانە شتێکی نوێیە

(مراد حاسلێ)ە گۆتی :. تۆ چ غەزالا ل ڤێ میرگێ نابینی ؟!
پیرە مامە گۆتی :. هێ .... هێ .... !!
ئەز ل حەینێ تۆ بۆم پێ هنگییە ئەز ل دو دێ غەزالێ عەمرێ من (14)سالێ بوو تازە یێ بوویمە (80)سالی دەستێ من ناگەتێ بەلێ گۆتی ئێنە سەر کانییەکی هەمی سبیانا هەکە تۆ پ هندێ نەگ ری ناگری .
(مراد حاسلێ)هەستا کۆلاڤێ ئەجنای ل سەر نا چوو سەر کانی یێ غەزالیش هاتنە سەر کانێیی غەزالێ دەستمالکا خۆ هەل ئێخست لێ راما ، دەستماڵکا وێ نەمایە فکری کرد گۆتی:.(مراد حاسلێ)ە گۆتیە خوراما ئەنگو هەر نەڤە ، گۆتی:. مراد حاسلێ کۆلاڤە ل سەرکە وەرە .
مراد حاسلێ و غەزال، هەستان ڤەگەریان بۆ مەملەکەتی (مراد حاسلێ) یی غەزال و مراد حاسلێ چوون ل رییێ گەیشتنە گاڤانێ گوندی کوردینا وی یەك بست یا هاتی . سەلامی لێکرد گۆتی :. ئەڤە ژ روینە ؟ پ نۆڤە . گۆتی:. ماتۆ نزانی کورێ حاکمێ مە ڤە چەند ساڵە ێ بێ سەرو شوێن چووی . گۆتی :. دا هەرە ببێ حاکمی کورێ تۆ مراد حاسلێ ب خۆو غەزالێ ڤە هاتەڤە .
غاری دا گەیشتە شڤانی گوندێ خۆ شڤانی گۆتی :.
گاڤان تۆ بۆ غار تەدەی ؟ گۆتی:. دێ چم مزگێنی دەمە حاکمە .
مراد حاسلێ هاتەڤە، شڤانە بەردەك ل پێ گاڤانەدا پێی شکاند .
شڤانە غاردا گۆتیە حاکمە:. مراد حاسلێ هاتەڤە ب خۆ ب غەزالا خۆڤە . حاکمە گۆتی:. تۆ دیت (مراد حاسلێ)ە گۆتی:. نەخێر گاڤانە وە گۆت من پێ گاڤانەیێ شکاندە حاکمە شڤان و گاڤان هەردووك هاڤێتنە سەر فوما زێراو پ بیر کورێ خۆڤە چوو . هاتمەڤە رەحمەت ل گوێ راگێرا ، کالکم درا وچم پێ نەبرا .

***رەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: شێرو ئەسپ موی دەدەنە مراد حاسلی و ئەجندەو کلاو و دەسماڵ و گۆپالی دەدەنێ و لە شێوەی حیکایەتی (کورە کەچەڵە) .**

# میرزا ئەحمەد و میرزا مەحەمەد

**گێڕانەوە : عەبدولا ئەیوب عەبدولا**

ڤەد گێڕن ئەلێن:. کابرایەکی سێ کوڕ هەبون وەسیەتی کرد بۆ کوڕێ خۆ گۆتی:. هەر وەختێ ئەز مردم من سواری هەسپی من بکەن هەر جێیی هەسپێ من لێ نڤیست من ل وێرێ ڤە شێرن ، ئەنگ سێ کوڕن سێ ئەڤا حەرەسیێ لمن بگرن .

کابرای ئەمرێ خودیی کرد ، کوڕێ وەقسا بابی خۆیان گەیاندە جەو ڤەیان شارد، کورێ مەزن ناڤی وی (میرزا ئەحمەد)بوو یێ ناڤی ترێ (میرزا مەحەمەد)بوو یێ کچکەش (کەچەڵ)بوو .

پشتی ڤەشاردنا بابێ وان کەچەڵوکی گۆتی:.

براینە وەرن رونین دا ئەم شیرەتین بابێ خۆ بگهێنە چ یێ مەزن (میرزا ئەحمەد)ە گۆتی:. برا ئەڤ شەڤە کی دێ ل مە چێتە حەرەسی؟ (کەچەل)ی گۆتی:. برا تۆیی مەزنی تبیا تۆبی . شەڤا دوویش عایدی (میرزا مەحەمەد)یە شەڤا ئەخیریی عایدی منە . (میرزا ئەحمەد)هەستا ب دلەکی و هزار دلا گۆتی:. ئەڤە ئەز چوومە حەرەسیا بابە ویجا وەکی چوو نیڤەکا رێی خەون و ترسەکا زۆر خۆلێدا چوو سەر زیارەتی بابێ خۆ تقریبا (5)دەقا حەرەسی گرت و رابێ هەستا ڤەگەر یاڤە ماڵ برایی وە گۆتی :. ها میرزا ئەحمەد تۆ هات یەڤە ، گۆتی: بەلێ ئەز هاتمەڤە ، مابرا بابێ مەد قەبریشدا هەرێت ترسێت ، مادێ چ هێتە بابێ مە .

هەستا (کەچەلوک)کێ وەکی زانی برایی وەیێ نڤستینە ئەو هەستا ڤەستا زیارەتی بابێ خۆی کرد حەرسیا بابێ خۆی گرت تقریبا نێڤەکا شەڤێ دیتی دعبا و دورندا تەکێ وەحشانە ، هەسپەکێ ڕەش چلکێت وی یە ڕەش ، تیرو شێر و هەناری وەهەمییە ڕەش بوون ، دێوەکی مەزن هاتە سەر قەبرێ بابێ وی وڕما خۆی دابن زیارەتە کو زیارەتە ل قەبرە فریدەتە دەرێ ویجا (کەچەل)ە گۆتی :. هەی ... کافر نەکەی نەچێە مردیا وەرە زیندیا .(دێوە) گۆتی :.

کەچەلێ ئەڤە تۆی لێرە من منییە کرد تۆ لە عەسمانا رابە پلێ من بکەڤە نەخاسمەن لە عەردا . (کەچەل)ە گۆتی :. باشە کافر پ مل بکەین پ گورزە بکەین یان پ شیر بکەین پ چ بکەین.

(دێوە)گۆتی:. نە کەچەل دێ پ مل کەین (کەچەل)ی گۆتی :. زۆرباشە هەستان ل زیارەتە ڤ دوور کەتن ویجا کەچەل و دێوی هەردوکا مل ت بەرێك رابردن یەك ل کەچەل یەك ل دێوە جار هات و سعات چوو شەڤ چوو نیزیکی بەرەبەیانی هەر ل کەچەل و هەر ل دێوی چ یا ل هەر دووکا پشتا ئێکی وی نەگەیاندە عەردی، دوایی (کەچەل) گۆت :. یارەبی خودایە هەکە عەجەلا من ب دەستێ ئەڤ کافرەیە من بکوژیت ، نەخۆ ئەگەر عەجەلاوە ب دەستێ منە ئەز دەیکوژم، ویجا (کەچەل)ە ناڤێ خودیی و مشایخا لی ئێنا و دەستی هاڤێتە دێوە، وە دێوی کوشت گوچکێ وی بری و هەسپێ وی کەلەفی دێوە خڕی بردنە شکەفتەکێ دووری گوندە ، ئیجا ڤەگەریا گوندە ل مالیش خۆش خوشانی تشیت و نانی حازر کرد بۆ برایی خۆ و گازی کرد وەرن نانە بخۆن. چ قسەی بۆ برایی خۆ ڤە نەگێڕان .

شەڤا دوویی دا هات گۆریا (میرزا مەحەمەد)ی بوو. (میرزا مەحەمەد)هەستا وەکی برایی خۆ یەك دوو دەڤا چو حەرەسیا بابێ خۆ ئەویش هەر وەکی برایی خۆ (میرزا ئەحمەد)ی ڤەگەریا مال. دیسان (کەچەل) وەکی شەڤا بەرێ چوو سەر قەبرێ بابێ خۆ دیتی کو دێ وەکی سپی ، هەسپ و شێر و مەتاری وی سپی هات هەروەکی دێ وێ ڕەش ڕمی وابن قەبرێ بابێ کەچەلە کو فڕێ دەتە دەرێ .(کەچەل)هەستا وەکی دێوی ڕەش کوشتی یی و بردییە شکەفەتێ . هاتەڤە دیسان چێشت و نانی حازر کرن گۆتی . هەستن برا نانە بخۆن. هەتا بوو شەڤا سێیی هەر سێ برا خڕ بوونەڤە شیڤا خۆیان خوارد و هەردوو برایا گۆتی هەستە (کەچەل)ئەڤ شەڤە گۆریا تۆیە (کەچەل)یش گۆتی:. گەلی برایا ئەز دزانم ئەڤ شەڤە گۆریا منە. ئینا هەستا چوو بۆ سەر قەبرێ بابێ خۆ دا حەرەسی یی لێبگرێت دێتی وەختەکی شەڤی دێوەکی (سۆر)ت کەرخا برایی خۆرا هات . هەر ل دوور ڕمی دا ئینا زیارەتێ کو فڕێ دەتە دەرێ ، کەچەلە کوڕە قیرو هەوار گۆتی:. هەی کافر نەچێتە مردیا وە

ڕەزێنديا گۆتی:. كەچەل تۆیەزانی شەڤێ دی و شەڤادی تۆ هەر دوو برایی من یێ كوشتە ، تۆ وی كێڤە قور تال ب ل بەر پلێ من ، كەچەل گۆتی:. باشە كافر پامل بكەین پ ڕم بكەین پ گورزە بكەین یان پ شێر بكەین پ چ بكەین ؟

ویجا دێ وێ هەر وەكی برایی خۆ گۆتی :. كەچەل دی پ مل كەین دێ چێنە مەیدانا یەك و دوو هەر ل كەچەل و هەر ل دێوە مل ملان و لێكدان و پێكدادان هەتا نزیكی نڤێژا سبیانی ، كەچەلی وەكی دێوی ڕەش و سپی ئەڤەش گۆشت و ل عەردی داو هەسپێ وی و شێرو مەتار و ڕمەهەمی بردنە شكەفتێ. دیسان چووڤە مال و تیشت و نانی حازر كردن و گازی برایی خۆی كرد گۆتی:. وەرن نانی حازرە وەرن بخۆن .

حاكمێ باژێری ل باژێری دەنگدا كۆ حاكمی خەونە كا دێتی كاكێ دێ زانی تەعبیرا خەونا من لێدە؟ مەلایی وە باژێری گۆتی:. ئەز حاكمە گۆتی:. من شەڤێ دی د خەوێ دا دێت سێ درانی من كەت بوون. مەلای گۆتی:. تۆ سێ كیژێت هەینە هەر سێكیش حوكمە میردن ، بێنە كیژێ خۆ بدە مێرد باشە. حاكمە گۆتی:. ئەز یێ ڕازی مە بەس دێ كو ئەڤا كیژا دەمە میرد. ئاقل دارەكی وی وەختی گۆتە حاكمە ئەم دێ هەستین چالە قیرەكێ لێ دەێن وە ل باژێرش دەنگ بدە سبەی سبیانی هەمی ل مەیدانی حازر بن، كێ بتوانی خۆت سەر ڤێ چالە قیریدا فڕێ بدە كیژا مەزنترێ دێ لێ مارەكەم .

سبیانی گوندو باژێر تێك هەژیان خەلكی هەمیان بی هەسپ هەی یێ هەر چ دەوارەك هەیی خۆیان حازر كرد چوونە مەیدانی (میرزا ئەحمەد و میرزا مەحەمەد)یش وەكی ڤێ عالەمێ كارو باری خۆیان كرد كەچەلە گۆتی:. برا ئەڤە خێرە ئەنگ دێ چ كەن گۆتیان:. برا مالێ و مەسەلەی حاكمی ئەڤەتە . كەچەلە گۆتی: برا منیش دگەل خۆ نابەن. گۆتیان:. نەخیر تۆ نابەین سوار چاكی باژێری دێ تۆ پرچ تینن . هەردوو برا میرزا مەحەمەد و میرزا ئەحمەد دایانە ڕێیی و چوون بۆ مەیدانی ل وی وەختی برایی كەچەل چوون كەچەل هەستا بەری خۆی دا شكەفتێ و هەسپێ ڕەشی ئێنا دەرێ و جل و بەرگی ڕەشی ل بەر كردن و شیر و مەتاری ڕەشی هەل گرتن و سەرەكی بەردا مەیندانی وەختی بەرێ هەسپی ڕەش دا مەیدانا حاكمێ خەلكی خڕا گۆت:.

تۆزەکا دیار ئەڤ خەلکەی خڕا بەرێ خۆ دایە من تۆزێ سوار هات خۆی ت سەر چالە قیرێ را هاڤیت و دەستێ هاڤێتیە دەستی کیژا مەزن بردییە شکەفتێ و کەچەل دوو بارە گەریاڤە مال کارێ مالی کردن و وەختەکی دێتی برایی وە هاتنە ڤە مال کەچەلە گۆتە هەردوو برایی خۆ برا ئەنگو چ کرد خۆو ت سەر چالە قیرێ فڕە دا هاڤیت برایی وی گۆتی:. نەخێر (کەچەل)ە گۆتی:. باشە من چەند داوا ل ئەنگو کرد کو ئەزیش دگەل ئەنگو بهێم ئەنگوو نەکرد. برایی وە گۆتی :. کەچەل ئەگەر تۆ هات یە داڤ بن دەست و پیان کەڤی. ڕۆژا دوویی داهات و میرزا ئەحمەد و میرزا مەحەمەد هەستان گۆتیان:. کەچەل برو هەسپێ مە بینە بۆمە زین بکە (کەچەل)یش ب دلەکی کول هەستا چوو هەسپێ برایی خۆی بۆ زین کردن و ئینان (کەچەل)ە گۆتی:. برا ئەڤرو من دگەل خۆ ببن گۆتیان :. نیدانییە ئەگەر تۆ ڤێ قسێ دوو بارە ب کەیەڤە دێ تە کوژین . وەل حاسل نەیان برد بخۆ چوون پشتی وان (کەچەل)یش هەستا بەرێ خۆیی وا شکەفتێ و هەسپێ سپی جل و بەرگی سپی شێر و مەتاری سپی ئێنانە دەری و سوار بوو لێدا ل رکیتی تا چوو سەری مەیدانی و سەرەکی بەردا دەشتی و سەرێ پاشتر بەرێ هەسپێی خۆیی وا مەیدانا حاکمی وەخۆی ت سەر چالە قیرێ فڕەدا هاڤێت و دەستێ کیژا ناڤی تریش گرت و سواری هەسپی کرد و بردییە شکەفتێ گەریاڤە مال . برایی وە هەر دووك گەریانەڤە مال ، وە (کەچەل)ی گۆتی:. برا ئەنگو ئەڤرو چ کرد چ نەکرد ؟ گۆتیان :. کەچەل ئەڤرو مەدیت سوارەکی سپی هات لەلایی شەرقی ڕا دەستی کیژا حاکمی گرت و برد بۆ لایی غەربێ .

ڕۆژا سێی داهات دوو بارە برایی (کەچەل)ە بری خۆ داڤە مەیدانی وە (کەچەل)هەستا بەرخۆ بەرێ خۆی دا شکەفتێ وە هەسپی سۆری ئینا دەرێ جل و بەرگی سور و شیر و مەتاری سۆری هەلگرتن و بەرێ خۆی دا مەیدانی و خۆی تاسەر چالە قێرێ ڕا هاڤیت و دەستێ کیژا کچکەیگرت و بردی یەنگ خۆشکیت وی ل شکەفتێ داینا و ڤەگەریاڤە مال دیتی کو برایی وە هاتنەڤە (کەچەل)ە لێ پرسی ها برا ئەڤرۆ چ بوو چ نەبوو؟ برایی (کەچەل)ە گۆتی: مەدیت سوارەکی لیباس سۆر هات و دەستێ کیژا حاکمی گرت و بردی.

(کەچەل)ە گۆتی:. باشە برا ئەنگو نەزانی ئەو چ سوار بوو؟ گۆتیان:. نەخێر (کەچەل)ە گۆتی:. برا وەرن رونین وا ئەز بۆ ئەنگو باخڤم ، گۆتیان:. باشە کەلە تۆ دێ چ حەکایەت بۆ مەکەی ، وەختی رونشتن کەچەلە گۆتی:. برا ئەری هەکە ئەو سوارێ کیژێت حاکمە بردە ئەز بوی یم وێ باوەرکەن! میرزا ئەحمەد هەستا سەر بێبکەی گۆتی :. ئەڤ هندە مابو تۆ بۆ خۆ سوعبەتا ب مەبکەی داوا کۆتانی ل کرد (کەچەل)ی گۆتی برا ئەز بووم باشە (میرزا ئەحمەد)ە گۆتی:. برا کەچەل مادام تۆ بوی تۆ ئەڤ تەوارەکە تۆ لکێرێ ئینا بوو ؟ گۆتی:. برا ل شەڤا حەرەسیا میرزا ئەحمەدە کو ئەو هاتەڤە ئەز چوم من دێت دێوەکی ڕەش هاتە سەر قەبرێ بابێ و گورزەکی لبن زیارەتەدا کو وا ل قەبرە دەر ئینی من ئەو دێو کوشت و بردمە شکەفتێ نزیك زیارەتێ بابێ خۆ هەسپ و هەمە شتێ وی روژا دویش هەروە ئەگەر باوەریش نەکەن وەرن دگەل من دا بچینە شکەفتێ هەستا برایی وە دگەل چوون بۆ شکەفتێ (کەچەل)ە هەسپی ڕەش و کیژا مەزنترێ وا برایی خۆ میرزا ئەحمەدی وە کیژا ناڤی ترێ دا (میرزا مەحەمەد)ە دگەل هەسپێ سپی وەیا کچەکەی بۆ خۆ ڤەگێرا .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: سێ دێوە کە رەش و سپی و سورن .**

# عەفان و عەبەلۆر

**کۆکردنەوە: ڤیان عــەزیز ســـادق**
**:سەمیرە خورشید مەولود**
**گێڕانەوەی: ئیسماعیل عوسمان موراد**

**هەبوو نەبوو، لە گوندێك دوو برا هەبوون، یەکێکیان کوڕەکی هەبوو ناوی عەفان بوو، ئەوی تر کچەکی هەبوو ناوی عەبەلۆر بوو، ئەو کوڕە و ئەو کچە گەورە بون و جاحێربوون ئەو دوو ئامۆزایە زۆر دڵیان بەیەکدا چوو بوو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر یەکتریان خۆش دەویست. لەدواییدا بۆ یەك بوون و ژیانی ژن و مێردیان پێك هێناو و هەردووکیان توانای سحر کردنیان هەبوو ڕۆژێك عەفان دەچێتە ناو تەویلە تەماشا دەکات دەبینی ئەسپەکان لاواز بوینە و دەرێتە خزمەتکارەکەیان ئەو ئەسپانە لۆ وایان لێ هاتووە ؟ ئەویش دەرێ لۆ ئاگات لێ نییە کە عەبە لۆر هەر شەوە و ئەسپێك دەبا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ عەفان هەستی دەکرد کە عەبە لۆر وەکو جاران نەمایەو بۆیە عەفان بڕیار دەدات کە بەشەو مراقەبەی بکات شەوێك عەفان و عەبە لۆر دەچنە بن پەردە بۆ ئەوەی بنون عەفان نانوێ تەنیا چاوەکانی قەپات دەکات بۆ ئەوەی مراقەبەی عەبە لۆر بکات ئەو درەنگ عەبە لۆر لەخەو هەڵدەستێ مۆری خەو لە سنگی عەفان دەدات (ئەو مۆرە وا دەکات کە مرۆڤ هەڵنەستێ لەخەو) وە زۆر جوان خۆی دەڕازێنێتەوەو خواردن لەگەڵ خۆی دەباو ئەسپێك لە تەویلە دەبات و دەڕوا .**
**عەفان لە دووی عەبەلۆر هەستا و ئەویش چوو لە تەویلە ئەسپەکی زۆر خێرا تری هێناو لەدوو عەبە لۆر ڕۆیی زۆر ڕۆیشت بێ ئەوەی عەبە لۆر هەستی پێ بکات عەفان دیتی لە دەرێی گوندەکەیان عەبە لۆر چووە ناو ئەشکەفتەك کە جوەکی تێدا دەژی ئەویش لە پەناوە تەماشای دەکرد دیتی عەبە لۆر چووە ژووری و جوەکە بەرەو پیری هات و خۆی لە عەبە لۆر تورە کردو جوونی پێ داو گۆتی: بۆ زوو تر نەهاتی؟ عەبە لۆریش گۆتی: عەفان خەوی لێ کەوتووە**

وەلحاسڵ عەبە لۆر هەتا دوو سێ سەعات لەلای جوەکە مایەوە و دوایی هەڵدەستێ دێتەوە کە بڕەك لە ئەشکەفتەکە دوور دەکەوێتەوە لەو لایە عەفان بە خێرایی دەچێتە لای جوەکە و دەبینی جوەکە هۆشی لەخۆی نییە و سەرخۆشە ، عەفانیش شیرەك لە ملی جوەکە دەدات و سەری دەبڕی و سەرکی دەهاوێتە ناو تورەك و دەستی دەهاوێتە ناو هەگبەکەی و دەگەڕێتەوە بەڵام ئەسپەکەی زۆر زۆر خێرایە کە بەو ئەسپە دەگوترێ ئەسپی باو باران پێی دەگەڕێتەوە ماڵێ و پێش عەبە لۆر ئەسپەکە دەباتەوە تەویلە و تورەگەکە بە دارێ وەدەکات و دەچێتە ناو جێ و مۆرەکە لەسەر سنگی خۆی دادەنێ . پاش ماوەیکی کورت عەبە لۆر دەگاتە جێ و ئەسپەکە دەبەستێتەوە دێتە ژۆرێ و دەبینی عەفان لەناو جێگای خۆیەتی و وەکو شەوەکانی تر ، بەڵام کە دەچێتە ناو جێ دەستی بە عەفان دەکەوێ و دەبینی عەفان ساردە وەکو شەوان گەرم نییە . عەبە لۆر هەستی بە شتەك کرد بەڵام دەنوی .

سبەینێ هەستان لەخەو وەختی نان خواردن عەفان گۆتییە: خزمەتکارەکەیان ئەو تورەکەیەم لۆ بینە بە هەدیە لۆمان هاتییە ، خزمەتکارەکەش هێنای و دایە عەفان ، عەفانیش تورەگەکەی ڕژاند لەپێش عەبە لۆر و سەری جوەکە کەوتە گۆڕێ و پاش بەیەك داچوون و قسە بەیەك گووتن عەبە لۆر شووتەك لە عەفان دەدات و دەرێ بە نیازی ئەوەی ببیە سەگ عەفان دەبێتە سەگ . سەگەکە (عەفان)لە ماڵێ دەرواو جارێك لەسەر کانی سێ چوار کچی ناسیاری خۆیان سەگەکە دەبینن و دەرێن ئای عەفان لەبەر مەکری عەبە لۆر وات لێ هات ، عەفان بە شێوە وەکو سەگ بوو بەڵام وەك مرۆۋ تێیان دەگەیشت و قسەی دەکرد .

ڕۆژەك یەك لەو کچانە کە ئەویش توانای سحر کردنی هەبوو گۆتی: عەفان دەتوانم چاکت بکەمەوە بە شووت وە سێ شووتت لێ دەدەم بەڵام دەبی بە هیچ شێوەیەك دەنگت لێوە نێ ئەگەر نا نوقەت لێوە هات ئەوە شێوەی سەگت هەر پێوە دەمێنێ . عەفانیش دەرێ باشە . کچەکە شووتی یەکەمی لێ دەدا نوقەی ناکات وە شووتی دووەمی لێ دەدات هیچ نوقە ناکات بەڵام کە شووتی سییەمی لێ دەدات عەفان دەرێ ئۆف هەموو لەشی دەچێتەوە سەر مرۆۋ تەنها

کلکی سەگی پێوە دەمێنێ . عەفان زۆر مەمنونی کچەکە دەبی و جلکی خۆی لەبەر دەکات و کلکی لەناو شەروالی دەنێت . عەفان دەچێتەوە ماڵێ و لەناکاو چاوی بە عەبە لۆر دەکەوێ و شووتەکی لێ دەدات و دەرێ بە نیازی ئەوە ببیتە کۆترێکی بێ باڵ ، عەبە لۆریش یەکسەر دەبێتە کۆترێکی بێ باڵ بەو جۆرە هەر لە ماڵێ دەبێت و هەموو خەڵکی شارەکەی خۆیان و شارەکانی دی حەزیان دەکرد بە حیکایەتی عەفان و عەبە لۆر بزانن بەلاّم کەس نەیدەوێرا حیکایەتەکە بگێڕێتەوە چونکە عەفان شەرتی کردبوو کە هەر کەسێ حیکایەتەکەی ئەو و عەبە لۆر بگێڕێتەوە ئەو دەیکوژێت بۆیە ئەو سرە بە نهێنی دەمێنێتەوە .

ڕۆژێك پیاوێك لە شارێکی دی گووتی دەبێ لەو حیکایەتە تێ بگەم و نەکوژرێم و بۆ خەڵکی بگێرمەوە ، سواری پشتی سیمرخەك دەبی و دێتە شارەکە و سیمرخەکە تێ دەگەیەنی کە لەسەر بانی ماڵی عەفان بنیشێ، سیمرخەکە لەسەر بانی ماڵی عەفان دەنیشێ و پیاوەکە دەچێتە ماڵی عەفان بە عەفانی گۆت ئەو حیکایەتەم بۆ بگێڕەوە عەفانیش گووتی باشە بەلاّم دەزنی شەرتەکەی من چییە ؟ پیاوەکەش گۆتی: دەزانم کە ئەمڕۆ ئاخیر ڕۆژمە لەسەر دونیا ، عەفان گۆتی: باشەو حیکایەتەکەی خۆی لۆ گێڕاوە و عەبە لۆریشی پیشان دا کە بۆتە کۆترەکی بێ باڵ. ئەوجا عەفان گۆتی: با شەرتەکەشم جێ بەجێ بکەم پیاوەکەش گۆتی: باشە من حازرم بەلاّم حەزم لییە لۆ ئاخیر جار تەماشای شارەکە بکەم و ئەوجا بمکوژە . عەفانیش گۆتی: باشە بڕۆ. پیاوەکەش چووە سەربان و بە خێرایی سواری سەر پشتی سیمرخ بوو بەسەر حەوشەی عەفان دا تێپەڕی و گۆتی: عەفان خوا حافیز .عەفانیش لە خەفەتان شیرەکی لە عەبە لۆر داو کوشتی ئەوجا شیرەکیشی لەخۆی داو خۆی کوشت بەو جۆرە ئەوان مردن و حیکایەتەکەشیان لەسەر زاری ئەو پیاوە ئاشکرا بوو بلاّو بۆوە .

***ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: سحر کردن و مێروی خەوێ و ئەسپی باو باران و عەفان کردن بە سەگ و ژنەکردن بە باڵندەی بێ باڵ .**

# چیرۆکی دوو برایەکە

هەبوو نەبوو، دوو برا هەبوون، ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو دوو برایە ڕۆیشتن بۆ سەفەرێك چوون یەك و هەندە نانیان لەگەڵ خۆیان برد، لە ڕێگادا زۆریان برسی بوو برایە بچوکەکە وتییە برایە گەورەکە زۆرم برسییە با نان بخۆین ئینجا برا گەورەکە وتییە برا بچوکەکەی وەرە با جاریٚ نانی تۆ بخۆین ئەوجا لە دوایی نانی من دەخۆین نانەکەیان خوارد لە دواییدا ماوەیەکی زۆر ڕۆیشتن دیسان زۆریان برسی بوو برایە بچوکەکە وتییە برا گەورەکەی وەرە با نانی تۆ بخۆین زۆرم برسییە برا گەورەکە لە وەلاٚمدا گۆتییە برا بچوکەکەی هیچ نانم پیٚ نەماوە و نانیش ناخۆین وەرە با بڕۆین ماوەیەکی تر ڕۆیشتن دیسان گۆتی: برام نانەکەت بینە با بخۆین زۆرم برسییە ئەویش لە وەلاٚمدا دیسان پێی وت: نانم پیٚ نەماوە برایە بچوکەکەی لە برسانا کەوتوو نەیتوانی هیچی تر بڕوات برایە گەورەکە بەجێی هێشت و نانەکەی نەدایە براکەی بە تەنها ڕۆیشت و بەجێی هێشت پشتی لە برای کرد دەستی بە نان خواردن کرد .

برایە بچوکەکە بە ماندوویەتی دەڕۆیشت تاوەکو گەیشتە کونێك گۆتی: وا باشە لەو کونەیە خۆم حەشار بدەم تاوەکو بەیانی ، کە شەو داهات تەماشای کرد کە گورگ و ڕێوی و شێر هاتنە نزیك کونەکە هەر کەسەو ڕای خۆی دەربڕی بەخواردنی ئەو ڕۆژە گورگ گۆتی: سەگێکی ڕەش هەیە نەیهێشتوە هیچ خواردنێك لەو کونە بخۆم ئەگەر ئەو سەگە بکوژرێت خوێنی ئەو سەگە دەبێتە چارەسەری نەخۆشی کچی پاشای کە کچەکەی گوڕو بووە پیٚ چاك دەبێتەوە ڕێوی گۆتی: منیش سیٚ کوپە لیرەم دۆزیوەتەوە ئەگەر ڕۆژانە هیچ نەخۆم لەسەر سیٚ کوپە لیرەکە دێم و دەچم تێر دەبم شێرەکەش گۆتی: من هیچم دەست نەکەوتووە ئەوان هەر باسی خۆیان دەکرد ئەو شەوی کەسیان نەچوونە کونی خۆیان تا بەیانی بۆوە هەر کەس بۆ ڕاو کردنی خۆیان ڕۆیشتن کابرا لە کونیٚ هاتە دەریٚ بەرەو گوندەکە ڕۆیشت لەسەر ڕێی خۆی کوپە لیرەکەی دۆزیەوە هەڵی گرت کە چووە گوندی لای دا ماڵەکی گۆتی: من دکتۆرم ساحێب ماڵەکە گۆتی: مادام دکتۆری دەتوانی کچی پاشا چابکەیتەوە

گۆتی: بەڵێ دەتوانم دکتۆریان بردە لای پاشا و پاشا پێی گۆت: دکتۆر دەتوانی کچی من چا بکەیتەوە کە گوڕو بووە وە ئەگەر نەت توانی سزای سەختت دەدرێ دکتۆر بەڵێنی دایێ کە کچەکەی چاك بکاتەوە پاشا ڕازی بوو دکتۆر بە پاشای گۆت: دەبێت بچن سەگێکی ڕەش هەیە لە گوندی ئێوە دەبێ بیکوژن خوێنی ئەم سەگەم بۆ بهێنن ئینجا کە خوێنەکەی بۆ هێنا بەسێ جار گوڕیەتییەکەی پێ چا بوو ئینجا پاشا لە خۆشی ئەوەی کە کچەکەی چاك بۆتەوە ئاهەنگێکی گەورەی سازکرد لە گوندی هەموو خەڵکی گوندی بانگ کرد بۆ ئاهەنگەکە پرسیاری لە خەڵکەکە کرد کە پاداشتی ئەو دکتۆرە چییە مەلای گوندی گۆتیە پاشا باشترین خەلآت ئەوەیە کە کچەکەی خۆتی بدەیێ هەر لە ئاهەنگەکە کچەکەیان مارە کرد لە دکتۆر پاشا پێی گۆت: هەر من ماڵتان بۆ دابین دەکەم دکتۆر گۆتی: سوپاست دەکەم بەلآم من ماڵم زۆرە بەخۆم ماڵ دادەنێم ئەوە بوو کوپە لیرەکەی هەندێك فرۆشت کردی بە قەسرێکی گەورە ئینجا بووکی هێنا ماڵەوە ڕۆژێك لە ڕۆژان هەژارێك دێتە بەر دەرگای ماڵیان ئەویش دەرگای لێ دەکاتەوە دەبینی کابرایەکی هەژارە ، برایە بچووکەکە کابرا هەژارەکە دەناسی کە برایە گەورەکەی بوو ئەوەندە گۆڕاوە لە ژیاندا بانگی ژوورێی کرد کە بچێتە ژوورەوە کابرایە هەژارەکە چووە ژوورەوە نانی دایە کابرای هەژار و ماندویەتی حەسایەوە لێی پرسی کابرا ئەتۆ دەتوانی ئەسپێکم هەیە تەنها ئاوی بدەرێ و بیگەڕێنەوە شوێنەکەی خۆی ئەگەر دەتوانی ئەوا وەکو برام دەبیت لە ماڵدا بۆ هەموو هەڵس و کەوتێك هەروەها لە جل و بەرگیش وەکو یەك دەبین ئەویش گۆتی: بەڵێ، دەتوانم ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوە ڕۆژێك گۆتییە: ساحێب ماڵ من دەڕۆم لێرە نابم ساحێب ماڵ گۆتی: بۆ لێرە نابیت کێ عادزی کردی خۆ تورە نەبوی لۆ دەڕۆی؟ گۆتی: هەر دەڕۆم برا بچوکەکە پێی گۆت: ئەتو کەست هەیە دەڕۆیە کێ برایە گەورەکە دەستی بە گریان کرد و گۆتی: بەڵێ برایەکی بچوکم هەبوو بەلآم لە ڕێگایەك پێکەوە دەڕۆیشتین هەندێك نانمان پێ بوو برایە بچوکەکەم گۆتی: برسیمە با نانی بخۆین منیش گۆتم: با نانەکەی تۆ بخۆین ئینجا نانی من دەخۆین لە دواییدا نانەکەی خۆمم نەدایێ بەجێم هێشت نازانم ئێستاکەش

مردووه یان ماوه برا بچوکه‌که به برا گه‌وره‌که‌ی گۆت مه‌گری من برایه‌که‌تم وه‌ره لام به با پێکه‌وه بژین هه‌روه‌کو جاری جاران برایه گه‌وره‌که له برایه بچوکه‌که‌ی پرسی ئایا ئه‌و ماڵ و سامانه‌ت له‌کوێ په‌یدا کردووه ئه‌ویش هه‌موو حه‌کایه‌ته‌که‌ی بۆ گێڕایه‌وه برایه گه‌وره‌که گۆتی: هه‌ر تازه لێره نابم هه‌ر ده‌ڕۆم ده‌چم بۆ ئه‌و شوێنه‌ی که تۆڵێی بوویت برایه بچوکه‌که گۆتی: وه‌ره مه‌ڕۆ له‌گه‌ڵم بژی برایه گه‌وره‌که به‌گوێی نه‌کرد ڕۆیشت چوه کونی ڕێویه‌که که شه‌و داهات سه‌گه‌که‌و ڕێویه‌که‌و شێره‌که گه‌ڕانه‌وه بۆ لای کونه‌که سه‌یری کونه‌که‌یان کرد کابرایه‌که‌یان ده‌رهێناو خواردیان کراسم دڕاو هیچم پیێ نه‌بڕا .

***ڕه‌گه‌زی ئه‌فسانه‌یی ئه‌م چیرۆکه: خوێنی سه‌گی ڕه‌ش ده‌رمانی گۆڕوێتی کچی پاشایه. وقسه کردنی شێر و سه‌گ و ڕێوی .**

# عەقڵ تاجی زێڕینە لەسەری هەموو کەس دا نیە

**کۆکردنەوە: ڤیان عەزیز سادق**
**گێڕانەوە: عەزیز قادر عومەر**

**هەبوو نەبوو، پاشایەك هەبوو، وەزیرێکی زۆر زیرەکی هەبوو لە کارو بارەکانیدا، ڕاوێژی پێ دەکرد. ڕۆژێکیان پاشا لەگەڵ وەزیری خۆی گرفتێکیان لە نێوان دا پەیدا بوو، پاش ئەو هەموو دڵسۆزیەی وەزیر بۆ پادشا کەچی پاشا چاوپۆشی لە ڕۆژانی ئەو گرفتە نەکرد بۆیە وەزیر ناچار بوو کە لای پاشا بەجێ بهێڵێ ڕوو لە ناوچەیەك بکات وتی بچم خزمەتکاری یەکێ بکەم باشترە لەوەی کە خزمەتکاری پاشا بم .**

**ماوەیەك پاشا بێ وەزیر مایەوە، بەڵام دواتر بڕیاری دا کە دەبێ یەکێکی زیرەك بکا بە وەزیری خۆی بۆ ئەم مەبەستە داوای کرد کە چەند عاقڵ مەند کۆ بکاتەوە بۆ هەڵبژاردنی یەکێ لەوانە پلانێکی دانا ئەو پلانەی کردە تەرازویەك بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە .**

**بۆیە فەرمانی دا بەو عاقڵ مەندانە کە هەریەکەو بەرخێکیان دەداتێ و لە ماوەی مانگێکدا دەبێ لە ڕوی کێشەوە وەکو خۆیان بن بە ڕاستی ئەو کارە زۆر زەحمەت بوو بۆ عاقڵ مەندەکان چونکە چۆن دەتوانن کێشی بەرخەکان لەسەرەتای بەخێو کردنی تاکو سپاردنی بە پاشاوە کێشی نە زیاد بکا نە کەم بکا لە ماوەی مانگێکدا هەر یەکە لە عاقڵ مەندەکان بەرخەکەیان بەخێو کرد تەنیا یەك لەو عاقڵ مەندانە توانی کێشی وەکو خۆی بهێڵێتەوە ئەوە بو پاشا بانگی ئەو عاقڵ مەندەی کرد پێی ووت: چۆن توانیت ئەم کارە ئەنجام بدەین ... کابرا وتی پیاوێك ئەم پلانەی بۆ دانام کە خزمەت کارە ئەویش ئەوە بوو (وتی پاش ئەوەی خواردن دەدەیتە بەرخەکە گورگێك بهێنە بۆ ئەوەی بەرخەکە لێی بترسێ و هیچ گۆشت بەو خواردنە نەگری) . پاشا پاش گێڕانەوەی ئەم**

**بەسەر هاتە لەلایەن ئەو عاقڵ مەندە یەکسەر زانی کە ئەو کابرایەی تەکبیری بۆ ئەو کردووە وەزیری پێشوی خۆیەتی .**
**بۆیە پاشا پاش چەند جار داوای لە وەزیری پێشوی کرد کە بگەڕێتەوە لای بەڵێنی دا جارێکی تر هەڵەی وا دوو بارە نەکاتەوە .**

***ئەم حەکایەتە حەکایەتی هەیاس و سوڵتان مەحمودە بە ناتەواوی .**

# ڕەنجی کار

**هەبوو نەبوو، کابرایەك هەبوو، سێ منداڵی هەبوو (هەرسێ منداڵی کوڕ بوون) ئەو پیاوە زۆر هەژار بوو، هەر چۆنێ بوو پارەی ژیانی ڕۆژانەی پەیدا دەکرد بژێوی خاو خێزانەکەی دابین دەکرد. ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆی ئەم کابرایە بەردەوام بوو لە کاسبی کردن تا کوڕەکانی هەر سێکیان گەورە بوون بەڵام چ جۆرە کوڕێك دەچوون هەر سێیەك لەیەك تەمبەڵ ترو نا کاسب ترو پێچەوانەی باوکیان بوون ، باوکیان زۆر هەوڵی دەدا لەگەڵ ئەم کوڕانەی کە هەر یەکەیان کارێك بۆ خۆیان بدۆزنەوە بەڵکو بتوانن ژیانی ئێستا و ژیانی داهاتوو بۆ خۆیان دابین بکەن و تەنانەت بتوانن خێزان بۆ خۆیان بهێنن لە بەڕێوەبردنی خێزانەکەیان دا پشت بەخۆیان ببەستن و چاویان لە دەستی کەس نەبێ بەڵام سوودی نەبوو ، تەنانەت ئامۆژگاری کردنی ئەم کوڕانە لەلایەن باوکیانەوە بوە هۆی بێزار کردنی باوکیان ..... . هەر چۆنێك بێ ئەم خێزانە بە نان و ئاو ژیانیان بردە سەر پاش چەند ساڵێك باوکی ئەم کوڕانە پیر بوو زۆر نەخۆش بوو و لەسەر مەرگ دابوو بانگی هەرسێ کوڕەکەی کرد کە پێش مردنی ئەم وەسیەتەی بۆ کردن ئەویش ئەوە بو داوای لێکردن کە ئەم زەویە هەڵ کۆڵن چەندین کوپە لیرەی تێدا دەدۆزنەوە .... .**

**پاش مردنی باوکیان و ئەوە بو کوڕەکان وتیان: با بچین ئەم زەویە هەڵ کۆڵین هەروەکو باوکمان وەسیەتی بۆمان کرد کە کوپە لیرەی تێدایە .**

**ئەوە بوو کاتێك کە کوڕەکان زەویەکەیان هەڵ کۆڵی هیچ کوپە لیرەیان لەوێ نەدۆزیەوە .... .**

**دواتر کوڕەکان وتیان مادام هەر کوپە لیرەمان نەدۆزیەوە با ماندو بونمان بەلاش بە فیڕۆ نەڕوا با خۆشتری بکەین بۆ ئەوەی شتێکی تیدا بچینین، بڕیاریان دا کە گەنم و جۆ بچینن پاش باران بارین و هاتنی وەرزی دروێنەی دەغڵ و دان هات ئەوە بو کوڕەکان دەستیان کرد بە دورینەوەی دەغڵ و دانەکە..... .**

بردیان فرۆشتیان ئەوە بو قازانجێکی باشیان لەم ماندوبونە کرد . پارەیەکی زۆریان بەهۆی ئەمەوە پەیدا کرد ئینجا کوڕەکان زانیان کە مەبەستی باوکیان لە هەلّ کۆڵینی زەوی ئەم کوپە لیرانە ئەوە بو کە کردیان و بە دەستهێنانی پارەی حەلاّلّ کوڕەکان بڕیاریان دا کە واز لە تەمبەڵی بهێنن بەردەوام بن لە هەولّ دان چونکە هیچ شتیّ بەبیّ هەولّ و ماندوو بوون بە ئەنجام نایی ، کوڕەکان پەندیان لەم ئامۆژگاریەی باوکیان وەرگرت .

*حەکایەتێکی پەند ئامێزە .

# بەسەرهاتی دایکێك

**گێڕانەوە: قادر حەمەد قادر**

هەبوو نەبوو بازرگانێکی خەڵکی بەغدا هەبوو لەنێوان بەغداو شام دا بازرگانی دەکرد جارێك لەکاتی بازرگانیدا لە بیابانێکی نزیك گوندەك مانەوە لەبەر ئەوەی خێزانەکەی خۆی لەسەر منداڵ بوون بوو، خێزانەکەشی لەگەڵیاندا بوو لە بازرگانیەکەدا، لەبەر ئەوە بازرگانەکە و پیاوەکانی شڵەژان و نەیاندەزانی چی بکەن! بەلاًم لە دوور ئەوان ئاگرێك دیار بوو ئەوانیش دوو پیاویان بۆ لای تروسکە ئاگرەکە نارد، کاتیٚ کە نزیك ئاگرەکە کەوتن بینیان ئەم ئاگرە لە ماڵێکی ناو گوندەکەوەیە، کاتیٚ لە دەرگای ماڵەکەیان دا ئافرەتێکی جوان و خنجیلانە دەرگای لەسەر والاً کردن و پرسیاری ئەوەی لیٚ کردن .

ـ فەرمون کاکە چیتان دەوێت ؟

ئەوانیش بەم جۆرە وەلاًمی ئافرەتەکەیان دایەوە :.

ـ لەڕاستیدا ئێمە هاتوینە ئەم گوندە کەچی لە ڕێگادا لێمان قەوماوە .

ـ بەڵیٚ، بەلاًم با بزانم چیتان پێویستە ؟

ـ ئێمە ئافرەتێکی وەکو جەنابتمان پێویستە چونکە ئافرەتێکمان لەگەڵدایە دوو گیانەو ئێستا خەریکە منداڵی ئەبێت .

ئافرەتەکە تاوێك ڕاوەستاو گووتی :.

باشە، بەلاًم من خاوەن پیاوم و تۆزێك بوەستن تاوەکو قسەی پیاوەکەم وەربگرم .

پیاوەکەی گوێی لیٚ بوو گووتی لەگەڵیاندا بڕۆو ئەم خێرە بکە بەلاًم ژنەکەی گووتی:

ـ پیاوەکە چۆن لەگەڵیاندا بچم شورەییە بۆ من .

له ئەنجامدا هەردووكیان له گەڵیاندا چوون، بەڵام لەماڵەوه دوو منداڵی بچوكیان هەبوو ناچار بوون بەجێیان بهێڵن چوونكه منداڵەكان خەوتبوون.

هەر چواریان ڕۆیشتن بۆ لای ئافرەته سك پڕەكەو مێردە بازرگانەكەی ، بەڵام كاتێ كابرای بازرگان چاوی بەم ئافرەته جوانه كەوت یەكسەر دڵی گۆڕاو بیری له پیلانێك كردەوه بۆ داگیر كردنی ئەم ژنه خێر خوازە كه خاوەن مێرد و دوو منداڵ بوو ، بردیان بۆ لای ژنه سك پڕەكەو پاش ماوەیەك به مێردی ژنەیان گووت: (وا چاكتره تۆ بچی بۆ لای منداڵەكان و ئەم ئافرەته لای نەخۆشەكه بێت تاوەكو بەیانی) بەڵام پیاوەكه گووتی ئێستا منداڵەكان لەخەو هەڵساون و برسیانه پێویستیان بەخۆراك هەیه ، ئەوانیش گووتیان: ئێمه خۆراكی زۆرمان لایەو دەتوانی خۆراك بۆ منداڵەكان ببەیت ، كاتێ پیاوەكه گەڕایەوه ماڵەوه هێشتا منداڵەكان لەخەو هەڵنەستابوون ناچار پیاوەش لێی خەوت .

پاش ئەوەی ژنەكه منداڵی بوو ئەم بازرگانه بێ ویژدانه كه فەرمانی دەركرد بهێنن ئەم ژنه بێ تاوانەی بخەنه ئاوی فەرمانی ئەوەی دا كه بارگه تێك بنێن و ئەم جێگا جێ بهێڵن . بەیانی داهات و مێردی ژنەی داماو زۆر چاوەڕێی ژنەی كرد كەچی نەژنەو نه هیچ لەبازرگانەكان دیار نەبوون و ئینجا به ناچاری خۆی گەیاندە لای یەكێك له جیرانەكانی بۆ ئەوەی ئاگای له منداڵەكانی بێت و بەرەو شوێنی مانەوەی بازرگانەكان ڕۆیشت كەچی سەیری كرد هیچ كەس لەوێ نەماوه . كابرای خێركەر زۆر دڵتەنگ بوو. بەڵام هیچ چارەیەكی نەبوو تەنها ئەوه نەبێت كه بەدوایاندا دەگەڕا تاوەكو نیوەڕۆ گەڕاو بێ سوود بوو ناچار گەڕایەوه ماڵەوه و باوكه و منداڵەكان دەستیان كرد به گریان .

بۆ ڕۆژی دووەم چووه لای جیرانەكەی و ئەم بەسەر هاتەی بۆ باس كردو گووتی: ئەم ماڵەم ئەمانەتی تۆ بێت تاكو دەگەڕێمەوه. پیاوەكه دەستی منداڵەكانی گرت بەرەو شاری بەغدا، لەڕێگادا بارانێكی زۆری لێدان چونكه زستانێكی سەخت بوو، تووشی ڕووبارێك هاتوو نەیتوانی دوو منداڵەكه بەجارێك هەڵگرێت ناچار یەكێكیانی هەڵگرت و ئەوی تری بەجێ هێشت. منداڵی یەكەمی داناو بۆ هی دووەم گەڕایەوه و بردی تاوەكو نیوەی ڕووبارەكه

منداڵی یەکەم هاواری کرد باوکە گورگ خواردمی و باوکەش لەتاوی منداڵەکەی ئەوی تریشی لەدەست کەوتە ناو ئاوەوە .

کابرای بازرگانیش بەرەو بەغدا بەڕێ کەوت لە بەغدا خانە خوێیەکی هەبوو ژنەکەی دا بەدەست خانەخوێیەکەو گووتی: ئەمە ئەمانەت بێت تا لەسەفەر دەگەڕێمەوە. بەڵام نابێت هیچ کەسێك ئەم ژنە ببینێت، لەبەر ئەوە لە ژوورێکی تایبەتیان داناو کابرای بازرگان چوار پێنج مانگ جارێك سەرێکی لێ دەدا بەڵام ئەم ژنە بەهیچ شێوەیەك خۆی بەدەست ئەم پیاوە نەدەدا .
کابرای لێ قەوماویش وورده وورده دەچێت بەرەو بەغدا . منداڵەکانیش خۆش بەختانە ڕزگاریان ببوو بردیانن بۆ گوندێك تا ماوەی پێنج ساڵ، ڕۆژێکیان منداڵەکان ئەم گوندەیان بەجێ هێشت بەڵام هیچیان نەئەناسی کە تەمەنیان گەیشتبووە پانزە ساڵ .

منداڵەکان بەرەو شار کەوتنە ڕێ و تەکتبیریان کرد کە بەڕۆژ ئیش بکەن و بەشەو لە مزگەوت بخەون. لەلایەکی تر باوکیان بە ناچاری بەرەو شارەکە کەوتە ڕێ لە داخی منداڵەکانی و خێزانی جلە شڕەکانی لە ئارەقەدا هێندەی تر خەریك بوو جڕیان ئەبرد بەهۆی ئەوەی هێندە کۆن ببون هێزیان تیا نەمابوو .

کاتێ گەیشتە ناو جەرگەی شار هەنگاوە هێواش و لەسەر خۆکانی تۆزێ خێرا تر بوون کاتێ بینی کەوا خەڵکی شار کۆ بوونەتەوە، بۆ ئەوەی بزانێ ئەم مەسەلەیە چییە ئیتر کاتێ زانی پاشای شار مردووە. بۆیە ئەیانەوێ یەکێك بکەن بە پادشای شار بۆیە کابرایەکی ئەسپ سوار بازێکی لەدەست بوو هەریدا بۆ ئەوەی بزانن کە لەسەر سەری کێ ئەنیشێ . تاوەکو بیکەنە پادشای شارەکە. ئینجا دوای هەڵدانی بازەکە تاوەکو سێ جار ئینجا بینیان هەر سێجار لەسەر سەری پیاوە هەژارو فەقیرەکە ئەنیشێت بۆیە بەناچاری کردیان بە پادشای شار بردیان بۆ حەمام و شوشتیان دەستێك جلی پادشاییان کردە بەری و بردیان لەسەر تەختی پاشایان دانا دوای ئەوەی پادشا دەست نیشان کرا دوای ماوەیەك کابرای بازرگان لە بازرگانی گەڕایەوە بەرەو ئەو جێگایەی یاو ئەو شارە. ئینجا کابرای بازرگان داوای دوو حەرەسی کرد بۆ ئەوەی

ئاگاداری ماڵەکەی و ژنە زیندانی کراوەکە بکەن . بە ڕێکەوت ئەم دوو کوڕەی کابرای هەژار کەتا ئەو کاتەش هیچیان دەربارەی ژیانی ئەوی تریان زانیاریان لا نەبوو، لەبازاڕ خەریکی کاسبی و کار بوون . بەڵام لەبەر ئەوەی هەردووکیان بیٚ کەس و کار بوون هیچیان حەزی نەدەکرد لەوی تر جیا ببێتەوە و لەبەر ئەوەی یەکتریان زۆر خۆش دەویست. هەردەم پێکەوە کاریان دەکرد پیاوەکانی بازرگان وتیان: ئێمە تەنها پاسەوانێکمان ئەوێت. ئەوانیش ووتیان (ئێمە بەیەکەوە کار ئەکەین) بەڵام کابرای پاسەوانی بازرگان وتی باشە بەڵام بەهەر دوکتان تەنها یەك حەق وەرئەگرن یان یەك مووچە وەرئەگرن ، کوڕەکان وتیان باشە قبوڵمانە. کوڕەکان و پیاوی بازرگان ڕۆیشتن بەرەو ماڵی بازرگان تا گەیشتنە بەردەم ژوری ژنە زیندان کراوەکە: کابرای بازرگان خۆی ئیشی هەبوو بۆیە داوای لەم دوو کوڕە کرد کەوا نزیکی ئەو ژوورە نەکەون، وە ئاگاداری بن . وە بەهیچ شێوەیەك ئەم دەرگایە نەکەنەوە .

کاتیٚ کە شەو داهات یەکێك لە کوڕەکان وتی: برام با هەریەکەمان باسی ژیانی خۆمان بکەین بۆ یەکتری بۆیە یەکیان وتی: من کوڕی کابرایەکی هەژار بووم. شەوێکیان کابرایەکی زاڵم هات و دایکمیان برد وە ئێمە دوو برا بووین. بەڵام تاکو ئێستا دایکمان نەگەڕایەوە . باوکمان ئێمەی هەڵگرت و بۆ ئەوەی سۆراخی دایکمان بزانیٚ بۆیە لە ڕێگا تووشی ئاوێك بووین بۆیە براکەم ئاو بردی منیش گورگ بردمی بەڵام پیاوێك بە تفەنگێك تەقەی کرد و گورگەکە منی فڕیٚ دایە سەر زەوی بۆ ماوەیەك ئەم پیاوە منی بەخێو کرد. پاش ماوەیەك براکەی کە گوێی لەبەسەر هاتەکە بوو ئیتر بۆی دەرکەوت کە ئەمیش براکەیەتی بۆیە چاوەکانی پڕ بوون لە گریان و هەردووکیان دەستیان کرد بە گریان بە باوەش پیاکێشان و لەئامێزی یەکتری گرت ئینجا بۆیان ڕوون بۆوە کەبرای یەکترن . ئینجا وتیان ئینشائەڵاٚ بەدایك و باوکمان شاد دەبینەوە .
ئینجا کە دایکەکە لەژوورەکەدا گوێی هەڵخستبوو گوێی لەهەموو بەسەر هاتەکە بوو بۆیە ئەمیش لە ژوورەوە دای لە گریان و هاواری ئەکردو ئەی وت: (کوڕەکانم ئەوە منیش دایکتانم)ئەم زۆر دارە بەزۆرداری خۆی منی لێرە حەشاردراوە .

بۆیە کوڕەکان لەخۆشیان خەریك بو باڵیان ئەگرت. بۆیە دەرگاکەیان شکاند و دایکەکەیان هێنا دەرەوە لەبەر ئەوەی هێندە ماندو بوون وەسۆزی دایکیان وای لێ کردن تا ڕۆژ هەلأت بەدیار دایکیانەوە خەویان لێ کەوت . پاش ڕۆژ هەلأت کابرای بازرگان گەڕایەوە کەچاوی بەم دیمەنە کەوت ئارامی لێ هەڵگیرا. کوڕەکانی گرت و چووە لای پادشای شارەکەو شکایەتی لێ کردن لەلای پادشا. حار و مەسەلەکەی بۆ پادشا گێڕایەوە بۆیە پادشا زۆر لەم دوو برایە توڕە بوو کاتێ بەرەو ماڵی بازرگان کەوتە ڕێ هەر کەچاوی پێیان کەوت پێی گوتن: ئەوە لۆ ئەم کارەتان کرد ئەوانیش وتیان ئەمە حەقێکی ڕەوای خۆمانە پاشا لێی پرسین ئەوە ئێوە چی دەڵێن؟ بۆیە لەپاش گفتو گۆیەکی زۆر پادشا بۆی دەرکەوت کە ئەوانە کوڕەکانی خۆیەتی و ئەوەش خێزانەکەیەتی بۆیە کابرای بازرگان گیراو ئەم خێزانەش دوای ئەم ماوە زۆرە بەیەکتری شاد بونەوە .

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: باز هەڵدانە بۆ هەلبژاردنی پاشا .

# ژیان تا سەر بۆ کەس نیە ؟!

**کۆکردنەوە: گەلاوێژ حوسێن**

**گێڕانەوەی : مام ئەکرەم کەریم**

**هەبوو نەبوو، کەس لەخوای گەورەتر نەبوو، دوو برا هەبوون یەکێکیان ژنی هەبوو، ئەوی دیکە ژنی نەبوو دایك و باوکیان نەمابوو .**

**ئەم کوڕە ژیانی لەگەڵ براو براژنی بەسەر دەبرد، کوڕەکە لە مێشکی خۆیدا بیری کردەوە کە دەبێ بەدوای ئیشێك دا بگەڕێ، کوڕەکە بو بە جوتیار لەلای جوتیارێك بەلاّم کابرای جوتیار پێی وت: من گایەکم هەیە من (نیر)کە بە دەستمەوە دەگرم ئەتۆش لەگەڵ گایەك جوتی بکە کوڕەکە بە ئیشەکەی ڕازی بو ، ڕۆژگار سوڕاوە وەختی گەنم دورین بو ئەو ساڵی دەغڵ و دانێکی زۆر بۆ هات خاوەن کێڵگەکە واتە جوتیارەکە گەنمەکەی فرۆشت و پارەی زیادی بۆ ماوە گایەکی تری کڕی ، کوڕەکە لەدەست جوت کردن ڕزگاری بو چوە سەر کاری جوتیاری . براکەی هات سەردانی ئەحواڵی پرسی زۆر خۆشحاڵ بون بە دیتنی یەکتری .**

**ڕۆژگار سوڕایەوە کاتی گەنم دورینی بو کابرا واتە خاوەن ماڵ مرد . کوڕەکە مایەوە لەگەڵ ژنی جوتیاری مردو موڵك و سامانی بۆ ژنەکە مایەوە ، کوڕەکە بڕیاری دا کە دەبێ شوێنەکە بەجێ بهێڵن .**

**ژنی کابرای مردو پێی وت کە بۆ دەڕۆی من بەتەنیا لێرە ماوم من چاك شارەزای تۆ بوم بە شەریعەت من مارە بکەو ژیانی بەخۆشی دەبەینە سەر پاش ماوەیەکی دور و درێژ براکەی سەری لێ دا کەچی براکەشی ماڵ ئاوایی کرد چەند سەروەت و سامان لەپاشی بەجێ ماوە .**

***حەکایەتێکی ناتەواوەو هیچ ڕەگەزێکی ئەفسانیی تێدانییە .**

# بەد ڕەوشتی چاکییە ؟!

پیاوێك بەتەمای حەج کردن بوو، خوای گەورە بۆی ڕێك خست لەگەڵ قافڵەیەك بەڕێ کەوتن. سەفەر کردنی ئەو کاتە بە سواری بوو حوشترو ئەسپ بوو پێویستیەکانی خۆیان ئامادە دەکرد لە خواردن و ئاو و جل و بەرگ . دوای بڕینی ڕێگایەکی زۆر سەرۆك قافڵەکە بڕیاری دا کە پشو بدەن بۆ ئەوەی ماندو بونیان بحەسێتەوە. دوای ماوەیەکی کورت چەند جەردە و ڕێگر بەدەر کەوتن ئەو کەل و پەلانەیان برد و پیاوانی قافڵەی لەخوێن سور کردو پیاوەکە لەخوێن سور بوو بەڵام بەفێڵ خۆی مراند و ڕێگرەکانیش ناوچەکەیان بەجێ هێشت پیاوەکە ناچار بەڕێکەوت لە بیاباندا زۆر ماندو تینو برسی بوو ناچار ڕێگایەکی زۆری بڕی و لە دوورەوە عوربانی بێتی واتە ڕەشماڵ . دەستوری عەرەبان ئەو کات ئەوها بوو ڕەشماڵی شێخ دەبوایە دوری ئاوەدانی بێت و پیاوەکە لە ڕەشماڵی شێخ نزیك بوەوە و بینی ئافرەتێك لەناو ڕەشماڵەکە بو سەلامی کردو ژنەکەش وەڵامی دایەوە خواردن و ئاوی پێشکەش کردو ڕێزێکی زۆری لێ گرت.

ئێوارە خۆر بەرەو ئاوابون دەڕۆیشت پیاوەکە پرسی: کە پیاوەکەت کەی دەگەڕێتەوە؟ وتی: ئێواران دێتەوە. تەپ تەپی پێی ئەسپ هات و شێخ لەسەر ئەسپی ڕەش هاتە خوارێ . ئەویش بە هەمان شێوە بەخێرهاتنی کردو لە ژنەکەی پرسی کە چاك خزمەتی کردوە؟ ژنەکەش لە وەڵامدا هەروەك چۆن داب و نەریتی خۆمان کە چۆن ڕیز لەمیوان دەنێین .

بۆ بەیانی شێخ دەرچو بۆ لای مەڕو ماڵاتەکەی ژنی شێخی زۆر جوان بو پیاوەکە ویستی دەست درێژی بکاتە سەر ژنەکە، بەڵام ژنەکە پێی وت: من پرسم بەشێخ نەکردوە قەد شتی وای ڕوی نەداوە بەڵام نەریتی ئەو خێڵە وابو کە سێ ڕۆژو سێ شەو خزمەتی میوان بکەن بەبێ پرسین ئینجا دوای تەواو بونی سێ ڕۆژ کەلێی دەپرسن کێیە و چ دەکات .

هەمان ڕۆژ شێخ ئێوارە گەڕایەوە، بەڵام پیاوەکە زۆر غەمبار ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابو شێخ هەستی پێ کرد کە شتێك ڕویداوە . شێخ وتی: ئەوە بۆ میوانەکەمان غەمبارە لە ژنەکەی پرسی ژنەکەش بەسەرهاتی بۆ شێخی گێڕایەوە و شێخ کەمێك داماو قسەی نەکرد دوایی لە پیاوەکەی خۆش بو پیاوەکە لەخۆشیان دەست و پێی شێخی ماچ دەکرد . دوای تەواو بونی سێ ڕۆژ و شەو کە شێخ پرسیاری لێ کرد کەچۆن ڕێی بەئێرە کەوتوە پیاوەکە بەسەر هاتەکەی گێڕاوە کە بەتەمای حەج کردن بو قافڵەکەی کوژراوە و بە تەنیا ماوەتەوە .

شێخ وتی ئێستا چیت دەوێ بۆت جێ بەجێ بکەم؟ پیاوەکە وتی: من دەمەوێ حەج بکەم ، بەڵام شێخ وتی: ئێستا حاجیەکان تەوافیان کردوە ئێستا ناتوانی حەج بکەی بەڵام، تۆ ئەم ساڵ لێرە بمێنەوە ئەوا ساڵێکی تر خۆم دێم بۆ حەج کردن .

ڕۆژ بەڕۆژ حەفتە بە حەفتە مانگ بە مانگ ساڵ تەواو بو شێخ سوار و پیاوی خۆی ئامادە کردو پێویستیەکانی خۆیان جێ بەجێ کرد لەگەڵ پیاوەکە حەجیان کرد. لە هاتنەوە شێخ گەلێك شت و مەکی هێناوە پیاوەکەی بەڕێ کرد لە شوێنی مەترسی پەڕاندەوە .

پیاوەکە بەرەو شاری خۆی گەڕایەوە کەس و کاری و خزم و دۆستەکانی باوەڕیان نەدەکرد کە ماوە و دەوریان لێ داو پرسیاریان لێ کرد کە ئەو ماوەیە لەکێ بو چی بەسەر هاتوە حاجیەکە بەسەر هاتەکەی خۆی هەمو گێڕاوە چی بەسەر هاتوە .

پاش دە ساڵ زیاتر ڕۆژێك حاجیەکە چووە مەیدانی حەیوان بینی کە مەڕ و ماڵاتی شێخ دەفرۆشرێ‌و حاجی چاوی پێ کەوت ناسیەوە وتی ئەم مەڕانە بە چەند دەفرۆشن من (دە)لیرە زیاتر دەدەم؟ حاجی مەڕەکانی کڕی شوانێکی لێ گرت و دوای مانگێك حاجی ڕێی بە بازاڕی جاریان کەوت بینی کە ژنی شێخی لەوێ بە (100)لیرە کڕی و بردیەوە ماڵەوە حاجی بانگی ژنەکەی کرد کە ئەمە وەکو خوشکی خۆی ڕێزی لێ بگرێت پێی وت: کە ئەمە ژنی شێخە بەڵام ژنی شێخی حاجی نەناسیەوە هەرکاتێ ژنەکە دەستی دەدایە شتێك کە

ئیش بکات ژنی حاجی نەیدەهێشت ژنی شێخی دەیگوت: من جاریم دەبێ خزمەتی ئێوە بکەم. پاش ماوەیەك حاجی لەگەڵ برادەرێکی کە دەیویست عابیدەیەك بکڕێت حاجی بینی شێخ لەوێ دەفرۆشرێت حاجی شێخی کڕی و بردیەوە دیوەخانی، بەڵام شێخ ئەوی نەناسیەوە هەر کاتێ شێخ دەستی بۆ ئیش کردن بردبوایە نەیاندەهێشت پاش ماوەیەك حاجی بە شێخی وت: کە خوشکی تەمەن گەورەی لەماڵەوە هەیە کەبۆی داخواز بکات بەڵام شێخ ڕازی نەبوو، کە پەیمانی داوە بە ژنەکەی کە پاش ئەو ژنی تر نەهێنێ. حاجی بەشێخی وت: ئەگەر تۆ چاوت پێ بکەوێ بەبێ مەرج ڕازی دەبی. ڕۆژێکیان حاجی بە ژنەکەی وت چێشت ئامادە بکات کە میوانی دێت . ژنی شێخی هاتە ژورێ و چاوی بە شێخی کەوت ناسیەوە دەستی بە گریان کرد وە (شێخ)یش دەستی بە گریان کردو حاجی پێی وتن: کە من ناناسیەوە شێخ پێی وت: تۆ کێی. حاجی پێی وت: ئەو میوانە بەد ڕەوشتەی کە ماوەی ساڵێك لەلاتان بو ئینجا شێخ دەستی لەمل کرد و یەکتریان ماچ کردو وتی: مەڕ و ماڵاتەکەم بۆ کڕیویەوە بردی بۆ شوێنی مەڕەکان بە شێخی وت: لێرە دەمێنیەوە یاخود دەچیتەوە شوێنی خۆتان شێخ بە حاجی وت: من بەچی ئەو هەمو چاکەی تۆ دەدەمەوە بەڵام حاجی بەشێخی وت: هەرچەند چاکەی تریشت لەگەڵ بکەم چاکەی تۆ نادەمەوە لەبەر ئەوەی ناموس لە هەمو شتێك گرانترە .

*ڕووداوێکی ژیانە و دەکرێ روویدابێ .

# ئەوەی نەیبینی نایزانی!

پیاوێکی هەژار (مام عەبدولاّ)ی ناو بوو ئەم کابرایە هەژار و نەدار بوو خێزانێکی سك پڕ و دوو منداڵ و گویٚ درێژێك و دوو سیٚ بزگوڕە شڕ و پڕیان هەبوو، بزگوڕەکانیان هاویشتە سەر پشتی گویٚ درێژەکەو بەرەو شار کەوتنە ڕیٚ ... کات زستانێکی سەر پەڕ و سارد و هەور و باو باران بو ... ئەم پیاوە بیٚ هودە بو لەبیٚ شوێنی نەیدەزانی بۆ کویٚ بڕوا لەپێش خانوەکی گەورەی کۆن وەستا کەلەسەر دیوارەکە نوسرابو ئەم خانوە بۆ فرۆشتنە لەبەر دەرگای خانوەکە وەستابو تا باران خوری کەم بێتەوە و تەڕ نەبن . منداڵەکان لەسەرمان دەلەرزین و دەنگی ددانەکانیان ڕۆژێك دەڕۆیشت لەو کاتەدا پیاوێك دەرکەوت و پرسی ئێوە چی دەکەن لێرە ؟ ئێمە هیچ شوێنك نیە ڕوی تێبکەین.

پیاوەکە وتی: من دەلاّڵی ئەم خانوەم ... لەهەمان کاتدا دەلاّڵەکە بەزەییەکی تەواوی بە منداڵەکان و ژنە سك پڕەکە هات و دەرگای خانوەکەی کردەوە و پێی وتن لێر بمێننەوە ژیان بەسەر بەرن تاکو خانوەکە دەفرۆشم . ئەوانیش چونە ژورەوەی خانوە کۆنەکەو ماڵەکەیان بە ئاگر ڕۆشن کردەوە . هەر لەم شەوەدا ژنەکە ژانی هات کوڕێکیان بو لەتاو ژان گرتنەکە دەستی بە شیشەیەکی دیوارەکە گرت و شیشەکە دەرهات و لیرە باری پیاوەکە بەدوای لیرەکاندا دەگەڕا گۆسەیەکی پڕ لە لیرەی دیتەوە هەر لەهەمان شەو ژنەکە خەون دەبینێت و لەخەونەکە پێی دەڵێن کوڕەکەت ناو بنیٚ (ئەحمەد)ئێوەش ئەبنە خاوەنی ئەم خانوە و ئەو گۆسکە پڕ لە لیرەیە لەهەشت پشت کڕاوە و فرۆشراوە ئەحمەد دەبێتە خاوەنی بۆ بەیانی مام (عەبدولاّ)چوە لای دەلاّڵەکە پێی وت: کە بەچەند ئەم خانوە دەفرۆشی ؟ دەلاّڵەکە وتی بە پەنجا لیرە . ئەو پارەیە کە ماوەتەوە بە دووکانێکی دا ژیانێکی بەخۆش و شادی و پڕ لەکامەرانیان بردە سەر .

*ڕووداوەو ژیان شتی سەیری تێدایە.

# بیٚ شەرمانە ژەمێك نانخواردن !

هاوینی ساڵی 1980 بۆ گەلی کوردمان و حزبە کوردستانیەکان و هێزەکانی پێشمەرگە گەلێك دژوار و پڕ مەترسی خەتەرناك بوو .

لەم بارو دۆخە سامناك و نابەرامبەر و دژوارەدا مەفرەزەیەکی پێشمەرگە گەیشتنە دەشتی کۆیە (لەلای پێشمەرگەکانی کوردستان بەو ناوچەیە دەگوترا کە دەکەوێتە نێوان جادەی هەولێر کۆیەو زێی بچوك ئەو ناوچەیەی شوێنی حەوانەوەی هێزەکانی پێشمەرگە و حزبەکان بوو) .

لەو سەردەمەدا دەبوو مەفرەزەکانی پێشمەرگە بەڕۆژ لەدەرەوەی گوندەکان ڕۆژگار بەسەر بەرن نوێژی مەغریب بچنە ناو دێیەکان بۆ نانخواردن و شێوان و دابین کردنی خۆراك بۆ ڕۆژی دواتر . پێشمەرگەکانی مەفرەزەکەی حزب ماوەی (20)ڕۆژ بوو خواردنێکی وایان نەخواردبوو هێز و توانایەکی وایان بداتیٚ بتوانن لە ئەنجامدانی ئەرکەکانیان بەردەوام بن لەبەر ئەوەی ئەو کاتانەی دەچونە ناو گوندەکان بۆ نان خواردنی شێوان جوتیارەکان چێشتی خۆیان دەخوارد و هیچ خواردنێکی وا نەدەمایەوە لەلادێیەکان جوتیاران نانی ئێواران زو دەخۆن بەتایبەتی لە کەژی هاوینان کە کاردەکەن و ماندوون .

بۆیە خواردنی پێشمەرگە شێوان و بەیانیان و نیوەڕۆیان بە زۆری بریتیە لە نان و ماست و تەماتە و نان خەیار و چای بو بۆیە پێشمەرگەکان داوایان لەبەرپرسی عەسکەری کە کرد ڕێیان بدات پێش ڕۆژ ئاوا بچنە گوندێك ئەو داوایەی پێشمەرگەکان پڕ مەترسی بو بۆ ڕو بەڕو بونەوەی هەر شەڕێك وە بەر پرسەکە ڕێی پێدان بڕیاریان دا کە بچنە گوندی (میرکە)ی دەشتی کۆیە ئەو گوندە دەکەوێتە سەر بەستی شەڵغەو نزیك گوندی (نێرەگێن) .

دانیشتوانی ئەو گوندە بە هەمو شێوەیەك یارمەتی پێشمەرگەیان داوە گەیشتنە ناو گوندی(مێرکە)لەمزگەوتی گوندەکە کۆ بونەوە جوتیارانی گوندی میرکە سەرسام بون کە چۆن وا چۆن هاتونەتە ناو گوند؟!

لەگەڵ بانگی مەغریب پێشمەرگەکان دوو دوو سێ سێ دابەشی سەر ماڵەکان بوون سێ پێشمەرگە بەیەکەوە چونە ماڵێك و دیتیان (5)جوتیار لە حەوشەی ماڵەکە لەگەڵ خاوەنی ماڵەکە لەسەر مافور دانیشتونەو چاوەڕوانی ئامادە کردنی خۆراك دەکەن سێ پێشمەرگەکەش زۆر دڵخۆش بون چونکە زانیان ئەو جوتیارانە داوەتی ماڵەکەن و خواردنی زۆر خۆش هەیە بۆیە ئاسودەو دڵنیا بوون لەوەی کە ماندوو بوون و سەرەڕۆییەکەیان لە زوو هاتنە ناو گوندەکە بە فیڕۆ ناچێ دوای سڵاو لە دانیشتوە بە ڕێزەکان پێشمەرگەکان لە ڕیزی میوانەکان دانیشتن پاش بەخێرهاتنیان جوتیارەکان لەسەر قسەکانیان بەردەوام بوون و خاوەن ماڵەکە لەلای سەرەوە دانیشت کە پاڵی لێ دابوو کە وەکو ئاغایان کێخوای گوندەکە نیشاندا لەناکاو بانگی لاوەکی کرد و فەرمانی پێدا کە ڕایەخێك لە دوری دانیشتنەکەی ئەوانەوە ڕابخات . کوڕە لاوەکە لێی پرسی بۆ چییە؟ با ئەوان واتە پێشمەرگەکان لەوێ نان بخۆن و ئەو قسەیەی خاوەن ماڵەکە لەلایەن پێشمەرگەکان چاوەڕوان نەکرابو هەروا گەلێك نابەجێیی و سەیر و سەمەرە بو دڵتەنگی کردن ئەوەیان هاتە بەرچاو کەچۆن ئەوان خۆیان لەپێناوی گەل و نیشتیمانەکەیان کردۆتە قۆچی قوربانی و کەسانی نەفس نزمیش هەیە نایەوێت ژەمێك نانیان لەگەڵدا بخوات. کە جێگایەکە ئامادە کراو بۆ ئەوەی لەوێ خواردنەکەیان بخۆن بەرپرسی سیاسی مەفرەزەکە لەوەڵامی داوای پێشمەرگەکە وتی: هاوڕێیان و خزمانی بەڕێز ئەو ناوچەیەی ئێمە لێی ژیاوین داب و نەریتی خەڵکەکە وا بوو کە میوان ڕوی لە هەرماڵێك بکردایە بۆ نان خواردن خاوەن ماڵ بە پێوە دەوەستی هەتاکو میوانەکە نان دەخوات، ئینجا خاوەن ماڵ نانی خۆی دەخوات ! ئێمەش میوانین و لەگەڵ ئەو خزمانە کە ئەوانیش وەکو ئێمە میوانن نان دەخۆین و با خاوەن ماڵیش دوای ئێمە نان بخوات .

دوای ئەو قسەیە بێ دەنگی باڵی بەسەر دانیشتنەکە داگرت و کەس قسەی نەکرد و برا جوتیارەکانیش هەستیان بە ناماقوڵی قسەی خاوەن ماڵەکە کردو خاوەن ماڵەکەش زۆر بەسەر خۆی داشکایەوە ڕەنگی گۆڕاو بێ دەنگ بوو .

ئەوەندەی پیٚ نەچو سفرە دانراو چێشت و برنج و گۆشتی مریشك و شلەی بامیەو چەلاوی مریشك هات ، پێشمەرگەکان کە ئەو خواردنەیان بینی هەمو شتێکیان لەیاد کردو قسەی دەمە تەقێکان لەگەڵ هاتنی خواردنەکە سڕانەوە و دەست کرا بەنان خواردن. پێشمەرگەکان وەکو گورگی برسی و شێت خواردنەکەیان دەخواردو شەرمیان لەهیچ نەدەکرد هەر زوو دەستێکیان بە گۆشت مریشکەکە داهێناو لەچاو تروکانێکدا تەواویان کردو هەتاکو بۆیان کرا نانیان خوارد.

پێشمەرگەکان هاتنەوە سەرخۆ سەیری یەکتریان دەکرد شەرمیان لەوە دەکرد کەچۆن بەو جۆرە بەبیٚ شەرمیە نانیان خواردووە و بۆیە بڕیاریان دا ئەو ماڵە بەجیٚ بێڵن چایش نەخۆنەوە و داوای خۆراکی ڕۆژی دوایش نەکەن ئاویشیان لە مەتارەکانیان نەکرد لەماڵەکەوە دەرکەوتن و چوونە ماڵی نزیکیان چایەك بخۆنەوە و نان و ئاویش بۆ بەیانی دابین بکەن، پیرێژنەك لەماڵەکە بە تەنیا دەژیا دوو پێشمەرگەش میوانی بون بەسەر هاتەکەیان بۆ گێڕانەوە داپیرە لەوەڵامی پێشمەرگەکەدا وتی ڕۆڵەکانم ئەو ماڵە زۆر دەوڵەمەندن بەڵام چاوچنۆکی ئیمڕۆ زەبارەیان بۆ کراوە چێشتێکی زۆریان ئامادە کردووە بەڵام لەبەر نەدیتکۆکەییان وایان لەئێوە کردووە دایکە پیرە نانی بەیانی بۆ دابین کردن و چایشیان خواردەوە یادی ئەو دایکە پیرە بەخێر و هەزاران ڕەحمەت لەگۆڕی پیرۆزی .

***ئەمە بەسەر هاتی پێشمەرگەیە و لەم جۆرە بەسەرهاتانە زۆرن، بە داخەوە کەم دەنووسرێتەوە .**

# حەوت براو فاتمە

**کۆکردنەوە: مەریوان ئەسعەد بهائەدین**

**گێڕانەوە : بەســـــیٚ حەمە ئەمین**

هەبوو نەبوو، هیچ شتیٚ لەخوا گەورە تر نەبوو، ژنیٚ هەبو حەوت کوڕی هەبوو ، ڕۆژێکیان کوڕەکانی گوتیان: دایە ئێمە دەڕۆین بۆ چیاو ڕاو دەکەین. بەم چەشنە هەر حەوت کوڕەکە ڕۆیشتن بۆ چیاو دایکیان بەجیٚ هێشت. دایکیان زگی هەبوو، کوڕەکان پێش ئەوەی بڕۆن وتیان دایە ئەگەر خوشکمان بو تەنافێکمان بۆ هەڵواسە، ئەگەر کوڕیشت بو بێژینگێك هەڵواسە، دایکیان لەپاش کوڕەکانی کە چون بۆ چیا کچێکی بوو، کچەکە گەورە بوو کوڕەکان هەر نەهاتنەوە ڕۆژێکیان کچە وتی: ئەی دایە من برام نیە؟ دایکی وتی با با! کچە حەوت برات هەیە بەڵام، ماوەیەکی زۆرە چوونە بۆ چیاو خەریکی ڕاو کردنن. جارێکیان کچە چووە سەرکانی هێدی هێدی کەوتە داڵغەی براکانیەوە، بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن بچێت بۆ لایان ، چونکە زۆر تامەزرۆی بینینیان بوو . لەو کاتەی کەلەسەر کانیەکە بوو قەلێك هات وتی: ئەوە کچە جوان فکر لەچی دەکەیتەوە ؟ ئەویش وتی : فکر لە براکانم دەکەمەوە دەمەویٚ بیانبینم . نازانم چۆن بە دیداریان شاد بم . قەلەکە وتی بڕۆ بۆ لای دایکت بڵیٚ : پەکوف خۆ جامەکەم لەبیر کردووە ئینجا یەکسەر وەرەوە بۆ سەر کانیەکەو منیش دەتبەم بۆ لای براکانت . فاتمە وتی بە قەلەکە : تۆ دەست غەڵەتم دەدەیت ، قەلەکە وتی: نا نا! من دەست غەڵەتت نادەم قەلەکە فاتمەی لە خانویەك داناو پێی وت: ئەمە ماڵی براکانتە، فاتمە خۆی لە براکانی شاردەوە پێش ئەوەی براکانی لەڕاو بێنەوە ، هەمو ماڵی بۆ ڕێك خستن و خواردنی بۆ ئامادە کردن برا بچوکەکە هەمو ڕۆژیٚ پێش براکانی تر دەهاتەوە بۆ ماڵ، خواردنی بۆ براکانی حازر دەکرد بەڵام سەیری کرد ماوەیەکە ئەم دێتەوە خواردن حازر کراوە بۆیە زۆر سەری لەم کارە سوڕما، چونکە فاتمە هەمو ڕۆژێك خۆی لێیان حەشار دەدا برا بچوکەکە بەم شێوەیە خۆی پیٚ نەگیراو برا گەورەکانی ئاگادار

کردەوە پێی وتن: من هەمو ڕۆژێ دێمەوە ، خواردنمان بۆ حازر کراوە ماڵمان بۆ ڕێکخراوە ، برا گەورەکە وتی: بەڕاستی سەیرە ئێمە پێویستە لەم نهێنیە بگەین و بزانین ئەوە کێیە نانمان بۆ حازر دەکات! بۆیە هەر حەوت براکە تەکبیریان کرد تا برا بچوکەکەیان خۆی بگرێت و، ئەویش خۆی گرت و تەماشای کرد کچێکی زۆر جوان دەرچوو خواردنیان بۆ ئامادە دەکات ئەویش لێی هاتە دەرەوە لێی پرسی تۆ کێی؟ چی دەکەی لێرە ها؟ وتی من خوشکی ئێوەم بەسەر سوڕمانەوە خوشکی ئێمە! چۆن ؟! کچەکە پاش ئەوەی خۆی ئاشکرا کردو ناوی هەر حەوت براکەی ناوی دایکی وت ئەویش بڕوای پێ کرد . پاشان براکانی هاتنەوە برا بچوکەکەیان بەرەو ڕویان ڕۆیشت و پێی وتن: ئەوە خوشکمانە هەمو ڕۆژێ لێرە ئەم خواردنەمان بۆ ئامادە دەکات و ماڵمان بۆ ڕێك دەخا. براکانی بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر دڵخۆش بوون، ئەو ڕۆژە لەخۆشیدا هەر حەوت براکەیان مانەوە لەماڵ نەچونە دەرەو ، هەمویان لەنوکەوە شتەکانیان بە دورو درێژی بۆ خوشکەکەیان ڕون کردەوە، پێیان وت: پشیلەیەکمان هەیە ئەو پشیلەیە لە هەمو شتێکی ئێمە تێ دەگات پاشان پێیان وت: ئێمە لەوەتی لە چیا دەژین یەك سەرچاوەی ئاگرمان هەیە کە پێداویستیەکانمانی پێ دابین دەکەین ئەو پشیلەیەش مێوژی هەیە ئەگەر داوای مێوژی کرد ڕۆژی یەك مێوژی پێ بدە ئەگەرنا بۆی هەڵگرە هەتا داوای کرد ئینجا بیدەیە . بەڵام ئەگەر نەیدەیتێ و دوای بخەی ئەوا ئەو ئاگرەی کە هەمانە لێمانی دەکوژێنێتەوە ئەو کاتە ژیانمان دەفەوتێ و توشی نەهامەتی دێین بۆیە چیت پێ دەڵێین ئەوە بکە ئیتر هەموو ڕۆژێ فاتمە دەیوت: پشە وەرە مێوژەکەت بەرە پشیلەکەش دەیگوت: هەڵی گرە فاتمە چەند جارێك ئەوەی دوبارە کردەوە پشیلەکەش هەر دەیگوت: هەڵی گرە. ئیتر فاتمە. توڕە بوو وتی: وەڵاهی دەبێ بیخۆم، خواردی دوای ئەوە پشیلەکە داوای مێوژەکەی لە فاتمە کردو ئەویش وتی مێوژەکەم خواردوە پشیلەکەش لەداخا خۆی پێ نەگیراو یەکسەر ئاگرەکەی کوژاندەوە. فاتمە حەپەساو وتی ئێستا براکانم بزانن من مێوژەکەم خواردوە و پشیلەکەش ئاگرەکەی کوژاندۆتەوە ئەوا دەمکوژن، بۆیە هەڵساو چوە سەربان و تەماشای دەورو پشتی خۆی کردو

بینی لە شوێنێکی دوور دوور تروسکە ئاگرێك دیارە. بۆیە ڕۆیی بەدوای تروسکە ئاگرەکە بەخۆی بە گڵۆڵە ئاوریشمێك کە لەگیرفانی دابوو لەو خانیەی کە ئاگرەکەی تێدابو نزیك بۆوە و بینی دێوێکی تێدایەو دو کچی زۆر جوان شانی دەشێلن فاتمە بە دزی داوای لە دو کچە کرد کە ئاگری بدەنێ، بەڵام ئەوان وتیان: کچێ چی دەکەی لێرە؟! ئەگەر دێوەکە بزانێ دەتخوات ئەوە نازانێ شانی دێشێ بۆ گۆشتی بوسوڵمانان، بەهەر حاڵ ئەو دوو کچە پشکۆیەکی ئاگری بچوکیان دا بە فاتمە بەڵام سەری گڵۆڵە ئاوریشمەکە لە تەلمانی ماڵی دێوەکە ئالا فاتمە پاش ئەوەی ئاگری بردو چوە ئاشی لێنا ماوەیەك بەسەر چو فاتمە گوێی لە تەقە تەقی دەرگەکەیان بو کە تەماشای کرد بینی وا یەکێ لە دەرگا دەدات، بەڵام لەجیاتی براکانی دێوە زەبەلاحەکەیە کەوا دو کچە شانیان دەشێلا دێوەکە لە فاتمە هاتە پێش و وتی: فاتمە حەوت برایەت بکوژم یا پەنجە توتەت بمژم ئەویش وتی: حەوت برایەم مەکوژە پەنجە توتەم بمژە. بەمجۆرە دێوە چەند جارێك پەنجەی فاتمەی مژی بەمەش فاتمە لاواز بوو ڕووی لە کزی کرد. براکانی هەستیان بەم ناتەواویەی فاتمەی خوشکیان کرد وتیان: فاتمە بۆ وا لاواز بوی دیارە بیری دایکمان دەکەی؟ بەڵام فاتمە هیچ شتێکی نەدرکاند تا ڕۆژگار تێدەپەڕی دێوەی خوێن مژ لەسەر پەنجە مژینی ئەم کچە بەردەوام بو کچەش تا دەهات لە ڕو و لاواز دەبوو بۆیە پاش ئەوەی براکانی زۆریان لێ کرد نهێنیەکانی درکاند ئەوانیش بەیەکەوە کەوتنە تەکبیر بۆ لەناو بردنی ئەو دێوە پاشان چاڵێکی زۆر قوڵیان لێداو لبادێکیان لەسەری ڕاخست و بە فاتمەیان وت : تۆ لەتەنیشت ئەم چاڵە هەویر بشێلە ئەگەر دێوەکە هات وتی: فاتمە پەنجە توتەت بمژم یان حەوت برایەت بکوژم تۆش بڵێ : تخوا حەوت برایەکەم مەکوژە، پەنجەی توتەم بمژە، بەڵام ئێستا دەستم بە هەویرەوەیە تۆ لەبان لبادەکە دانیشە تا لێ دەبمەوە ئێمەش خۆمان حەشار دەدەین لێرە .

پاش ئەوەی دێوەکە هات فاتمە پێی وت: لەبان لبادەکە دانیشە تا لێدەبمەوە، دێوەکەش هات دانیشت لەسەر لبادەکە یەکسەر کەوتە ناو چاڵەکەوە دێوەکەش هیچی لە دەسەڵات نەما تەنیا ئەوە نەبێت کە بە فاتمەی

وت ئەگەر دەستاوی دەستان بکەوێتە ناو ئەم پیازێك شین دەبێت هەر کەسێ ئەو پیازە بخوات دەبێت بە دێو، جارێك فاتمە نەیزانی دەستاوی دەستی کەوتە سەر چاڵەکەو پاش ماوەیەك پیازێك شین بو ڕۆژێکیان فاتمە پیاز نابێ بیکاتە ناو ئاشەوە، بۆیە ناچار دەبێت ئەم پیازە بۆ براکانی بکاتە ناو ئاشەوە پاش ئەوەی براکانیان ئەم پیازەیان خوارد هەمویان بونە دێو. تەنها برا بچوکەکەیان نەبێت لایەکی بو بەدێو لایەکەی تری بوو بە بەرخ بۆیە فاتمە بە ناچاری بیری لە لەوەڕاندنی براکانی دەکردەوە تا دەستی بە لەوەڕاندیان ڕێبوارێکیش هەموو ڕۆژێ بەلایان دا تێدەپەڕی ڕۆژێکیان گوتی: دەبێ بۆچی ئەم ئافرەتە لای ئەم دێوانە بێ پاش ئەوەی ڕێبوارەکە پرسیاری لێ کرد. فاتمە هەموو شتێکی بۆ باس کرد، ئەویش وتی: ئەگەر شوم پێ بکەی براکانت بۆ چاك دەکەمەوە. پیاوەکە بە فاتمەی وت: بڕۆ شوێنێکی دوور ئەگەر لە براکانتم دا گوێت لێ نەبێ پیاوەکە لە هەر هەموولا لە براکانی دا چاك بوونەوە تەنها برا بچوکەکەیان نەبێت چاك نەبۆوە پیاوەکە لە فاتمەی پرسی کاتێ لە برا بچوکەکەتم دا گوێت لێ بوو؟ ئەویش وتی: بەڵێ بۆیە برا بچوکەکەیان بوو بەبەرخ و تەواو چاك نەبۆوە. کاتێ براکانی چاك بوونەوە فاتمە هەموو شتێکی بۆ باسکردن ئەوانیش ڕازی بوون کە فاتمە شوی پێ بکات. بەڵام، بە مەرجێك وتیان ئەگەر دەڕۆیت لەگەڵی دەبێ برا بچوکەکەمان لەگەڵ خۆت بەری فاتمەش شوی بە کابراکە کردو برا بچوکەکەی لەگەڵ خۆی برد، کاتێ چووە ماڵی پیاوە بینی هەوێی هەیە، پاش ماوەیەك تەماشای کرد هەوێیەکەی بە هەموو جۆرێ دژایەتی دەکات زۆر لەگەڵی خراپ دەبێ، ڕۆژێکیان فاتمە لەگەڵ هەوێیەکەی دەچن بۆ کۆڵ. بەڵام، هەوێیەکەی لەگەڵی بەفێڵ دەبێت پاڵ بە فاتمە دەنێت و فرێی دەداتە ناو بیرێ کاتێ دێتەوە ماڵی مێردەکەی لێی دەپرسێ دەڵێ: کوا فاتمە؟ ئەویش دەڵێ ئەو ڕۆیی ئەو ژنە خراپە چییە تۆ هێناوتە، بەم جۆرە ڕۆژگار دێتە پێشەوە ڕۆژێکیان پیاوەکە دەڵێت: با ئەم بەرخە سەربڕم تا لەکۆڵی تۆش. بێتەوە بەڵام بەرخەکە یەکسەر ڕای کردوو چوە دیار بیرەکە و بە فاتمەی گوت وا خەریکە سەرم دەبڕن فاتمەش وتی:

(چی بکات فاتمەی قەڵەندەرێ

حەسەن و حوسەینی لەبەرێ
ڕێی نییە بێتە دەرێ)
بەرخەکەش بە فاتمەی وت:
فاتەکە فاتانەکە دودە جوان پخانەکە
چەقۆ لەسەر هەستانەکە) .

ڕۆژێکیان پیاوەکە لە چوونی بەرخەکە بۆ سەر بیرەکە کەوتە گومان و لە دڵی خۆی دا گوتی: دەبێ بۆچی هەموو ڕۆژێ ئەم بەرخە سەر لەو بیرە بدات بۆیە ڕۆژێکیان بەدوای بەرخەکە کەوت هەتا چووە سەر بیرەکە تەماشای کرد ژنێکی تێدایە پاشان دەری هێناو سەیری کرد فاتمەیە، پاش ئەوەی فاتمە هەمو شتێکی لەسەرەتاوە بۆ گێڕایەوە، ئەویش سەری بۆ لەقاند وتی: باشە دەی ئێستا با بڕۆین بۆ دار، پیاوەکە دو ماینی ئامادە کردو یەکێکیان حەوت ڕۆژ ئالیکی دایە ئەوی تریان حەوت ڕۆژ ئاوی داو ئالیکی نەدا ، ئینجا قاچی ئەو ژنەی کە خیانەتی لەگەڵ فاتمە کردبو بە ماینەکانەوە بەستەوە ، هەر قاچی بە ماینێکەوە پاشان ئاو و ئالیکی بە جیا بۆ ماینەکان داناو کاتێ ڕایان کرد بۆ لای ئاو و ئالیکەکە لەم کاتەدا ژنەکەیان دو لەت کردو کوشتیان لێرە فاتمە بەخۆشی ژیاو براکەی چاك بۆوە و فاتمە دوایی دو منداڵی بو ناویان نا حەسەن و حوسێن . منیش کلاشم دڕاو هیچم پێ نەبڕا .

*ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم چیرۆکە: قەل فاتمە هەڵدەگرێ، دێو دەکوژێ پیاز لە شوێنی سەوز دەبێ، پیاز دەکرێتە شیو و براکان دەیخۆن و دەبنە/دێو/ کابرایەك بە لێدان چاکیان دەکاتەوە، بەڵام، لەکاتی لێدانی بچوکەکەیان خوشکە کە گوێی لە دەنگی لێدان دەبێ و بچوکەکە چاك نابێتەوە.
ئەمەش هەر ئەفسانەیی فاتمۆکێ یە و بە شێوەیەکی تر، کە جیایە لەوەی پێشوو .

## زنجیرە کتێبی ئینستوتی کەلەپوری کوردستان

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | ساڵی |
|---|---|---|---|
| 1. | بەرکوتێکی مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی | سەدرەدین نورەدین ئەبوبەکر | 2005 |
| 2. | دەروازەیەك بۆ بۆتەکانی موزیك | غەمگین فەرەج | 2005 |
| 3. | وەرز و ساڵنامەی میللی لەپەند و شیعری کوریدا | پ . د شوکریە رەسول | 2005 |
| 4. | لەبارەی کۆکوردنەوەی موزیکی میللیدا<br>بە زمانی(کوردی عەرەبی) | مود کار بلیس و ئەرنولد<br>باکیە.<br>و/ تاریق سالح | 2005 |
| 5. | چلاواز 1 | وریا ئحمەد | 2006 |
| 6. | پەندی کوردی: چیرۆکەکەی | عومەر شێخەڵلا دەشتەکی | 2006 |
| 7. | هێلکەی نامێ<br>کۆمەڵێك ئەفسانە و حیکایەتی جۆرا و جۆری<br>فۆلکلۆریی نێو کوردەوارییە<br>بەرگی یەکەم/ بەشی یەکەم | مەولود ئیبراهیم حەسەن | 2006 |
| 8. | هێلکەی نامێ<br>کۆمەڵێك ئەفسانە و حیکایەتی جۆرا و جۆری<br>فۆلکلۆریی نێو کوردەوارییە<br>بەرگی یەکەم/ بەشی دووەم | مەولود ئیبراهیم حەسەن | 2006 |